- بابەت : هەڵبژاردەی گفتوگۆ
- ناوی کتێب : مرۆڤ وەك بەخشندە
- ناوی نووسەر : ڕێبوار سیوەیلی
- ساڵی چاپ : هاوینی ٢٠٠٦
- نۆرەی چاپ : یەکەم
- ژمارەی سپاردن: (٤٨٢) ی ساڵی ٢٠٠٦ ی دراوەتێ.
- دیزاینی بەرگ: سەیوان سەعیدیان.
- تیراژ : ٢٠٠٠ دانە
- نرخ: ٣٧٥٠ دینار
- چاپ و بڵاوکردنەوە: چاپخانەی رەنج.

# ناونیشانەکان

# گفتوگۆ و بەخشندەیی

**ئێمە**هەموومان پێشتر لە ئەفسانە و ئایین و حەکایەتەکاندا بەسەرهاتی خواوەند و قارەمان و پادشا و یەزدانی بەخشندەمان بیستووە. میر و وەزیرمان ناسیوە لە بەزەییەوە یان لە هەستکردن بە ئەرکی سەرشانییەوە، یاخود بۆ ڕازیکردنی خرۆشانی خەڵك، چاوێکی لە خەزنەدار و خولامەکانی خۆی داگرتووە، کە لە بەخشندەییدا درێغی نەکەن و دەست نەنێن بەڕووی لێقەوماوانەوە. پادشاکانی دنیای کۆن ڕۆژانی وەك لەدایکبوونی منداڵەکانیان و چاکبوونەوەی شاژن لە نەخۆشیی سووزەنەك، کە لەئەنجامی زۆرجووتبوونیان دەگەڵ خزمەتکار و دەستوپێوەندانەوە تووشی دەبوون، بە ڕۆژی بەخشندەیی ناوزەد دەکرد! لە دنیای مۆدێرن و لە کەناڵە تەلەفزیۆنییەکانەوە، دوای ڕووداو و کارەساتە سرووشتی و جەنگەکان و کۆڕەوەکان، خەڵکانی خاوەن سەرمایە و هونەرمەندانێکمان بینیوە، کە ملیۆنان دۆلاریان بەخشیوەتە زیان لێکەوتووان و بەخشندەیی خۆیان نومایشکردووە. لە زۆرینەی کۆمەڵگاکاندا کەسانێکی خاوەن سەرمایە، لەبواری دروستکردنی مزگەوت و تەعزییەخانە، هەتیوخانە و ڕێکخراوی خێرگوزاردا سەرمایەگوزاریانکردووە و ویستویانە ئەوەیان بە بەخشندەیی بۆ لەقەڵەم بدرێ و خۆیان لە باجی حکومەت بەدوور بگرن. لە دنیای ئەمڕۆدا قوتابیان *خۆیان دەکوژن بۆ مامۆستا* و چاوەڕوانییان ئەوەیە کە مامۆستاش لە ئاستیاندا بە (*نمره*) بەخشندە بێت، نەك بە زانست! منداڵان و هەرزەکارانی ئەمڕۆ لە زۆرینەی وڵاتانی جیهاندا، تەنیا چەند ڕۆژێ بەر لە جەژنی لەدایکبوونیان گەمەی سۆزداری لەگەڵ دایکوباوك و باوانیاندا دەستپێدەکەنەوە و پشی پشییان بۆ دەکەن تاکو لەو ڕۆژەدا بەخشندەیی ئەوان بەلای خۆیاندا ڕابکێشن و ئەگەر بۆشیان سەربچێ لەساڵێکدا دووجار جەژنی لەدایکبوونیان سازدەکرد.. زۆرن

ئـەو نووسـەر و ڕۆژنامـەنووس و ستوونـنووسـانەی سـاڵەهای سـاڵ لـە چـاوەڕوانـی خەڵاتێکدا، بەموبەودا هەڵدەڵێن و کاتێ وەرزی خەڵات دابەشکردنیش دێـت، بـازی بەخشندەیی لەسەر شانی ئەوانە دەنیشێتەوە کە لە (زەممی) وەزیردا کەمتیاری خۆیـان تاوداوە.. کۆمەڵگا سەربازی و ستەمکارەکان پڕن لە بانگەوازی ئازادیی ڕادەربڕین و هەفتەی کۆنگرەیەك بۆ ئاشتی و لێبووردەیی دەگیرێ و کەچی زیندانەکانیش پڕن لەو کەسانەی کە بەنووسین، یان لە تووڕەییدا قسەیەکیان بە سەپانی ماڵی پادشا گوتووە و دەبێ دنیا ببێتە تکاکار تاکو بەخشندەیی لەخەو ڕابێ و لێیانخۆش بـن.. دەرۆزەکـەران بۆ ئەوەی شەرمەزارمان بکەن و پێمان بـسەلمێنن کـە ئێمـە بەڕاسـتی بەخـشندەین، لـە شوێنی چـۆڵدا داوای پارەمـان لێناکـەن و ئەگـەر بـەو بـڕە پارەیـەش کـە دەیخەینـە دەستیانەوە ڕازیی نەبوون، بەسەرمانیدا دەدەنەوە تا باری شەرمەزاریمان گرانتر بێ..

دنیای ئەمرۆ لە ڕواڵەتدا دنیای بەخشینە. بەخشین و بەخشیش لە هـەموو شـوێنێکدا خۆیان بۆ لەبۆسە ناوین و بەمجۆرەش جیهانی ئەمڕۆ لەهـەرلا بانگـەوازی بەخـشندەیی دەکات و لـە زۆرینـەی ئـەم بانگەوازانەشـدا مانـای بەخـشندەیی پەیوەسـتکراوە بـە بەخششێکی مادییەوە کە مەرج نییە وەك ئەوەی بڕیـاری لەسـەر دراوە، وەربگـیرێ، چونکە هەمیشە کەسانێکی دیکە لەنێوان ئێمە و بەخـشندەدا پەیـدا دەبـن کـە داوای بەخشیشی خۆیان دەکەن! بەخـشندەیی و بەخـشیش هـیچ پەیوەنـدییان بـە ڕەفتـار و ئەخلاق و جیهانبینیی مرۆڤەوە نەماوە، ئـەمڕۆ بەخـشین بەپلـەی یەکـەم پەیوەسـتە بـە بەخشینی مادیی و پارەوە. ئەوەی پارەی زیاد دەدات بەخشندەیە و ئەوەی بەخشندەیە مرۆڤێکی باشە، با ئەو مرۆڤە جەللاد و نیـەتخراپ و ڕەگەزپەرسـتیش بێـت. گـرنگ ئەوەیە پارەمان پێدەبەخشێ و لـە نەسرییەی فەرمانگە و کۆمپانیا و دیواخانانەی خـۆی بێبەشمان ناکات..

ئایا لەم دنیایەدا مـرۆڤ دەتوانـێ قارەمـان و پادشـا و وەزیـر و دەسـەڵاتدار و خـاوەن کۆمپانیا و پرۆژە نەبێ و بەخشندەش بێت؟ ئایا ئێمە دەتوانین وەك مـرۆڤ، وەك خـودی سەربەخۆی، بێ ناونیشانی پۆست و ئیمتیازاتی دەسەڵات و خاوەن پلەوپایە و پێگـەی

جۆربەجۆر، بەخشندەبین؟ ئایا بەخشندەیەك هەیە مادیانە نەبێت و كامەیە ئەو بـوارەی دەتوانین تیایدا بەخشندەبین وەك ئەوەی كە بەخشندەیی بەشێكە لـە ئەخلاقی مرۆڤانەی ئێمە؟

بەخشندەیی پەیوەندیەكی نزیكی هەیە بە ئامادەیی مـرۆڤ بـۆ كرانـەوە و پێكـەوەبوون لەگەڵ ئەوانیتر، كە بارودۆخی گفتوگۆ باشترین بەرجەستەكەری ئەو پێكەوەبوونەیـە. بەڵام ئایا گفتوگۆ چـییە و بۆچـی گرنگـە و چ بوارێكمـان لەسـەر نـاوەڵا دەكـات؟ لێگەڕێن بەهۆی ئەم پرسیارانەوە تێگەیشتنی خۆمان لـەبارەی گفتوگـۆوە بخەینـەڕوو، پاشانیش لە پەیوەندی گفتوگۆ و بەخشندەیی وردبینەوە.

**هـــەموو** گفتوگۆیـەك خوازیـاری پێكەوەبوونێكـە، بـەڵام مـەرج نییـە لــە پێكەوەبوونەكاندا گفتوگـۆ دروسـتبێت. دروسـتنەبوونی گفتوگـۆ و نەهاتنـە قـسە و هەڤپەیڤین، یەكێكە لە ئەزموونە ناخۆشەكانی مرۆڤ. هەمیـشە لــەو كاتانـەدا كـە دوو مرۆڤ، یان زیاتر، لە شوێنێكدا خۆیان دەبیننەوە و گفتوگۆ و قسەگۆڕینەوە لە نێوانیاندا دروستنابێت، وەڕسبوون و بەدگومانی و ترس لەئارادایە. هەربۆیەشە مرۆڤەكان لەهەر شوێنێكدا كە بۆ ماوەیەكی زۆركەمیش پێكەوەن، هەسـت بـە پێویـستی قـسەكردن و دەمەتەقێ دەكەن. قسەكردن و دەمەتەقێ و چەنەبازی بەتـەواوی مانـا گفتوگـۆ نـین، بەڵام پێویستن بۆ سەرهەڵدانی گفتوگۆ، چـونكە قـسەبۆكردن و دەمەتـەقێ ئامانجیـان ئەوەیە ئەویتر بكەنە وەرگری خۆیان بەبێئەوەی مەبەستیان بێـت گـوێی بـۆ بگرنـەوە. ئەوەی قسەمان بۆ دەكات مەرج نییـە بۆخۆشـی بزانێـت چ دەڵـێ و لەچـی پرسـیار دەكات، مەرج نییە مەبەستی بێت لێی تێبگەین و مەرجیش نییە چاوەڕوانی وەڵامێكـی دیاریكراویش بێت و ئەگەر وەڵامیشی درایەوە، هیچ مەرج نییـە گـوێی بـۆ بگرێـت. ئەوەی قسەمان بۆ دەكات، دەستپێشخەری دەكات بۆ ڕەواندنەوەی هەر بارگرژییەك، هەر مەترسییەك و هەر سامناكییەك كە لەنێوان خۆی و ئەوانیتردا هەسـتی پێـدەكات. ئەم بارودۆخە لەلای منداڵ زۆر بـەڕوونی دیـارە، كاتـێ لـەبـەر خۆیانـەوە دەكەونـە

پرسیارکردن و وریتەوریت بەبێئەوەی چاوەڕێی وەڵام و گرنگیی بە وەڵامدانەوەی ئێمە بدات.

قسەبۆکردن، جۆرێکە لە گفتوگۆ کە تیایدا *دەم* لەڕێگەی *قسە*وە خۆی فەرز دەکات بەسەر گوێچکەدا. باشترین نمونە بۆ ئەم بارودۆخە ڕێورەسمی بەخێرهاتنی میوان و هەواڵپرسینی ئێمەیە کاتێ ڕووبەڕووی یەکتر دەبینەوە و تیایدا هەواڵپرسین و چاکی وچۆنی و پرسیارئاژنکردنی بەردەوام، وەك تاوەباران دادەکات و مەبەست نییە وەڵامێکی دیاریکراوی هەبێت. لە ئادابی هەواڵپرسین و چاکی و چۆنی ئێمەدا، ئەو خرۆشانە دەروونییەی لە ئەنجامی بینینی ئەوانیترەوە و لەپێناوی جێبەجێکردنی ئەرکێکی کۆمەڵایەتیدا دروستدەبێت، یان پێویستە دروستیبکەین، خۆی لە ڕێگەی دەمەوە ئاشکرا دەکات. لە کولتووری پەروەردەی کۆمەڵایەتی ئێمەدا قسەکردن دەسەڵاتێکە بۆ دەستەمۆکردنی گوێ. (گوێگرە)، یان (گوێم لێگرە) داوایەکە بۆ بێدەنگکردنی ئەویتر و فەرزکردنی قسەی خۆمان بەسەر ئەویتردا تاکو (بەقسەمان بکات) و ئەوەی بە قسەمان نەکات، یان گوێمان لێنەگرێت، (لەقسەمان دەرچووە) و یەکێکیش کە لە قسەمان دەردەچێت شایانی ئەوەیە سزای بدەین، بۆ نمونە (قسەی لەسەر دەکەین) و ئیتر (قسەی لەگەڵ ناکەین). قسە لەگەڵ نەکردن و دەنگلێدابڕین دیاردەی ئەو کۆمەڵگایەیە کە کولتووری قسە وەك دەسەڵاتێك بۆ بێدەنگکردن و سڕینەوەی کولتووری گوێگرتن دەخاتە گەڕ و بە (قسە لەسەرکردنیش) لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە ڕیسوای دەکەین: (*ئاخر قسەم پێمەکە! با قسە نەکەم..*)، یان: (*دەمی فلانکەس لەخۆت مەکەرەوە و مەیورووژێنە*). لەسەرەتاوە چاوەڕێین زمان بپژێ و شیلەی قسەکان پڕمانکات لە چێژ، وەلێ ڕۆژگاری دێت زمان دەوورووژێ، کە چیدی بە هەنگوینەکەیدا ناییناسینەوە، بەڵکو وەکو هەنگ پێوە دەدات.. لە پەندی کوردیدا هاتووە: (*ئەملا دیوار و ئەولا دیوار، تیایەتی گورگێکی هار..*)!!.

هیچ **گفت** و **گوتنێك** بەتەنیا ئەو گرنگییەی نییە، ئەگەر **گوێیەك** نەبێ بۆ وەرگرتنی ئەوەی کە گوتراوە. هیچ گفتێك بەبێ گوێیەك بۆ بیستنی، ناتوانێ گفتوگۆ

دروستبکات. گفتوگۆ هونەری پەڕینەوەو خۆڕزگارکردنە لـە دەسـەڵاتی تـاکگۆیی و جێهێشتنی یەکدەنگییە لەپێناوی دروستکردنی کەشێکی هاوبەش کە تیایدا فرەدەنگـی بوونی هەیەو **دەم** و **گوێ** تەواوکەری یەکترین. لـە گفتوگۆدا ئـەویتر وەك پانتاییـەکی سەربەخۆی خاوەن گفت تەماشای دەکرێ، کە پێویستە گوێی بۆ بگرین. بەپێچەوانەی بارودۆخی قسەکردنەوە، کە تیایدا ئەویتر مافی قسەکردنی لێسەندراوەتەوە، ئەوە لـە گفتوگۆدا ئەویتر وەك قسەبۆکراو، تەواوکەری دنیای قسەکەرە و قسەکەر خوازیار و چاوەڕوان و کراوەیە بۆ گفت و قسەی ئەویتر. لـە گفتوگۆدا مرۆڤ لـە بوونـەوەرێکی داخراوەوە خۆی دەکاتە بوونەوەرێکی کراوە و بەهۆی گفتەکانییەوە خۆی بـۆ ئـەویتر دەردەبڕێ و بەهۆی گوێیەکانیشییەوە خۆی لەبەردەم ئەویتردا ئاوەڵا دەکات.

مەیلی مـرۆڤ بـۆ گـوێگرتن مـەیلێکی زۆر سـەرەتاییترە وەك لـە دەسـەڵاتی ئـەو بـۆ قسەکردن. ڕاستە مرۆڤ لەپێشەوە فێری قسەکردن دەبێت، بەڵام قسە دەلالـەتە لـەسەر تەندروستیی فیسۆلۆژی و جەستەیی مرۆڤ، چونکە مرۆڤ پێویستە قـسە بکـات. بـەڵام گفتوگۆکردن دەلالـەتە لـەسەر مەدەنیبوون و تەندروستیی شارستانیانەی ئەو کە دەبێت فێری ببێت. *مرۆڤ لەئاستی تاکەکەسیانەدا سەرەتا قـسان دەکـات و پاشـان گفتوگـۆ. وەلـێ مرۆڤ لـە ئاستی شارستانییەت و ژیـاردا لـەپێـشەوە گوێـدەگرێ و پاشـان قـسان دەکات*. ئەوکاتەی مرۆڤ چوارچێوەی ژیانی خۆی ناسی و بە دەورووبەری خۆی ئاشـنا بوو، یەکەمجار گوێی لـە سرووشت گرت و مۆسیقا و شیعری داهێنا. مۆسـیقا و شـیعر هەربەتەنیا لاساییکردنەوەی مرۆڤ نین بۆ سرووشت، بەڵکو ئەنجامی گوێگرتنی ئەون لـە سرووشت و بەڵگەن لـەسەر وەڵامدانەوەی ئەو، بۆئەو دەنگانەی لـە سرووشتەوە بۆی هاتوونەتە ئاخاوتن و قسەکردن. لـەبەردەم دەسەڵاتی سرووشت و گەردووندا، سەرەتا مرۆڤ سەرسام و حەیران دەبێ و پاشان دێتە ئاخاوتن و ئاخاوتنەکەیشی وەڵامە بۆ ئـەو هێزەی بانگی دەکات و ڕووی لێدەنێ. بۆیە مـرۆڤ لـەبـەردەم سرووشـتدا خـۆی وەك قسەبۆکراوێك، وەك ڕوولێنراوێك دەبینێ. هەر بۆیەشە مرۆڤ هەر لـەسەرەتای ژیانـەوە لـە ڕێگـەی داهێنانەکانییـەوە خـۆی لـەبـەردەم پانتـایی گەردوونیـدا دەردەبڕێتـەوە و

داهێنانەکانی مرۆڤ وەڵامدانەوەی ئەون بۆ ئەو شتانەی لـە سرووشـت و گەردوونـەوە بەگوێـدا دراون. مرۆڤ گوێی بۆ ئاسمانەکان و هێزە بانسرووشتییەکان گرتووە و پاشـان وێناکردنەکانی خۆی لە چوارچیوەی ئەفسـانەکاندا دارشتوون. مرۆڤ گوێی لـەناخی پـڕ لە ڕامانی خۆی گرت و زەمینەی ئایینی دارشت و ئامانجی فەلسـەفەی کـردە گەیـشتن بە شارستانییەت لەڕێگەی گفتوگۆوە.

لـە سەرەتاکانی هزری فەلـسـەفیدا، وەك بەڵگەیـەك بـۆ گەشەسـەندنی شارسـتانیەت، *دانـایی* و حیکمـەت ئـەنجامی گـوێگرتن لــە (لۆگـۆس). لـەم ڕوانگەیـەوە، مـرۆڤ بوونەوەرێکی داخراو و گۆشەگیر نییە، بـەڵکو خوازیـاری پێکـەوەبوون و کرانەوەیـە بەرووی ئـەوانیتردا و لــەو ڕێگەیەشـەوە خوازیـاری فێربـوونی دانایيـە. دانـایی، لــە فەلسـەفەی دێرینی یۆنانیدا سەرەتا دانایيـە بـە *ئـەویتر* بـەمانای بـوون و سرووشـت و گـەردوون، دانایيــە بــە ئاسمــان و ئەسـتێرە و هەسـارەکان، دانایيـە بـە ڕەگـەزەکانی سرووشـت و گۆڕانـەکانیان (ئـاو، خـاك، هــەوا و ئـاگر) و پاشـانیش دانایيـە بـە مرۆڤەکانیتر.

فەیلەسووفی ئـەفلاتوونی کەسـێکە جیهـانی نمونـەباڵاکانی دەرککـردووە و پێویـستە ئێمەش لەڕێگەی گوێگرتن بـۆی پـەی بـە حەقیقـەتی ڕاسـتەقینە بـەرین. ئـەفلاتوون دەیەوێ بەزۆر، یان بەهۆی سیستەمێکی پەروەردەیـەوە، ئێمە لـەسەر گوێگرتن بۆ ئـەو بینینانەی فەیلەسووف لە جیهانی باڵادا ئەزموونیکردوون، ڕابهێنێ. لەلای سوکراتیش حەقیقەت دەبێتە بەرەنجامی گفتوگۆ. گفتوگۆی سوکراتی دوو لایەنی هەیـە: گفتوگـۆ لەگەڵ خۆمان لەپێناوی خۆناسیندا، گفتوگۆ لەگەڵ ئـەوانیتر لـەپێناوی گەیـشتن بـە حەقیقەتدا. لە ئەرستۆوە بـۆ سـەدەکانی ناوەڕاسـت و بەتێپـەڕین بـە دیکارتـدا، ئـەم پەیوەندییەی نێوان مرۆڤ و گـەردوون و مـرۆڤ و دەوروبـەری لەڕێگـەی گفتوگـۆوە، گۆڕانی بەسەردا دێت و مرۆڤ گاهێ کرانەوەی خۆی بەرامبەر بـە پانتاییـەکانی بـوون لەڕێگەی گوێگرتنەوە، دەگۆڕێت بۆ *قـسـەکردن* لەسـەر بـوون و دنیـای دەوروبـەر، گاهێکیتریش دەیگۆڕێ بۆ گوێگرتنێکی بێوەڵام و ملکەچانە لەئاست بوونـدا. مرۆڤـی

ئەرستۆیی مرۆڤێکی قسەکەرە و قسە ڕەنگدانەوەی عەقڵی ئەوە بۆ تێگەیشتن لە دیاردەکان. لە سەدەکانی ناوەڕاستدا عەقڵی فەلسەفیانەی مرۆڤ ملکەچە بۆ لێکدانەوە ئاینییەکان و وەحی و پەیامی یەزدانی وەك گوتراوێکی ڕەها، بوار بۆ هیچ بەشداریکردنێکی مرۆڤانە ناهێڵێتەوە: مرۆڤ پێویستە تێبگات و باوەڕ بکات. لە فەلسەفەی دیکارتیشدا مرۆڤ خودێکی بیرکەرەوە، خودێکی لەخۆڕازیی و پشتبەخۆبەستووە کە لە خەڵوەتی خۆیدا تەئەمموول لە جیهان و بوون دەکات و بەشێوەیەکی داخراو، بەڵام سەربەخۆیانە تەفسیر دەکات.
شۆڕشی پیشەسازی و فەرامۆشکردنی پەیوەندیی مرۆڤ بە سرووشت و دەوروبەرییەوە و ئامێرسەروەری، بەهەمان شێوەی کە مشار و تەورەکان دارستانەکانیان دەبڕییەوە، ئاواش پەیوەندیی مرۆڤ و ژینگەی دەوروبەری کۆتایی پێهێنا و پرۆسەی کۆلۆنیالیزم و جەنگە جیهانییەکان، هەموویان بەڵگەی کەمبوونەوەی بەهای گفتوگۆ و نیشانەی سەنتەریزمی قسەن بەسەر گوێگرتندا و ئەمەش لە فەلسەفەی نیتشەدا دۆخێکی نیهلیستی و پووچگەراییە کە مرۆڤ تیایدا بەتەنیا ماوەتەوە و زەمینەی هەر گفتوگۆیەکی لەدەستداوە.. بۆیە لە فەلسەفەی سەدەی بیستەمدا پێویستییەکی گرنگ بە گەڕانەوە و گوێگرتن لە پانتاییەکانی بوون، هەستپێدەکرێ و ئەمەش دەبێتە بابەتی فەلسەفەی هایدەگەر. هایدەگەر بوونی ئەویتر لە دەرەوەی بوونی من نابینێ، بەڵکو لە نەبوونی ئەویتردا بوونی منیش دەکەوێتە بەردەم هەڕەشەی نەبوون. هەمان بیرۆکە و لە ئاستێکی دیکەدا لەلایەن مارتین بۆبەرەوە خراوەتە ڕوو. بۆبەر پێوایە بەرزترین جۆر و ئاستی مرۆڤبوون ئەوەیە کە ئەو مرۆڤە بتوانێ لەگەڵ مرۆڤێکیتردا پێکەوەبێت. پێکەوەبوون لەم مانایەدا، واتە پێکەوەبوونی (من ـ تۆ)بەبێ جیاوازی و یەکتری قەبوولکردن بەوجۆرەی کە هەرکەسە لە سەربەخۆیی خۆیدا هەیە. چونکە *گفتوگۆ لەنێوان دوو کەسی سەربەخۆدا ڕوودەدات کە هەریەکەیان بتوانێ قسەکەر و قسەبۆکرا و گوێگر و گوێ بۆگیراو بێت*. لەنیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا و لەژێر کاریگەریی بیروڕاکانی هایدەگەردا، فەیلەسووفە مەزنەکانی وەك ئیمانوێل

لیڤیناس و پۆڵ ڕیکیۆر، بوار خۆشدەکەن بۆ سەرهەڵدانی فەلسەفەیەك لەسەر بنەمای گفتوگۆ و ڕووبەڕووبوونەوە و بەمەش گفتوگۆ دەبێتە تەوەری سەرەکی فەلسەفە.

***ئایا گفتوگۆ لە کوێوە دەستپێدەکات؟*** لەسەرەتاوە نووسیم: ***هەموو گفتوگۆیەك خوازیاری پێکەوەبوونێکە، بەڵام مەرج نییە لە پێکەوەبوونەکاندا گفتوگۆ دروستببێت.*** پێکەوەبوونی دوو مرۆڤ، دوو نەیار، دوو ناکۆك و دژ و دوو لایەنی بەشەڕهاتوو، لەسەر هەمان مێز و لە هەمان شوێندا، بۆ دروستبوونی گفتوگۆ گرنگیی تایبەتی خۆی هەیە. بەڵام شوێنی هاوبەش و ڕووبەڕووبوونەوەی دوولایەن لەگەڵ یەکتر بەتەنیا ناتوانن گفتوگۆ لەنێوان بەشداربووەکاندا بهێننە ئاراوە. **پێشمەرجی هەموو گفتوگۆیەك لەگەڵ ئەویتر، بریتیە لە گفتوگۆکردن لەگەڵ خۆماندا.** مرۆڤ دەتوانێ بۆ خۆئامادەکردن و گفتوگۆکردن لەگەڵ ئەوانیتردا خۆی بدوێنێ و کەش و هەوای گفتوگۆیەك بهێنێتە پێشچاوی خۆی. ویناکردنی ئەوەی من لەگەڵ ئەوانیتردا کۆبوومەتەوە و مەبەستەکانی خۆمیان بۆ ڕووندەکەمەوە و سەرنجیان بەلای مەبەستەکانمدا ڕادەکێشم و ناچاریان دەکەم گوێم بۆ بگرن، بەمانای خۆ ئامادەکردنە بۆ مانەوە لەگەڵ و بۆ گوێگرتن لە ئەوانیتریش. بەبێ ئەم خۆئامادەکردن و هێنانەپێشچاوەی کەشوهەوای پێکەوەبوونە، گفتوگۆ ڕوونادات و دەسەڵاتی قسەکردن خۆی فەرز دەکاتەوە بەسەر گوێگرتندا و بۆ ئەمەش پێویست ناکات پێکەوە بین تاکو قسەکانمان بەسەر ئەوانیتردا بسەپێنین. مرۆڤێ کە مەبەستی بێت گفتوگۆ بکات مەبەستیەتی بزانێ چۆن گوێی لێگیراوە و تەنیا ئەوکاتەش دەتوانێ بزانێ چۆن گوێی لێگیراوە، کە بتوانێ گوێ بۆ ئەوانیتریش بگرێ.

***چۆن بارودۆخی گفتوگۆیەك بهێنینە پێشچاوی خۆمان؟*** بێگومان بەوەی کە خۆمان لەناو گفتوگۆکەدا بەسەرکەوتوویی ببینین کاتێ کە بەڵگە و بۆچوونەکانمان دەخەینە ڕوو و هەستیش بکەین ئەوانیتر بە ڕێزەوە گوێمان بۆ دەگرن. بیرکردنەوە لە ڕەهەندی پۆزەتیڤانەی گفتوگۆ و دانوستانەکان، هێنانە پێشچاوی سەرکەوتنێکە نەك بردنەوە. لە

گفتوگۆدا ئەو کەسە نایباتەوە کە زۆر قسـان دەکـات و لایـەنی بەرامبـەر دەبـەزێنێ، بەڵکو براوە ئەو کەسەیە کـە سـەرنجی لایـەنی بەرامبـەر ڕادەکێشێ و بارودۆخێـك دروستدەکات کە تیایدا هەردووکیان بیر لـە هـەمان مەبەسـت دەکەنـەوە، واتـە لـە شـتێکی هاوبـەش. وێنـاکردن و هێنانەپێشـچاوی لایەنـە بـاش و بەسـوودەکانی گفتوگۆیەك، هاندەرێکی باشە بۆ بەشداریکردن و چوونە ناو ئەو گفتوگۆیەوە، چونکە ئەگەر مرۆڤ نـەتوانێت پۆزەتیڤانـە بـیر لـە بەشـداریکردنی خـۆی لـە گفتوگۆیەکـدا بکاتـەوە، پێویـستناکات بەشـداریی تێـدا بکـات. ئەگـەر مـرۆڤ نـەتوانێت لـۆژیکی گفتوگۆکردن پەسەند بکات، پێویـستناکات پێکـەوەبوونی لەگـەڵ ئـەوانیتردا بکاتـە بەهانەیەك بۆ ئەوەی قسەی خۆی بەسەریاندا فەرز بکات. گفتوگۆ هونەرە، بەومانایەی بەر لە دەستپێکردنی گفتوگۆ پێویستیمان بە سوودوەرگرتن لە توانایـەکی مرۆڤانـەی خۆمان هەیە، کە هونەرمەندەکانیش بۆ داهێنان پەنای بۆ دەبەن: توانـای وێنـاکردن و خەیاڵکردنەوە و هێنانەپێشچاوی شتی جوان..

***پێویستە لـە کـاتی گفتوگـۆدا چـی بکـەین؟*** ئێـستا ئێمـە گفتوگۆیـەکمان هێناوەتـە پێشچاومان، کە تیایدا سەرکەوتنی خۆمان لەوەدا دەبینینەوە تا سەرنجی ئەوانیتر بەلای بۆچوونەکانماندا ڕابکێشین و تێگەیشتنێك بەرهەم بهێنین، کە پێشتر نەمانبووە. بۆئەوەی بەشێوەیەکی پراکتیکی لەو گفتوگۆیەدا سەرکەوتوو بین و ئامانجەکانمان بەدی بهێـنین، پێویستە یەکەم هەنگاومان لەلای خۆمانەوە ئەوەبێت هەر بۆچوون و لێکدانەوەیـەکی پێـشینە بخەینـە لاوە کـە لـە یەقینـەوە سەرچـاوەی گرتـووە و دەمانگەیـەنێت بـە ڕەهاییگەری. ئەگەر وەك لە پێشاندا ڕوونمکـردەوە: گفتوگـۆ بەڵگـەی تەندروسـتیی شارستانیانەی مرۆڤ بێت، ئەوە ئەو مرۆڤەی لە گفتوگۆدا بەشداریی دەکـات پێویـستە بزانێت ئەو بۆچوون و بیروڕا و سـەلماندنانەی دەیانخاتـە ڕوو، کـەموکوڕیان تێدایـە و هەر ئەوەش ئەوی هانداوە لەپێناوی کامڵکردنیاندا بەشداری لە گفتوگۆیەکدا بکات. بەمەش دەیسـەلمێنێ کە توانا و ئیرادەی هەیە هـەنگاوێ لـەو بیروڕایانـەی خـۆی دوور بکەوێتەوە و خۆی لەگەڵ بۆچوون و بیروڕای ئەوانیتریش بگونجێنێ. مـرۆڤ لـە ژیـانی

کۆمەڵایەتی خۆیدا، بەشێوەیەکی گشتی مەیلی بەلای یەقینباوەڕی و خۆدووبارەکردنەوەدا هەیە، نەك قەبوولکردنی گۆڕان و جیاوازی. *دڵنیابوونەوە* مەراقی یەکەمی مرۆڤە، نەك گومان و پەیگیری و خۆماندووکردن لە پێناوی گۆڕینی بیروراکانیدا. ئێمە هەریەکەمان لە ژیانی خۆماندا بەوجۆرە تێبینی دەوروبەرمان دەکەین تا بیسەلمێنین ئەوەی بیرمان لێکردبۆوە *ڕاستە* و لەسەر *حەق* بووین. لە ژیانی واقیعیدا بۆ ئەو بەڵگانە دەگەڕێین کە بۆچوونەکانی خۆمان *دەسەلمێنن* نەك عەودالی سەلماندنی نوێبین. ئەوکەسانە دەکەینە دۆست و هاوڕێ و خۆشەویست کە بەمەرجەکانی ئێمە ڕازین، نەك ئەوانەی کە جیاوازن. بەمجۆرەش یەقینباوەڕی ژیانی ئێمەی داگیرکردووە و وزەی عەودالی و کرانەوەی بەسەر گۆڕانە گەورەکاندا لێسەندووینەتەوە. بەڵام گفتوگۆ بواری کەشفێکی گەورەمان بۆ دەڕەخسێنێ کە لەئەنجامیدا تێدەگەین: هەموو ئەو بیروبۆچوونانەی بەلای خۆمانەوە ڕاستەقینەی نەگۆڕبوون و ڕۆژگاری لەپێناویاندا ئامادەبووین بچینە جیهاد و جەنگەوە، تەنیا گۆشەیەکی بچکۆلەن بۆ تێگەیشتن لە خۆمان و لە ئەوانیتر و لە جیهان، لەکاتێکدا بۆ چوونە ناو جیهان و ژیان لەگەڵ ئەوانیتر و بۆ تێگەیشتن لە خۆمان، پێویستیمان بە چەندین گۆشەنیگای دیکە هەیە. گفتوگۆ ڕێگایەك، یان هۆکار و ئامرازێك نییە بۆ چوونە ناو ئەو دنیایەوە و گەیشتن بە ئامانجێك لە دەرەوەی خۆی، بەڵکو خودی ئەو ئامانجەیە.

***دەبێ لە گفتوگۆدا چۆن بیربکەینەوە؟*** گفتوگۆ هەر تەنیا لەگەڵ ئەویتردا ڕووبەڕوومان ناکاتەوە، بەڵکو داواشمان لێدەکات هاوکات لەگەڵ ئەویتردا بیربکەینەوە: هاوکاتی بیرکردنەوە و بیرلەگەڵ ئەویترداکردنەوە، مەرجێکی سەرەکییە بۆ پەڕینەوە لەو کاتەی خۆمان بیرمان تێدا دەکردەوە و فراوانکردنی جیهانی خۆمانە لەبەر ڕووناکایی بیرکردنەوەی ئەوانیتردا. لێرەدا مەبەستمان نییە باسی هەڵەوچەوتی بیرکردنەوەکان بکەین. لە گفتوگۆدا، بەپێچەوانەی تاقیکردنەوەی وانەکانی خوێندنەوە، مرۆڤ هەرتەنیا نمرەی باش لەسەر وەڵامە ڕاستەکان وەرناگرێ. بەڵکو

چەوتییەکانیش دەستکەوتن و پێویستە نمرەی شایانیان پێبدەین. ئەگەر لەگفتوگۆدا بۆمان دەرکەوت هەڵەین، ئەمە دەستکەوتێکە و مرۆڤ لە هەڵەکانی خۆیەوە فێردەبێت و هەوڵدەدا دووبارەیان نەکاتەوە، نەك لەبەرئەوەی سەرزەنش و سزا نەدرێ، بەڵکو بەوهۆیەوە کە هەڵەکردن ناخی خۆی بریندار و ماندوو دەکات و ناپەسەندی ناکۆکە بە سرووشتی تەندروستانەی مرۆڤ. خۆ ئەگەر توانیمان بۆ لایەنی بەرامبەریشمان روونبکەینەوە، کە ئەو لەسەر هەڵەیە و ئەوجۆرە بیرکردنەوانەی ئەو پەسەند و مرۆڤانە نین، ئەوە دەستکەوتێکی مەزنترمان وەگیرکەوتووە، چونکە توانیومانە بەڵگە و بۆچوونەکانمان بەجۆرێ بسەلمێنین کە بۆ ئەوانیتریش پەسەند و شایانی لێتێگەیشتنن.

مرۆڤ ناتوانێت بەزۆر کارێ بکات ئەوانیتر لێی تێبگەن و خۆیان بدەن بەدەست تێگەیشتنێکەوە کە بۆ ئەوانیتر سانا نییە قەبوولی بکەن. مانگرتن و دەرگا بەرووی خۆمان و ئەوانیتردا پێوەدان، خەسڵەتێکی مرۆڤانەیە، کە هەر لەمنداڵییەوە بەدیار دەکەوێ و لەهەندێ کولتووردا ئەم خەسڵەتە پەروەردە دەکرێ و کەللەرەقی بەرهەمدەهێنێ.. بۆئەوەی تێگەیشتنێك لەلای ئەوانیتر بۆخۆمان بەدەستبهێنین، پێویستە سەرەتا ئێمە لێیان تێبگەین و لەگەڵیاندا بیر بکەینەوە و دڵنیایان بکەینەوە کە ئێمە دەرکیاندەکەین. دەرککردنی بەرامبەر، واتە خۆخستنە جێگەی ئەویتر و لە روانگەی بەرامبەرەوە تەماشاکردنەوەی ئەو بابەتەی گفتوگۆی لەبارەوە دەکەین. هەرکات لە گفتوگۆدا بەوجۆرە لەخۆمان گەیشتین کە: *تەنیا ئێمەین دەتوانین باش بیربکەینەوە و ئەویتر بگەیەنین بە رۆشنگەری و رێگای پیشانبدەین*، بەهەڵەداچووین. **گفتوگۆ بە کەمترین رێژەی بە تەنیا بیرکردنەوە و بە زۆرترین رێژەی پێکەوە بیرکردنەوە دەگاتە ئەنجام.** گفتوگۆ وەك بیرکردنەوەیەکی هاوبەش، داهێنانێکی مرۆییە لە چوارچێوەی شارستانییەتدا بۆ دەربازبوون لەو تەنیاییەی *بیرکردنەوەی تاکرەهەند* بەسەرماندا دەیسەپێنێ و هەر لەوێشدا بە گۆڕی رەهاییگەریمان دەسپێرێ. *(واچاکە مرۆڤ بیر لەوە بکاتەوە، تەنانەت لە گۆڕیشدا تەنیا نەبێت!)*. هەرکاتێ مرۆڤ تێگەیشت کە

بیر کردنەوەی تەندروست بیر کردنەوەیە لەگەڵ ئەوانیتر، لەوەش تێگەیشتووە کە بۆچی گفتوگۆ خوازیاری پێکەوەبوونی مرۆڤەکانە لەگەڵ یەکتردا.

***ئامانجی گفتوگۆ چییە؟*** گفتوگۆ بۆخۆی ئامانجێکە، وەلێ لەپێناوی گەیشتن بەو ئامانجەدا، ئامانجێك هەیە کە بەرهەمی گفتوگۆیە: ***بەخشین و وەرگرتن***. ئەگەر گوتمان گفتوگۆ دەلالەتێکی شارستانیانەی لەپشتەوەیە و بەڵگەیە لەسەر کولووریزەبوونی هۆشمەندانەی مرۆڤ، لەبەرامبەر کولتووری بۆماوەیی و هەڕەمەکیدا، ئەوە بەخشین و وەرگرتن دوائامانجی هەر گفتوگۆیەکی نێوانمرۆیی و شارستانیانەن. مانای بەخشین لەم بەکارهێنانەدا، بەخشینی شتێکی زیادە و لەکارکەوتووی بێکەڵك نییە لە ئێمەوە بۆ ئەوانیتر، بەڵکو بەخشینی بەهادارترین شتێك و بەهایەکە، کە بۆ ئێمە بەختەوەری و سوودی مەعنەوی و ویژدانی دەگەیەنێت و ئەخلاقی مرۆڤانەمان بەرجەستە دەکات.

گەشەی ڕەگەزیانە، واتە (فیلۆگینی) مرۆڤ پێماندەڵێت: کە ئەم بوونەوەرە سەرەتا *وەرگر* بووە و پاشان کەوتۆتە *بەخشین*. مرۆڤ لەسەرەتاوە سرووشت و هێزە میتافیزیکییەکان وەك دەسەڵاتێکی *بەخشندە* تەماشا دەکات و خۆیشی لە ئاستیاندا وەك بێدەسەڵاتێك دەبینێ. ئەم تێگەیشتنەش لە پێگەی مرۆڤ، ئەو دەکاتە بوونەوەرێکی لاواز، کە تەنیا توانای *وەرگرتنی* هەیە و ئەگەر شتێکی وەرگرت: شوکرانەبژێربێ و ئەگەریش بێدەستکەوت بوو: قەناعەت بکات. زۆرینەی ئایینەکان و سیستەمە سیاسی و دادوەرییە نایەکسانەکان، مرۆڤیان لەسەر ئەم بیرۆکەیە ڕاهێناوە و لەوێشەوە زەمینەی ستەمکاریی کۆمەڵایەتییان دەستەبەر کردووە. بەڵام لە شارستانییەتێکدا کە گرنگیی کولتووری گفتوگۆی دەرك کردبێت، پێگەی مرۆڤ لە (وەرگر/بەخشندە)ـەوە دەبێتە (*بەخشین و وەرگرتن*).

مرۆڤی کولتووریزەبوو، مەرجێکی نییە بۆئەوەی پێمان بڵێت: *تاکو وەرنەگرم، نابەخشم*. بەڵکو ئەو لە هەمان کاتدا بێمەرج دەبەخشێ و وەردەگرێ. لە گفتوگۆدا دەستپێشخەر، یەك لایەنی بەشداربوو نییە، بەڵکو بەشداربووەکان دەستپێشخەرەکانن و ئامادەن بۆ بەخشین و وەرگرتنی بەردەوام. دەستپێشخەری، *ئەخلاقی* بەشداربووانی

گفتوگۆیەکە، کە جیهانی خۆیان دەبەخشنە یەکتر و بەمەش فەزایەك لە خۆیاندا ئاوەڵا دەکەن تاکو بە بەخشندەیی یەکتر سەرلەنوێ پڕی بکەنەوە. بۆیە لەسەرەتاوە گوتمان: هەموو گفتوگۆیەك خوازیاری پێکەوەبوونێکە و لە پێکەوەبوونیشدا ئەو شتانە ئاڵوویر دەکرێن، کە شایانی بەخشینن بە بەرامبەر. کاتێ دەگوترێ: گفتوگۆی *دەوڵەمەند*، *تێروتەسەل*، *چڕوپڕ* و هتد، لەهەموو ئەم دەربڕینانەدا ئاماژەیەك هەیە بە بەخشین و وەرگرتن. بیرۆکەی (بردنەوە) لەبەرئەوە لە لۆژیکی گفتوگۆدا ئەوەندە بێزراوە، چونکە مرۆڤ دەکاتەوە بە (وەرگر) و ئەو شتانەی وەریشیاندەگرێ وەك دەستکەوت و قازانجی مادیی بەرجەستە دەکات.

بەڵام *ئایا لە گفتوگۆدا مرۆڤ چی دەبەخشێت؟* مرۆڤ لە گفتوگۆدا ئەو شتانە دەبەخشێت کە بەمانا مەتریاڵییەکەی (شت)نین و نابن بە شت وەکئەوەی کە چەپکێ گوڵ دەبەخشێت (ئەمە جگە لەوەی مرۆڤ زۆرجاریش کاتێ چەپکێ گوڵ دەبەخشێ، مانا و مەبەستەکەی لەودیو بوونی مەتریاڵیانەی گوڵەکانەوەیە وەك ڕووەك..). ئێمە کاتێ پەنا بۆ دەروونشیکارەکان دەبەین و لە مەجلیسی عارفەکاندا ئامادە دەبین و گوێ بۆ ئامۆژگاریی مامۆستا پەروەردەییەکان و تەفسیری زاناکان دەگرین، هیچکامێ لەوانە بڕێ پارە و دەستکەوتێکی مادییمان پێنابەخشن. بەڵام هەستیش دەکەین زۆر بەخشندە بوون لەگەڵماندا و جیهانی ئێمەیان بەو بیرۆکە و بەهایانە دەوڵەمەند کردووە، کە لەتەنیایی خۆماندا پێیان نەدەگەیشتین و بیرمان بۆیان نەدەچوو. مرۆڤ لە گفتوگۆدا نابەخشێ وەکئەوەی کە ئەو بوونەوەرێکی تەنیایە، بەڵکو ئەوەی دەیبەخشێ بەرهەمی پێکەوەبوونی مرۆڤانەی ئەوە کە لەگەڵ ئەوانیتردا بەدەستیهێناوە. کەواتە ئەوەی دەیبەخشێ ئەنجامی ئەزموون و بیرلێکراوەی بەسوودە بۆ *پێکەوەبوون* و *بەختەوەرکردنی* مرۆڤایەتی. بەشداربووانی هەر گفتوگۆیەك، بەوەی کە پێکەوەبوونەکەیان دەکەنە پێکەوەبوونێکی بەرهەمهێن، توانیویشیانە ویست و ئیرادەی پێکەوەبوون لە ئێمەدا بۆ بەشداریکردن لە گفتوگۆدا، بجۆشێنن. سوودی گفتوگۆ، وێڕای ئەوەی بواری گەشە و فراوانی و کرانەوە لەبەردەم بیرکردنەوەی

بەشــداربووەکاندا وەك *تاکەکــەس*، ئــاوەڵا دەکــات، ئــاواش بەرهــەمی گفتوگــۆ، کەبەخشندەیـە، لـەپەروەردەکردنی ڕۆحیانە و ئەخلاقیانە و عەدالـەتخوازانەی *ڕەگـەزی* مرۆڤدا بەشدارە. ئاژەڵـەکان لـەکاتی ڕووبەڕووبوونەوەیاندا لـەسەر ئەو بەرژەوەندیانەی غەریزە بۆیدەستنیشانکردوون، لـەبەر ئەوەی ناتوانن گفتوگـۆ بکـەن، ئـەوە هـەردەبێ پێکدادەن و لـەسەر یاسای (*بەهێز براوەیە*)، بەرگریی لـە مانەوەی خۆیان بکەن. وەلــێ مرۆڤ بەبەشداریکردنی لـە گفتوگۆدا، تەنانەت ئەگەر بەرژەوەندییە غەریزییەکانیشی لـە مەترسیدا بن و ناچاریشی بکەن ئاژەڵیانە بیربکاتەوە، ئەوە نمونەی بـەرگریکردنێك لــە مانەوەی خۆیمان پیشاندەدات کە پتر مرۆڤانەیە نەك ئاژەڵیانە. مـرۆڤ بەبەشـداریکردنی لـە گفتوگۆدا، بڕیاریداوە نەك هەر پێکـەوەبوون لـەگـەڵ ئـەوانیتر بکاتـە سەرمەشـقی بوونێکی بەهادار، بەڵکو بڕیاریشیداوە هەموو ئەو گریمانانـە لــە بـوونی خـۆی بکاتـە دەرەوە کە لـە گفتوگۆ دووریدەخەنەوە، بۆنمونە پێکدادان و جەنگەکان.. لـەسـەردەمی کلاسیکەوە تا ئەم ڕۆژگارە، مرۆڤەکان لـە پێناوی بەرگریکردن لـە پادشـا و نەتـەوە و یەزداندا، تاسنووری باوەش بەیەکداکردن لـێکدی نزیکدەبوونەوە و دەبنەوە، نـەك بـۆ ئەوەی لـەگەڵ یەکتردا گفتوگۆ بکەن، بەڵکو بـۆ ئـەوەی بـە خەنجەرەکـەی دەسـتیان یەکتر بکوژن و ئەمەشیان بەسەروەری بۆ لـەقەڵـەم دەدرا و دەدرێ. وەلێ ئەوانەی لــە شــوێنە جیاوازەکــانی دنیــای ئــەمڕۆدا پێکــەوەن تــا گفتوگــۆ بکــەن، گفتوگــۆ و پێکەوەبوونەکەیان دەبێتە سەرمەشقێك بۆ هەموو ئەوانەی دەیانەوێ پێکـەوە بـن و لــە تەنیایی خۆیان ڕزگاریان بێ. بەخۆڕایی نییە لـە فەلـسەفەی نوێ و هاوچەرخدا ئەوەندە گرنگیــی بــە ڕۆڵــی گفتوگــۆ و دەســەڵاتی گفتوگــۆ دەدرێ و گفتوگــۆ وەکــو دەستکەوتێکی شارستانیانە تەماشای دەکرێ. ئایا ئەم بارودۆخە دەلالـەت بـێ لـەسـەر گەشەی کولـتووریی مرۆڤ، یاخود کولـتووری گفتوگۆ دوایین ڕێگاچارەبێت لـەبـەردەم مرۆڤدا بۆ بیرکردنەوە لـە کێشە هاوبەشەکانی، دوایئـەوەی ئـەزموونی مێـژوو ئـەوەی فێرکردین کە بـەبێ گفتوگـۆ، ژیـان تـاریکترە لـەهـەر زینـدانێك؟! دەکـرێ ئەمـەیان پرسیارێکی کراوە بێت..

ئەوەی لەم کتێبەدا دەیخوێنیتەوە، هەڵبژاردەی دوازدە گفتوگۆیە لەناو سی‌ودوو گفتوگۆدا و هەوڵدانێکە بەرەو دروستکردنی کولتوورێکی گفتوگۆیانەی بەسوود.

دەمەوێ لەڕێگەی دووبارە بڵاوکردنەوەی ئەم بابەتانەوە، بەشداریکردنێکی هزری و ئەخلاقی و ویژدانیانەی بەپێی توانام پیشاندابێ، سەبارەت بە بیرکردنەوە لەو کێشە جۆربەجۆرانەی کە دوورونزیك پەیوەندییان هەیە بەو بارودۆخەی کۆمەڵگای ئێمە پێیدا تێپەڕ دەبێ. لەگەڵ ئەوەشدا بەداخەوە، زۆربەی هەرەزۆریان بە هەڵپەسێردراوی ماونەتەوە. ئەگەرچی لەکاتی بڵاوبوونەوەی زۆرینەی ئەم لێکدانەوانەدا کەسانێك بەناهەق و لەڕووی بەهەڵەحاڵیبوونەوە، ڕێگەیان بەخۆیاندا غەدرێکی زۆر بکەن، بەڵام گۆڕانەکانی پاشتر زۆرینەی بۆچوونەکانی ناو ئەم گفتوگۆیانەی سەلماند. ئێستاش کە ئەم کارە هاوبەشەی نێوان خۆم و کۆمەڵێ ڕۆژنامەنووس و قوتابی و نووسەر بڵاودەکەمەوە، ئومێدی ئەوەم هەیە ئەوانەی لەکاتی خۆیدا بەهەڵەشە گفتەکانی ئێمەیان لێکدایەوە، لە ئێستادا وردتر بیریان لێبکەنەوە. ئێمە لەکاتێکدا گفتوگۆماندەکرد، کە خەڵکانێك پلانیان بۆ خوێنڕشتن و تەقاندنەوە و شاردنەوەی گەندەڵییەکان دادەڕشت و هەر ئەمەش جیاوازی نێوان دووجۆر مرۆڤبوون و دووجۆر کردار پیشاندەدات.. خوێنەر لە خوێندنەوەی گفتوگۆکان ئازادە و من لە ئامادەکردنەوەیاندا، جگە لە ڕاستکردنەوەی هەڵەی چاپ و ڕێنووس (کە هێشتاش بێکەموکوڕی نییە)، زۆر بەدەگمەن گۆڕانکاریم تێدا کردوون و لە ڕیزبەندیشدا ڕەچاوی ڕێکەوتی سازدانیانم نەکردووە. ئەمە جگەلەوەی زۆرینەی ناونیشانی گفتوگۆکان لەلایەن ئەنجامدەرانەوە داندراون و منیش وەکخۆیان هێشتوومنەتەوە.

ماوەتەوە بڵێم، ئەگەر هەدادان و وردەکاری ئەو مرۆڤانە نەدەبوو کە ناویان لە سەرەتای هەر گفتوگۆیەکدا هاتووە، ئەم بەرهەمە هەرگیز بە ئەنجام نەدەگەیشت. تکا دەکەم ئەگەر لەکاتی گفتوگۆکاندا زیاتر لەوەی پێویستە زەحمەتم دابن، لێمببوورن..

*ر. س.*

*سلێمانی: ٢٠٠٦/٦/١١*

# دێوانەیەکی گەشبین!

## (گفتوگۆیەك لەگەڵ فەیلەسووف میخایل لارسن) دا

*(ئەم گفتوگۆیە لە ١٩٩٥/٢/١٤ دا لە ماڵی (لارسن) ئەنجامدراوە و بۆ یەکەمجار لە گۆڤاری یەکگرتندا بڵاوکراوەتەوە).*

{ئایا فەلسەفە لەسەر هەژاری قسەی هەیە؟ فەلسەفە و ئایدیۆلۆژیا لەکوێدا بەیەکتر دەگەن؟ پەیوەندیی ئەوروپا بەجیهانی تازەگەشەسەندووەوە، لە هەستکردنەوەیە بەگوناه، یان لەبەزەییەوە؟ رۆشنبیرانی جیهانی سێیەم و پەیوەندییان بە نەریت و دەزگاکانی حکومەتەوە، هەڵوێستی مۆدێرنیتە لە تەقلیدیەت و پەیوەندیی بە پۆستمۆدێرنیتەوە، سەنتەریزمی ئەورووپی و ئاشتیی جیهانی و چەمکی ئەویتر و هتد}

## هەژاری و فەلسەفە

***رێبوار:*** *هەفتەی رابردوو لە کۆبنهاگن کۆنگرەی جیهانی بۆ گەشەپێدان و چارەسەرکردنی کێشەی هەژاری(*) کۆتایی پێهات، لەو کۆبونەوەیەدا رابەر و رزگارکەران، پادشا و دیکتاتۆرەکان هاتنە قسە و ئاخافتن، بەڵام فەیلەسووفەکان دیارنەبوون. چما فەلسەفە هیچ شتێکی لە بارەی چارەسەرکردنی کێشەی هەژارییەوە نیە بیڵێ یا خود ئامادە نەبوونی فەیلەسووف نیشانەو بەڵگەی ئەوەیە کە ئەو کۆنگرەیە هەر لە بنەماوە چاوپەستێ بوو لە ئاست چارەسەرکردنی کێشەکە و هەوڵدانێ بوو بۆ خنکاندنی ئەو هاوارەی چیدی جیهانی دەوڵەمەند ناتوانێ گوێی خۆی لێ بخەوێنێ؟*

**لارسن:** وەك من دەیبینم، كێشەی هەژاری یەكێكە لە گەورەترین كێشەكانی مێژووی كولتووری ئێمە، سەرەتای ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەر هەڵدانی كۆمەڵگا. فەیلەسووفەكانیش جگە لەوەی خۆیان بەهەموو شتێكی دیكەوە سەرقاڵكردووە، بێ ئاگاش نەبوون بە كێشەی هەژاری.. بەڵام خودی كێشەكە بەردەوام سەری هەڵداوەتەوە و ئامادە بووە تا سەردەمی ئێستا، كە وەك دەبینی كۆنگرەی جیهانی لە دەبەسترێ. ئەم كۆنگرەیەش بەبیری من چاوبەست نییە، بەڵام هۆی ئەوەی كە ئێستا لەمەودای جیهاندا قسە لە مەڕ هەژارییەوە دەكرێ ئەوەیە كە چیدی ئەو دابەشبوونەی جاران لە نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوادا نەماوە. پێش ئێستاش خۆرئاوا گرنگی بە مافەكانی تاكەكەس و ئازادی سیاسی دەدا و خۆرهەڵاتی ئەوروپا و بەشێ لە وڵاتانی جیهانی سێهەم لەمەڕ مافە ئابووری، كۆمەڵایەتی و كولتوورییەكانەوە دەدوان. ئەم دوو جۆرە مافە هەمیشە ڕووبەڕووی یەكدی وەستاونەتەوە وەك هەڕەشە و دروشمی لایەك بۆ سەر لایەكەی دی بەكار هێنراون. دە ساڵ لەمەو بەر ئەگەر باسی مافە كۆمەڵایەتییەكانت كردبا، لە خۆر ئاوا بەوە لێك دەدرایەوە كە دەتەوێ بیروڕای كۆمۆنیستی گەشەپێدەیت. بە پێچەوانەیشەوە ئەگەر باسی مافەكانی تاكە كەس كرابا، ئەوە لە وڵاتانی خۆرهەڵاتی ئەوروپا دەخرایتە خانەی ئایدیۆلۆژیەتی خۆرئاواییەوە كە هەوڵ دەدات بۆ داڕماندنی خۆرهەڵات. ئێستا كە ئەو دابەشبوونە لە ئارادا نەماوە، بواری ئەوە هاتۆتە دی ئەو جۆرە كێشانە لەلایەن هەردوو لاوە و بەشێوەیەكی بەكۆمەڵی گفتوگۆیان لەبارەوە بكرێ بەبێ ئەوەی وەك جەنگێكی ئایدیۆلۆژی لێكبدرێتەوە. من لەو بڕوایەدام بەستنی ئەم كۆنگرەیە بەڵگەیەكی باشە بۆ سەلماندنی ئەوەی كە ئەو دیوارە چیدی لە ئارادا نەماوە. ئەگەرچی لیبراڵەكان هێشتنا ئەم كۆنگرەیە بە (كۆنگرەیەكی سۆشیالیستی) ناو دەبەن، چونكە بوارێ بۆ ڕەخنە گرتن لە مەسەلەی (میكانیزمی بازاڕی ئازاد) كە بەلای هەندێ لەو لیبڕاڵە فەندمەنتالیستانەوە هەموو سنوور دانانێ بۆ میكانیزمەكانی بازاڕی ئازاد و هەموو ڕێكخستنەوەیەكی سەرلەنوێی ئەو میكانیزمانە، كارێكی خراپە. بەڵام لەبەرامبەر ئەو بۆچوونەدا بۆچوونێكی فراوانتر هەیە كە دەڵێ، ئاخاوتنی

بەرفراوان لـە شێوەی ئـەو کۆنگرەیـەدا، باشییەکەی ئەوەیـە کـە چیدی هـیچ لایـەك لایەکەی دی بە کاپیتالیست یاخود کۆمۆنیسست لەقەڵەم نادات.. ئەمەش لە خزمـەتی خودی چارەی کێشەکەدایە. سەبارەت بەوەی ئەی فەیلەسووفەکان لـە کـوێن؟ ئەمـە پرسیارێکە منیشی پێوە گـیرۆدەم. بۆچـی فەیلەسـووفەکان نـەیانتوانی رۆڵێکـی دیـار بگێڕن یاخود رۆڵێکی دەستپێشخەرانە؟ ئەوی دەشێت لەم بارەیەوە بیڵێم ئەوەیە کە ئەو بابەتـەی لـە بنـەمادا بابـەتێکی فەلـسەفیە ئـەورۆ بۆتـە شـتێکی هێنـدە گشتی و بەربڵاو کە پێویست ناکا چی دی فەیلەسووف بێن بۆ ئەوەی ببیـنین، چـونکە هـەموو خەڵك دەتوانن لە بارەیەوە بئاخڤن. لە بیرت نەچێ گرنگی لەوەدا نیە کە فەیلەسووف وەك تاکـــە کەســـێ پـــەیامی دڵخۆشـــکەرمان بـــۆ بهێنـــێ و وانـــە رەوشـــتامێز (أخلاقی)یەکانمان بەبیر بخاتەوە. باشتر ئەوەیە فەیلەسووفەکان خۆشیان سادە بـن. چونکە ئەگەر پرسیمان فەیلەسووف کێیە؟ دەتوانین بڵێین فەیلەسـووف جۆرێکـە لـە ویژدان کە خواستە گشتیەکانی کۆمەڵگا دەخاتە بەر باس. جا ئەگەر کۆمەڵ خۆی لـە توانایدا بێت کێشەکانی خۆی دەستنیشان بکا و بە شێوەیەکی گشتی لـە بارەیانـەوە بدوێ، ئەوە بە مانای ئەوەیـە فەلـسەفە ئۆرگـانیزە بـووە و بۆتـە بەشـێ لـە کۆمـەڵ. بەهەر حاڵ ئەوە تەنیا بەشێکی وەڵامی پرسیارەکەتە.

***رێبوار: کاتێ ئـەم کۆنگرەیـە بـە چاوبەسـت ناودەبـەم دوو بەڵگـەم بەدەسـتەوەیە: یەکـەمیان تەنانـەت کۆپنهـاگنیش نـەیتوانی نایەکـسانی لـە نێـوان میوانـە هـەژار و بەشـداربووە دەوڵەمەندەکانـدا بـشارێتەوە. لـە راسـتیدا کۆنگرەکـە دوو ڕەوتـی بـە خۆیەوە گرتبوو کە یەکێکیان ڕەسمی بوو بۆ سـەرکردە و سیاسـەتمەداران و ئـەوی تریشیان ناڕەشمی بوو بۆ رێکخراوە سـەربەخۆ و کەسـایەتیە چالاکەکان. ئـەم دوو کۆنگرەیەش لە دوو شوێنی جیـاوازی شـاری کۆپنهـاگن دەچـوون بـەڕێوە. بەڵگـەی دووەمی من بۆ سەلماندنی ئەوەی کە کۆنگرەکە چاوبەسـتێ بـوو بـۆ بێـدەنگکردنی دنیای هەژار، بریتیە لـە ئـەنجامی کۆنگرەکـە خـۆی: جگـە لـە دانمـارك، هۆڵەنـدە و سویسرا هیچ وڵاتێکی دی جیهانی دەوڵەمەند یارمـەتی دەسـت و بردیـان پێـشکەش***

***نەکرد. لە راستیدا ئەم کۆنگرەیە هیچ ئەنجامێکی کۆنکرێتی بۆ چارەسەرکردنی کێشەیەکی گەردوونی وەك کێشەی هەژاری نەخستە ڕوو.***

لارسن: ڕاستە، ئەنجامی کۆنکریتی نەدا بە دەستەوە، بەلام کردەی سیاسی کردەیەکە ماوەیەکی زۆری گەرەکە. کاتێ دیواری نێوان خۆرهەلات و خۆرئاوا هەلگیرا، ئەمە شتێ بوو ئەنجامی چەندین گفتوگۆ و دانیشتن، کە بەشداربووانی هەردوولا تیایاندا فێری پێکەوە ئاخاوتن و بیروڕا گۆڕینەوە بوون. ئەمەش لە نێوان خەلکانێکدا رووی دا کە خواست و پلانی جۆر بە جۆریان هەبوو. دیارە خودی ئەم هەنگاوە نیشانەی ئەوەیە کە دواتر دابڕانێك دێتەئاراوە. ئەمە لە لایەك، لە لایەکی تریشەوە ئێمە چەند نموونەیەکی بە کردەوەمان لەبەردەستایە کە لە بیست سالی رابردوودا ئەنجامی باشیان داوە بە دەستەوە و لێیانەوە فێری ئەوە بووین کە ئەو جۆرە دانیشتن و کۆنگرە بەستنەش سوودی باش بە دووی خۆیان دەهێنن: یەکێ لەو نموونانە وەستانەوەیە لە دژی دیکتاتۆریەت. دیارە دیکتاتۆریەت وەك بیر. لە ماوەی پازدە بیست سالی رابردوودا زۆربەی ئەو دەولەتانەی بەرەو دیموکراسیەت هەنگاویان ناوە، پێشتر حوکمی دیکتاتۆری بوون. زۆرن ئەو ولاتانەی ئەمرۆ لە جیهانی سێهەم و خوارووی ئەمریکادا دیموکراسیەتێکی رووکەشیان پیادەکردووە. ئەمەش لە کاتێکدا هەر ئەو ولاتانە پێش دە سالێ ولاتێکی دیکتاتۆری بوون. ئەمە چۆن رووی دا؟ بێگومان دەبێ بەشێکی زۆری ئەم پرسیارە بە ئەنجامی گفتوگۆ، پێکەوە دانیشتن و کۆنگرەی نێو نەتەوەیی و زۆر بۆ هێنانی راگەیاندن بزانین، کە لە ئاستێکی جیهانیدا توانیویانە دیکتاتۆریەت لە چوار چێوە (یاسایی)یەکەی دابمالن! . نموونەیەکی دی بریتیە لە ژینگەی دەوروبەر (økologi). دە- پانزە سالێ پێش ئێستا کە باسی ژینگە و دەوروبەرت کردبا بە مرۆیەکی خەیالپەروەر و سەرسوڕهێنەیان لە قەلەم دەدای. ئەمرۆ مەسەلەی ژینگە بەبێ دوو دلی یەکێکە لەو کێشانەی چەندین گفتوگۆی بە دووی خۆیدا دەهێنێ و بۆتە شوێنگرنگپێدانی زۆربەی ولاتان.. کەواتە نابێ زوێر بین لەوەی کۆنگرەی جیهانی گەشەپێدان و چارەسەرکردنی هەژاری نەیتوانی کۆمەلێ بڕیاری دەست و برد دەربکا. ئەوەی ئەم کۆنگرەیە کردی بریتی بوو

لە(نارەوایی)کردنی هەژاری. هەنگاوێ بوو بۆ ئەوەی چیدی هەژاری وەك شتێکی یاسایی و ڕەوا پەسەند نەکەین. ئەمەش شتێکە پێشتر نەبووە.

***ڕێبوار : بەڵام لەو دیو ئەو ئەنجامە چاوەڕوانکراوەوە مەبەستێکی تر هەبوو. دەکرێ بڵێم ئەو مەبەستە ویژدان پاکردنەوەی خۆرئاوا و دنیای دەوڵەمەند بوو لە ئاست دنیای هەژاردا؟ ئاخر دەزگای نەتەوە یەکگرتووەکان لە ئاست چەندین کێشەی سیاسیدا تووشی تێکشکان و قەیران هاتووە. دیارە بەشێکی ئەو قەیرانە قەیرانی وڵاتانی دەوڵەمەندیشە. خۆرئاوا هەمیشە وای پێشان دەدات کە ویژدانی نائارامە، بەڵام بەشێوەیەکی پراکتیکی..***

لارسن: ئەمە ویژدانی خۆپاککردنەوە، یاخود بەرگری لە خۆکردنی خۆرئاوا نەبوو. خۆرئاوا لەسەر ئەو یارمەتییەی دەینێرێ هەمیشە ڕەخنەی لێ دەگیرێ و هەتا ئەو یارمەتیەش کە دەینێرێ بەم جۆرە بێ، ئەوە ڕەخنە بەردەوامە.. هیچ بەڵگەیەك بەدەستەوە نییە لە ئاست ئەمەدا بێدەنگمان بکا. تەنانەت جوڵەی سەرمایە بە ئاراستەیەکدا دەڕوا کە ئەنجامەکەی بەوە دەکەوێتەوە وڵاتانی دەوڵەمەند دەوڵەمەندتر بن و وڵاتانی هەژاریش هەژارتر. ئەمە شوێنی ڕەخنەی زۆرە و پێویستیشە سنوورێ بۆ ئەو بارودوخە دابنرێ. ئەمەش تەنیا بە گفتوگۆ و دەسەڵاتی کۆنفرانس و میدیاکان دێتەدی. بەڵام ئەمن پێموانیە و نابینم کە کۆنگرەی نێوبراو پانتاییەکی خۆدزێنەوە بووبێ، چونکە گەر وابایە، ئەوا دەشیا بەشداری نەکرابا، یاخود کاربەدەستانی پلە نزم نێردرابان بۆ ئەوەی لە پاشانیشدا بواری لا پێچدان و گوێ خۆ کەڕ کردن ئاسانتربایە. لە خۆرئاوا بیروڕای ئەوتۆ هەن کە دەخوازرێ شێلگێرانە کاریان بۆ بکرێ و بهێنرێنە دی. بەڵام واقیعێکی سیاسیی ئەوتۆش هەیە کە تەواو جیاوازە و ڕێدەگرێ لە هێنانە دی ئەو بیروڕایانە.

***ڕێبوار: هەڵبەتە ئەگەر پاککردنەوەی ویژدان نییەتێکی نادیاربێ، یاخود وەك ئێوە دەڵێن هەر لەئارادا نەبووبێ ئەوە ناکرێ چاو بپۆشرێ لەو ڕەوایەتیەی خۆرئاوا دەیداتە هەندێ سەرکردە و کەسایەتی: بەشێکی زۆری بەشداربووەکان، بەتایبەتی سەرۆك دەوڵەتەکانی جیهانی سێیەم بە هیچ شێوەیەك لەلایەن خەڵکەوە***

*هەڵنەبژێردراون، کاتێکیش لە کۆنفرانسێکی جیهانیدا بەشداریدەکەن و گوێیان بۆ دەگیرێ، وەك کەسانێك دەناسێنرێن کە دەیانەوێ بەشداری بکەن لە چارەسەرکردنی کێشەیەکی مرۆڤایەتیانەی وەك هەژاریدا.. ئەمەش بەبێ ئەوەی کۆنفرانسەکە لەتوانایدابێ ئەو دیکتاتۆرانە وەك هۆیەکی سەرەکی مانەوەی هەژاری بناسێنێ.*

لارسن: سەیرکە.. دەتوانین بڵێین ئامادەبوونی خۆرئاوا دەشێت جگە لە نیەتی چارەسەرکردنی کێشەی هەژاری، ئەو نیەتەیشی لەپشتەوە بێت کە تۆ باست کرد. ئەمەش شتێکە سەرم ناسوڕمێنێ! بڕوای تەواویشم بەوە هەیە کە بەشێکی زۆری ئەو سەرکردە ناشەرعیانەی بەشداربوون، هیچ بەرژەوەندییەکیان لە چارەسەرکردنی کێشەی هەژاریدا نیە و تەنیا دەیانەوێ لە گۆڕەپانی نێونەتەوەییدا خۆیا بدەنە بەر خۆر.. هیچ گومان لەمەدا نیە. ئەوان حەز بە دیموکراتی ناکەن، داوای یارمەتی دەرەوە دەکەن و داوای رێ و رەسمی باشتر بۆ بازرگانی و ئاڵوگۆڕ دەکەن. بەڵام لە خەیاڵیاندا نیە واز لە دەسەڵات بهێنن. لەگەڵ ئەمانەشدا ئەگەر بتەوێ لەئاستێکی گەردوونیدا چارەی کێشەکان بدۆزیتەوە، ناتوانی چاو لەو جۆرە کەسایەتیانە بپۆشی کە لە دوا ئەنجامدا ئەمە جۆرە ڕوایەتی پێدانێکە، بەڵێ، جۆرێ لە دانپیانان!

*ڕێبوار: هەرلەبەر هۆی بازرگانی و کەلوپەل ناردنە دەرەوەیشە کە خۆرئاوا پەنجەیان لێبەرزناکاتەوە، لەبەر ئەوەی مافی مرۆڤ پێشێل دەکەن.. چونکە هەموو پەنجە بەرزکردنەوەیەك لەدەستدانی کڕیارێکە، کەمبوونەوەی مشتەرییەك!*

لارسن: دەکرێ لێرەیشەوە ڕەخنە ئاڕاستەی خۆرئاوا بکرێ.. بەڵام لەو دەمەوە کە (کارتەر) لە کۆتایی حەفتاکاندا کەوتە داڕشتنەوەی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا، (لە سیاسەتێکەوە کە ئەمریکای بەپلەی یەکەم دەبینی بۆ سیاسەتێ کەمافی مرۆڤی کردە پلەیەك)، ڕووداوێ ڕوویدا. لەو دەمەوە بووە شتێکی ئاسایی مەرج بۆ ئەو دەوڵەتانە دابنرێ کە یارمەتی دەرەوەیان وەر دەگرت. بەپێی ئەو مەرجە چاوەڕێدەکرا لەبری یارمەتیەکان پرۆسەی دیموکرازەکردن لەو وڵاتانەدا پیادە بکرێ و ڕێز لە مافی مرۆڤ بگیرێ.. کەواتە مافی مروڤ وەك جۆرێ هێز لە بەرامبەر دیکتاتۆریەتدا بەکارهێنرا. ئەمەش شتێکە پێشتر نەبووە، چونکە بەر لەوە ئەمریکا

یارمەتی هەر لایەنێکی دەدا بەومەرجەی دژ بە کۆمۆنیزم بایە. ئەمەش بەو مانایە نا کە ولاتە یەکگرتووەکان چیدی بەرگری لە بەرژەوەندییەکانی خۆیان ناکەن، من دەمەوێ دووپاتی بکەمەوە کۆنفرانسی لەمجۆرە نیشانەی ئەوەیە چیدی نامانەوێ لەرێگەی زەبروزەنگەوە کێشەکان چارەسەربکرێن.. ئەمەش جۆرێکی دیکەی ئاگاییە کەنابێ لەئاستیدا رەشبین بین.

***رێبوار: ئەو خاڵە گرنگانەی بەلای ئێوەوە لە کۆنگرەکەدا باسیان نەکرا چی بوون؟ ئەگەر ئەو کۆنگرەیە و ئەنجامەکانی رەشبینی هەڵناگرێ، دەکرێ باس لە لایەنە لاوازەکانی بکەین؟***

لارسن: مەسەلەی (وازهێنان لە قەرز) باسکرا، بەڵام هەروەك بۆخۆت لە پێشاندا ناوت هێنا، کەم بوون ئەو ولاتانەی هەستان بە واز هێنان یاخود کەم کردنەوەی قەرزەکانیان لەسەر ولاتە هەژارەکان. ئەوانەی بە شێوەیەکی واقیعی بەمکارە هەستان سویسرا، نەمسا، هۆڵەندە و دانمارك بوون.. بەڵام ئەمەش رێژەیەکی کەمی یارمەتییە لە چاو گەورەیی کێشەکەدا، چونکە کەمی ئەم جۆرە یارمەتی و دەستپێشخەریانە لە خزمەتی مانەوەی جیاوازییەکانی نێوان جیهانی دەوڵەمەند و هەژاردان. قسە نەکردن لەسەر لابردنی ئەو جیاوازییانە خۆی لە خۆی دا سکەندالێکی گەورەیە. بە باشی لە نوێنەری هەندێ ولاتانی جیهانی سێهەم دەگەم، کە لە ئاست ئەو گێرفان قووڵییەی ولاتانی دەوڵەمەندا سەریان سوڕمابوو.

شتێکی دی کە پشتگوێخستنی لە کۆنفرانسەکەدا جێی پرسیارە بریتیە لە ئابلۆقەدانی کوبا لەلایەن ئەمریکاوە. جگە لەوەی ئەمکارەی ولاتە یەکگرتووەکان بە ژێر پێوەنانی مافی نێونەتەوەییە، کوبا خۆیشی ولاتێکە لە قۆناغی گەشەسەندندا و لە رووی کۆمەڵایەتیشەوە کۆمەڵگایەکە تا ئێستاش پشت دەبەستێ بە ئابووریی کشتوکاڵ. ئەوەی جێی پرسیارە بریتیە لەوەی بۆچی لەگەڵ ئاگاداربوونیش لەم راستیانە هێشتا بواری ئەوە نایەتە پێش بۆ دادگاییکردنی ئەمریکا و جەریمەکردنی. ئەگەرچی من گومانم هەیە لەوەی ئەمریکا ئامادەیی خۆی لەو دادگاییەدا پێشان بدا، بەڵام هێشتا سەرم دەسووڕمێ لە فزولیەتی ئەورووپا، چونکە ئەوەی ئەمریکا بەرامبەر ولاتە

سەربەخۆکانی هاوسێی دەیکا، گەر شوورەوی جاران کردبای، وەك لە نموونەی ئەفغانستاندا بینیمان، ئێستا قیامەت بەرپا دەکرا و بە ناوی بەرگریکردن لە مافی مرۆڤ دەیان نارەزاییمان دەبیست. بینیمان هێزی سەربازی ئەمریکا لەسەر خاکی زۆربەی ولاتانی دەوروبەری خۆی ئامادە بوو: گرانادا، هائیتی، پەناما، یارمەتی شیلی و هتد. هەروەها ئەمریکا دەتوانێ دەوڵەتان لەکار بخا و بێ ئیعتیباریان بکا، کە هەموو ئەمانە لە دژی مافی نێونەتەوەیی و یاسا نێونەتەوەییەکانن. لاوازی (ئەورووپای یەکگرتوو) لەوەدایە کە ناتوانێ لە بەرامبەر بەرژەوەندی هێزە گەورەکاندا هەڵوێستێکی گەورە وەربگرێ.

***رێبوار: ئایا ئەم لاوازییە لاوازی بڕیاردانە یاخود لاوازی ئیرادەیە؟***

لارسن: بێگومان ئەمە لاوازی ئیرادەیە، چونکە ئەو جۆرە هەڵوێستانە پێویستیان بە کامڵبوون هەیە، پێویستی بە ئەوە هەیە سەرکردەکانی ولاتانی ئەورووپا بروایان بە خۆیان هەبێ و بتوانن لەو ساتە وەختە ناسکانەدا کە رەوشتیان دەڵێ نەء ، بڵێن نە ! لەم ڕووەوە (فرانسوا میتیران) ڕەخنەی لە ئەمریکا گرت. ئەو ئیرادەی هەیە و دەوێرێ. یاخود بەراستی ئەم سنگهێنانە پێشەوەیە لە پێناوی مافی مرۆڤدا و ئەو چاوپۆشینە لە ئاست پێشێلکردنی مافی مرۆڤدا لەلایەن دەوڵەتە بەهێزەکانەوە، بریتیە لەو زۆنگاوی دوو فاقیەی سیاسی و دەسەڵاتدارانی ئەورووپا تیایدا دەژین، کە ئەمەش لە دواجاردا جێگەی تێرامانە. لەبیرت نەچێ کۆنگرەیەکی ئەوتۆ بەر لەهەر شتێ بەناوی(ڕسمیەتی جیهانی)یەوە دێتە کایەوە کە ئامانجی دانانی ئەو یاسا گەردونیانەن کە سنووری شەڕ، یاخود(شەڕانیەتی مرۆڤ) دیاریدەکەن و مافی دەوڵەت و نەتەوەکان لەبەرامبەر یەکدا دەست نیشاندەکا.

***رێبوار: هەمان ئەو تێزەی کە(کانت) لە کتێبی(ئاشتی هەمیشەیی)دا داوای وەدیهێنانی دەکات و بەمەرجی دابینکردنی تەبایی مرۆڤایەتی ناودەبا..***

لارسن: بەڵێ هەمان وێنا لە سەر تەبایی مرۆڤایەتی، بەلام بۆ ئەوەی ئەو تەباییە وەك ئامانجێ دەستنیشان بکرێ، مرۆڤ ناچارە بە چەندین قۆناغی گفتوگۆ و بڕیاری هاوبەشدا تێنەپەڕێت بۆ ئەوەی لە نەرێت و بەهاکانی یەکدییەوە فێربین و یەکدی

هەڵسەنگێنین. جا پێدەچێ بەشێکی ئەو شتەی پێشتر بە لاوازی ئیرادەمان ناو برد، بریتی بێ لە جۆرێ کردەوە کە لەدواجاردا خزمەتی وەیهێنانی تەبایی مرۆڤایەتی بکا..

## ڕۆشنبیر ، پرسیار، گفتوگۆ

*ڕێبوار: چۆن پێناسەیەك بۆ ڕۆشنبیر بکەین؟ ئەگەر گوتمان ڕۆشنبیر و فەیلەسووف کار لە دوو پرۆژەی جیاوازدا دەکەن و خاڵی دەسپێکردنی جیاوازیان هەیە، ئەوە بەرپرسیار دەبین بەرامبەر بە دەستنیشانکردنی وردتری ئەو دو جۆر پرۆژەیە. دەشێت پرۆژەی فەیلەسووف بە پرۆژەیەکی گەردوونی ناوبەرین کە تیایدا پرسیار لە مەسەلە گەردوونیەکان دەکرێ و پرۆژەی ڕۆشنبیریش بە پرۆژەیەکی ناوچەیی، بەو مانایەی کە ڕۆشنبیر مەحکومە بە دەروەستییەك لە ئاست مێژوو، نەتەوە و کولتووری کۆمەڵگای لۆکاڵیدا. بەڵام لەگەڵ ئەم جیاوازییەشدا هەردووکیان لەوەدا، کە ڕەخنەگرانە ڕووبەڕووی کێشەکان دەبنەوە و پرسیار لە ئاستیاندا بەرزدەکەنەوە، تەبان.. تۆ لەم بارەیەوە چ دەڵێی؟ ئایا خاڵی هاوبەشی دیکە لە نێوان ئەم دوو پرۆژەیەدا دەبینی؟*

لارسن: من پێموایە ئەم جۆرە جیاکردنەوەی ڕۆشنبیر و فەیلەسووف، جیاکردنەوەیەکی سەرقاڵکەرە. چونکە فەیلەسووفیش جۆرێکە یان جۆرێکی تایبەتە لە ڕۆشنبیر. دەتوانین بڵێین زاراوەی ڕۆشنبیران لە زاراوەی فەیلەسووفەکان بەرفراوانترە و یەکێك لە گروپی ڕۆشنبیران فەیلەسووفەکانن. گروپێکی دیکەی ڕۆشنبیران ئەوانەن کە بە "ئۆرگانی" ناودەبرێن و لە ڕاستیدا ڕۆڵی پاڵێوەر و هەڵسەنگێنەری کۆمەڵگایان لەسەر شانە. ئەمانە ئایدۆلۆژییەکیان هەیە، تەکنیکزانن، ئیرادە و زانیاری تایبەتییان هەیە و بە شێوەیەکی ئاساییش وەك بەرێوەبەرانی کۆمەڵگا خزمەت دەکەن. ئەوجا گروپێکی بچکۆلە هەن لە فەیلەسووفەکان کە خۆیان لەوانی دی جیادەکەنەوە و وێڕای گرێنەدراویشیان بە بازار و تەکنیك و لایەنی

هونەرییەوە، ڕێگا بە خۆیان دەدەن بە ناوی گشتەوە یان ویژدانی گشتەوە قسان بکەن. من پێشتر گوتوومە کە ئەم جۆرە کەسایەتیە لە مێژووی دێرینی مرۆڤایەتیدا ناسراون و تایبەتمەندیەتی خۆیانیان هەبووە. ئەمانە ئەو پێغەمبەر پێشەوایانە بوون کە خەڵکیان بەرەو تەبایی و ئارامی هاندەدا و خۆیان بەرپرسیار دەزانی خەڵکی لە ئاست پرسیارە ڕەوشت ئامێزی (أخلاقی) و ئەو زوڵمەی کە خەریك بوو لە نەرێت و خوداکان بکرێ، ئاگادار بکەنەوە. لەسەردەمی مۆدێرندا مانای ئەم چەمکە دەگۆڕێ و فەیلەسووف وەك پێشڕەوێك، وەك ڕەخنەگرێك تەماشای دەکرێ کە پرسیار لە ئاست بارودۆخی ئامادە و پێشچاودا بەرزدەکاتەوە. فەیلەسووف، ئەو مرۆڤانەن کە لە ڕەوایەتی و یاساییبوونی ئەو کردە و نەریتە ڕۆژانانەییانە ئاگادارمان دەکەنەوە کە پێیان هەڵدەستین، ئەمە ئەو ڕۆڵەیە فەیلەسووفەکان لە پێنسەدساڵی ڕابردووەوە تا ئەم سەردەمە لە مێژووی کولتووری ئەورووپیدا بەخۆیان ڕەوا دیتووە. کاتێ دەڵێم فەیلەسووف لە ماوەی پێنسەد ساڵی ڕابردوودا ئەو ڕۆڵەی هەبووە دەمەوێ ئاماژە بۆ پرۆسەی "سێکولاریزم، واتە بە دنیاییبوون" بکەم، کە تیایدا کەنیسە لە دەوڵەت جوێکرایەوە. ئایین و سیاسەت دوو شتی جیاوازن، ئەمەش بە مانای ئەوەیە لە ژیانی سیاسەتدا بۆشایی و کەندرێ دروست بوو. سیاسەت زیاتر لە بواری ئیدارەکردن و "تەکنەلۆژیای کۆمەڵایەتی"دا، واتە لە چۆنیەتی چارەسەرکردنی کێشەکانی کۆمەڵدا وەك ئەوەی کێشەی تەکنیکی بن، سنووردار کرا. ئەمە لە کاتێکدا کە هەندێ کێشەو پرسیاری دی (کە ئەوانیش جۆرێکن لە کێشەی سیاسی) لە بابەتی ئەوەی ئایا ژیان چییە؟ بۆچی ئێمە هەین؟ ڕەوایەتی چییە؟ و پرسیاری لەم بابەتە لەلایەن تەکنیکییەکانەوە توانای وەڵام دانەوەیان نەبوو. ئیداریەکانیش، دەزگاکانیش بە هەمان شێوە لە ئاست وڵامدانەوەی ئەو جۆرە پرسیارانەدا دەستەوەستان بوون. ئەوان دەیانتوانی بڵێن یاخود ئامۆژگاریمان بکەن کە چۆن دەشێت کێشەیەك بە شێوازێکی کاریگەرانە چارەی بۆ بدۆزێتەوە، بەڵام نەیاندەتوانی وەڵامی شایان بۆ پرسیاری (چی لە کۆمەڵگا بکەین؟) بدۆزنەوە. ئەمەش ڕێك و ڕاست ئەو پرسیارە بوو کە پێشتر کەنیسە وڵامی بۆ دەدۆزییەوە.. چونکە بە ئاماژەکردن بۆ سەرووەریەکی باڵا

(واته بۆ خودا)، دەگوترا "کۆمەڵ بەشێکە لە هەرێمی خودا و بەشێ لەو شوێنەی کە جیهانبینی دینی تیا پیادە دەکرا". پرۆسەی سێکۆلاریزم توانی ئەمجۆرە وەڵامە ئامادانەی دین وەلاخات و لێرەیشەوە رۆڵی دین لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا کەم ببێتەوە. ئەنجامی ئەم گۆڕانکارییە بووە هۆی سەرهەڵدانی کۆمەڵێ مرۆڤ کە توانیان روونیبکەنەوە، مەبەست لەکۆمەڵگا چییە و کۆمەڵ چۆن کار دەکات. ئەمانە ئەو کەسانەن کە لە ماوەی پێنسەد ساڵی ڕابردوودا مانایەکی دیکەو ئەرکێکی تریان بۆ فەیلەسووف لە پێشچاوگرت. راستە پێشتر ئێمە فەیلەسووفی وەك ئەفلاتوون و ئەرستۆمان هەیە، بەڵام خاڵی سەرەکیش لای ئەوان بریتی بوو لە داڕشتنەوە و دووبارە سازدانەوەی مانا بۆ نۆرم و باوەڕەکان، چونکە ئەوانیش لەسەردەمێکدا دەژیان کە ژیانی کۆمەڵایەتی لە گۆڕانێکدا بوو. بەجێهێشتنی ڕابردوو، بەرنامە داڕشتن بۆ داهاتوو. ئەم گۆڕانەش ئەوانی خستبووە بەردەم پێداچوونەوەیەك بە سیستەمی کۆمەڵدا و دووبارە داڕشتنەوەی سیستەمێکی دی.. هەر چۆنێ بێ دەمەوێ بڵێم: تێگەیشتنی نوێ لە چەمکی فەیلەسووف پەیوەندی هەیە بەو دیاردانەوە کە پرۆسەی سکۆلاریزم هێنانیە گۆڕێ.

***ڕێبوار: ئەم تێگەیشتنە نوێیە هاوشانیشە بە گەشبینیەك لە ئاست مێژوو، دنیا و مرۆڤدا. بەلای کەمەوە زۆربەی فەیلەسووفەکانی سەردەمی ڕێنیسانس و پاشانیش سەردەمی ڕۆشنگەری، جگە لە (ڕۆسۆ) بڕوای تەواویان هەبوو بە پێشکەوتن و بەختەوەریی مرۆڤ. تۆ وێڕای ئەوەی بەردەوام جەخت لەسەر لایەنی رەخنەگرانەی فەلسەفە دەکەیتەوە، خۆیشت بە فەیلەسووفێکی گەشبین یان ئەگەر بمەوێ بە زمانی خۆت بدوێم، خۆت بە "دێوانەیەکی گەشبین" لەقەڵەم دەدەیت. ئایا لە سەردەمێکدا کە مرۆڤایەتی لەهەموو کاتێ زیاتر ڕۆحی شەڕانگیزانەی خۆی خستۆتە کار، فەیلەسووف دەتوانێ گەشبین بێ؟***

لارسن: بەڵێ دەتوانێ. چونکە من دەتوانم جیاوازی بکەم لە نێوان ئەو لێکدانەوەیەی جیهان وەك تراژیدیایەك دەخاتە ڕوو، (کە من بۆ خۆیشم بڕوام وایە جیهان تراژیدیایەکە)، لەگەڵ ژیانی خۆم و پاشانیش خودی خۆمدا. من خۆم بە بەشێك لەو

یەکە تراژیدییەی جیهان نازانم و بەشێ نیم لەو گۆڕەپانی مەرگەساتە. بەڵام مرۆڤ چۆن دەتوانێ بەم حاڵەوە بمێنێتەوە؟ بڕوام وایە مرۆڤ تەنیا ئەوکاتە دەتوانێ بۆ ئەوانی دی بەهایەکی هەبێ کە بتوانێ ڕێز لە خۆی بگرێ و بە ژیانی خۆی بەختیار بێ، چونکە تەنیا لەم بارەیەدا کە ئەو مرۆڤە توانای هەیە خۆی بۆ کێشە و قەیرانەکانی مرۆڤی دی تەرخان بکا و گرنگییان پێ بدا. ئەز هیچ مانایەك لەوەدا نابینم کە دەست هەڵگرین لەو بیرەی کە پێمان دەڵێ دەبێ جیهان بەرەو باشتر بگۆڕین. خۆبەدەستەوەدان نیشانەی بەستن و سڕبوونە..

***ڕێبوار: ئایا ئەمە ئەنجامێکی ئایدۆلۆژیانە نییە کە لە فەلسەفە وەریدەگرین؟ ڕابردووی فەلسەفە بریتیە لە زنجیرەی ئەو تراژیدیانەی فەیلەسووف لە بارەیانەوە تێدەفکرێ، لەکاتێکدا ئایدۆلۆژی بە وێناکردنی ئەو ئایندانەیە کە پڕن لە خۆشبەختی..***

لارسن: دەشێت لەو چوارچێوەیەدا ئەو ئەنجامە بە ئەنجامێکی ئایدۆلۆژی ناو بەرین، بەڵام لەبیرمان نەچێ کە تراژیدیا بابەتێکی دەرەکیە یاخود بابەتێکە بە پلەی یەکەم کار لە ڕەهەندی ماتەریاڵی شتەکان، پەیوەندییە کۆمەڵایەتی وسیاسییەکان دەکا، ئەگەر چی دەشێت ببێتە کێشەیەکی تایبەت بە خۆیشت و بەهەمان ڕاددەی وێرانکردنی دەرەوەت، ناوەوەیشت وێران بکا. بەڵام جیاوازی هەیە لەنێوان ئەوەی تۆ لە ئاست خودی خۆتدا کێیت، لەگەڵ ئەوەی تۆ لە بەرامبەر ئەویتردا کێیت. من لەو بڕوایەدام مرۆڤ دەتوانێ ئازادبێ ئەگەر چی لە زنجیریش کرابێ. ئەگەر خود لەناو خۆیدا، ئەگەر مرۆڤ لەبیر و مێشکی خۆیدا ئازادبێ و بڕوای بەخۆی هەبێ، ئەوە جۆرێکی دیکەی ئازادی هەیە کە بە (ئازادیی بوون) ناو دەبرێ و جیاوازە لە ئازادی سیاسی و هتد. نامەوێ ئەوە ڕەتبکەمەوە و بڵێم ئەمە ئایدیۆلۆژی نییە. چونکە ئەمە ئەو وێنایەیە کە شارستانیەتی ئەورووپی لەسەردەمی ڕۆشنگەرییەوە بۆی ماوەتەوە و لە بنەمادا بەندە لەسەر ئەو پرنسیپەی کە دەڵێ، لەڕێگەی چاککردن و ڕۆشنگەریی کۆمەڵگاوە ئیمکانی بەختەوەریی مرۆڤ و گۆڕینی دنیا دێتە ئاراوە. ئەم پرنسیپە هێندە تێکەڵ بە خوێنی ئێمە بووە کە بێ ڕامان بڕوامان پێی هەبێ و وەك حەقیقەتێك

تێی دەڕوانین. بڕوابوون بەبیری پێشکەوتن یان "بەرەو پێش چوون" بەشێکە لە پێکهاتە جەوهەرییەکانی بیرکردنەوەی ئێمە، ئەگەرچی ڕۆشنبیران گومان و کێشەیان لەسەر ئەم حەتمییەتە هەیە.

***ڕێبوار: واتە حەتمیەتێك هەیە کە حەتمیەتی "بەرەو پێشچوونە" و مرۆڤی ئەورووپی وەك بەشێك لە پێکهاتە و بیری خۆی لەسەر ژیان و بوون تەماشای دەکا، ئەوجا دەڵێی ڕۆشنبیران کێشەیان لەگەڵ ئەم حەتمیەتەدا هەیە، دەکرێ لەو کێشەیە بدوێی؟***

لارسن: کێشەی ڕۆشنبیران لە ئاست ئەو پێشمەرجانەدایە کە بۆ گەیشتن بە پێشکەوتن لە ئارادان. ئەم پێشمەرجانە بریتین لەوەی کە مرۆڤ لە هەمان کاتدا "بەرەو پێش دەڕوات" مەودای چالاکی و خواستەکانی سنووردار دەکرێ، دیسپلین دەکرێ و لە یاسا دادەماڵرێ. واتە کردەوەکانی لەلایەن دەورووبەرەوە، لە لایەن ئەو تەکنەلۆژیی دەسەڵات و هەلومەرجی کارکردنەوە کە هەیە، دەکەونە ژێر گوشارەوە. ئەمەش ڕەهەندی مرۆڤانەی، بەهای مرۆڤانەی کەم دەکاتەوە. کێشەکە لەسەر ئاستی "بەرەو پێش چوون" لەوەدایە، کە لە ئەورووپا مرۆڤ وا ڕاهێنراوە بەردەوام خەریکاتەوە (کەڵەکەبکا)، گورج و گۆڵ بێ و ئامادە بێ بۆ ساخکردنەوەی کەلوپەلەکانی و کردنەوەی بازاڕی نوێ. بەگەڕ خستنی ئەمەش بە مانای ئەوەیە کە ئێمە هەرگیز لە تێرکردنی خواست و پێویستیەکانمان ڕزگارمان نابێ: چونکە لەگەڵ تێرکردنی هەر پێویستییەکدا پێویستیەکی دی سەر هەڵدەدا. واتە ئێمە بەلایەکەوە زیاتر و زیاتر نیگەران دەبین، چونکە مەودای نێوان ئەوەی خەیاڵی لێدەکەینەوە و دەمانەوێ پێیبگەین، لەگەڵ ئەوەی بەڕاستی بەدەستی دەهێنین فراوانتر دەبێ. نیگەرانی مرۆڤ ئەنجامی شەڕی نێوان فەنتازیاکەی و ئەو واقیعەیە تیایدا دەژی. لەلایەکی تریشەوە واقیعێکە بەردەوام ئەو فەنتازیایانە بەرهەم دەهێنێ: ئێمە گەرەکمانە زیاترمان هەبێ، خێراتر دەوڵەمەندبین، گەورەتربین و باشتربین. چونکە ئەگەر زیاترمان نەبێ و خێراترنەبین و هتد، ئەوە کاتێ ئەوانی دی دێنە مەیدانەوە و زیاتر وەدەستدەهێنین و گەورەتردەبن و خێراتردەبن، ئەوا ئێمە بە (وەستاوی) یان

بە بێ جووڵە و لە شوێنی خۆماندا دەمێنینەوە. ئەمەش وەك ئەوە وایە بەرەو (دواوە) چۆبێتینەوە، هەنگاو بەرەو پاشەوە.. جا کەواتە لەو سیستەمە ئابوورییەدا (مەبەستم سەرمایەدارییە) کە هەڵمان بژاردووە پاڵنەرێکی دوولایەنە هەیە. ئەم سیستەمە ئابوورییە تەنیا ئەو کاتە بوونی خۆی دەسەلمێنێ کە بتوانێ سەرمایە کەڵەکە بکا، ئەگەر نا دادەڕمێ.

***ڕێبوار: دەڵێی: ئێمە ئەو سیستەمە ئابوورییەمان هەڵبژاردووە. مەبەست لە هەڵبژاردن چییە؟***

لارسن: تاکەکەس ئەو سیستەمەی هەڵنەبژاردووە. هۆی ئەوەی کە ئێمە توانیومانە بەردەوام لە فراوانکردن و پەلهاویشتن و کردنەو ەی بازاڕی نوێی جیهاندا بەردەوامبین ئەوەیە، ئەو ناکۆکیە دەروونیانەی ناو سەرمایە هێشتا پێنەگەیشتوون و لە ڕووبەرێکی بەرفراوانی جیهانی سێهەمدا چێنراون! بەڵام کاتێك دێ بەکێش دەکرێین و چیدی ناتوانین قەیرانەکانمان لە خۆمان دووربخەینەوە، یان دایانپۆشین. ئەو کاتەش ناچاردەبین سەرلەنوێ بیر لە چارەنووس و شێوازێکی دیکەی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا بکەینەوە.. ناتوانین ڕێگا بە خۆمان بدەین بە ناوی "پێشکەوتنەوە" بەهای مرۆڤ خۆی وەلاوەبخەین.

***ڕێبوار: لە وڵاتانی لای ئێمە هێشتا بە گەرمی باس لە ڕۆڵی ڕۆشنبیران و ڕادەی پەیوەندییان بە دەزگاکانەوە دەکرێ. کورتەی ئەو باسە دەڵێ: هەموو پەیوەندییەکی ڕۆشنبیر بە دەزگاکانەوە خیانەتێکە لە ڕۆڵی ڕۆشنبیرانە.. تۆ لەمبارەیەوە سەرنجت چییە؟***

لارسن: پێویستە بزانین ئەو دەزگایانە کامانەن؟ چونکە من هیچ نەنگییەك لەوەدا نابینم کە ڕۆشنبیرێکی ئەفریقی یان هەر نەتەوەیەکی دی ببێتە مامۆستای قوتابخانە، یان ئەندازیارێك یاخود کرێکارێکی هونەریی فەرمانگەیەك و لە بەهێزکردنی بنەما ماترییەکانی کۆمەڵگەکەیدا توانای بخاتە کار.. من یەکێ نیم لەو کەسانەی بڵێن: ڕۆشنبیران بەهەر نرخێ بێ پێویستە لە دەرەوە بمێننەوە و خۆیان تێکەڵ بەهیچ نەکەن.

***ڕێبوار: ڕۆشنبیری جیهانی سێهەم دەتوانێ چ چاوەڕوانیەکی لە ڕۆشنبیرانی خۆرئاوا هەبێ، بەتایبەتی ئەگەر مەسەلەی هەڵوێست وەرگرتن بێ لەئاست دیکتاتۆریەتدا؟***

لارسن: لە خۆرئاوا ئەزموونی ئەوە هەیە کە لە ئاست ڕژێمە دیکتاتۆریەکاندا دەمت داخەیت! و لەتەك هەندێ لایەنی ئایدیۆلۆژیانەدا تەبایی خۆت بپارێزی.. بۆ نموونە ئەمەمان لە ئەزموونی یەکێتی سۆڤیەت، کوبا، ڤێتنام و چیندا بینی کە دەهاتین ڕەخنەکانمان سەرکوتدەکردن و نەماندەخستنەڕوو، ئەگەرچی دەمانزانی لەهەر یەکێ لەو ڕژێمانەدا کێشەی گەورە هەیە. ئەمە دەکرا، چونکە ڕۆشنبیری ئەورووپی نەیدەویست ئەو وڵاتانە بخاتە بەردەم بارودۆخێکی ناخۆشتر. پاساوی ئەم بێدەنگییە بەوە دەدرایەوە، ئەگەر بهاتبا و ڕەخنەکان ئاشکرا بان، ئەوە لەلایەن بلۆکی خۆرئاواوە لە دژیان بەکاردەهات و ئەمەش دەبووە هۆی کەمکردنەوەی هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان. ئەمە تەنیا هاودەنگی و پشتیوانییەك بوو لەگەڵ ئایدیۆلۆژییەتی ئەو وڵاتانەدا نەك هاوکارییەك لەگەڵ ئاوتۆریتەی ڕژێمەکانیاندا. بەڵام ئەم پرۆژەیە تێکشکا: هەر لەساڵانی سییەوە کە ڕۆشنبیری ئەورووپی دەستی هەبوو لە ئۆردوگا زوزەملێیەکانی ستالین دا، تا پەنجاکان و شەستەکانیش کە هەمان ڕۆشنبیر، بە تایبەتی چەپەکان، چاوی خۆیان لەئاست ئەو نایەکسانیانەدا پۆشی کە لە یۆگۆسلاڤیادا هەبوون. ئەمە ئەو قۆناغەیە نابێ دووبارەببێتەوە. دەبێ ئێمە فێری ئەوە بین و توانای ڕەخنەگرتنیشمان لەو وڵاتانە هەبێ کە لەڕووی ئایدیۆلۆژی و کولتووری سیاسییەوە خۆشمان دەوێن. بۆ نموونە کاتێ فیدل کاسترۆ بۆ بەشداربوون لە کۆنگرەی نێونەتەوەیدا دێتە کۆبنهاگن و بەو شێوە بەرفراوانە پێشوازی لێ دەکرێ، ئەوەش دەهێنرێتەوە بیری کە بەندکراوە سیاسییەکانی کوبا شوێنی نارەزایەتی ئێمەن. ئەمەش شتێکە چەپەکان پێی دەڵێن نەك لایەنێکی دی: "کاسترۆ ئێمە تۆمان خۆش دەوێ، بەڵام لە فڵانە بواردا سیاسەتی تۆمان بەدڵ نییە و نامانەوێ چی دی بەو جۆرە بەردەوام بیت". ئەمە ئەو لایەنەی کولتووری ڕەخنەیە کە دەبێ فێری بین و چی دی ڕێگە بە خۆمان نەدەین لەبەر تەبایی ئایدیۆلۆژی کارکردی ڕەخنە وەلاخەین.

***ڕێبوار: شتێکی دیکەی سەرقاڵکەر بەلای ڕۆشنبیری لای ئێمەوە بریتیە لە هەڵوێست لە ئاست تەقلیدیەت و نەریتەکانیدا. چۆن پەیوەندیمان لەگەڵ تەقلیددا دەستنیشان بکەین؟***

لارسن: هەندێ نەریت هەن شایانی پەیوەندی پێوەکردن و بەرگری لێکردنی زیاترن لەهەندێکی دی، بۆ نموونە ئەگەر ناسیۆنالیزم خۆبەکوشتدان بێ لەپێناوی دەوڵەتی نەتەوەییدا، ئەوە بەرگریکردن لێی لە کارێکی شێتانە زیاتر نییە. ئەمە لە کاتێکدا بەرگریکردن لە کولتووری نەتەوەیی، کە ڕۆژانە لەلایەن هەر یەکێك لە ئەندامانی ئەو نەتەوەیەوە کاری پێدەکرێ ، پەیڕەوی لێدەکرێ و دەوڵەمەند دەکرێ، کارێکی پڕ مانا و شایانە، جا ئەو بەرگریکردنە فەیلەسووفێ بیکا یان هەر ڕۆشنبیرێکی دی.. شێوازی ئەم بەرگریکردنە بریتیە لە ڕۆچوون و قووڵبوونەوە بە کولتووری خۆماڵی، زمان و هەڵسوکەوتی ڕۆژانەدا و شارەزایی پەیدا کردن لە مێژووی مۆسیقا، هونەر و کەلەپووردا و لەو ڕێگەیەشەوە پەیوەندی بەستن پێیەوە.

***ڕێبوار: ئایا ئەم پەیوەندی پێوەبەستنە بەمانای خۆ بەدەستەوەدان دێ یاخود مانایەکی دیکە؟!***

لارسن: بە هیچ شێوەیەك بەمانای خۆبەدەستەوەدان نییە، بەڵکو وەك گوتم جۆرێ لە ڕۆچوونە، جۆرێ لە پەیوەندیکردنە بە خودەوە. چونکە ئەوەی کرۆکی تەقلید و نەریتەکانی پێکدەهێنێ، هەمان ئەو شتەیە کە لە ڕێگەی پەروەردەی کۆمەڵایەتی و خێزانی و هتدەوە وەرمان گرتووە. بۆیە ئەو پەیوەندیکردنە دەتوانێ تەنیا مانای پەیوەندیکردن بەخۆمانەوە بدات. ئەوەی نەزانێ لە کوێوە هاتووە، ناشزانێ بۆ کوێ دەچێ.

***ڕێبوار: کەواتە سنوورێکی جیاکەرەوەی ڕەها لە نێوان تەقلید و ئێستادا نییە.***

لارسن : ئەو سنوورە بەلای منەوە نییە، ئەگەر هەشبێ زۆر لاوازە. بێگومان هەندێ شت لە تەقلید و کەلەپووردا هەیە نامێنێ و وون دەبێ، مەبەستم ئەوەیە کە بڵێم لەماوەی جیاوازدا گرنگیی ئەوتۆیان پێنادرێ و لەناو دەچن. لە پازدە ساڵی ڕابردووەوە تا ئێستا لە خۆرئاوا گرنگییەکی زیاتر بە ئایین دەدرێ. هەندێ ئەمە

بەوە دەبەستنەوە کە کۆمەڵگاکانی ئەورووپی بەرەو کۆمەڵگای فرەنەتەوەیی دەڕۆن، هەر بۆیەشە شتەکان وەکو جاران ناچاریانە و حەتمی نین.. ئەمەش پرسیاری خۆی دروست دەکا، بۆ نموونە پرسیار لە خۆمان دەکەین: مەسیحی بوون چییە؟ زۆر لە ئەورووپاییەکان خۆیان بە مەسیحی دەزانن، بەڵام بە شێوەیەکی دروست نازانن بۆچی؟ ئەم پرسیارەش بەر لە ئێستا بەم شێوە قووڵە نەدەکرا، هۆکەیشی ئەوە بوو کە گرووپێکی دیکەی ئاینی جیاواز نەبوون تا تێڕوانینێکی تر لەسەر شتەکان دەربڕن. هەر بۆیەشە زۆرن ئەو قەشە دانیمارکیانەی کە بە خۆشحاڵیەوە دەڵێن: باشبوو خەڵکانی سەر بە ئاینەکانی دیکە هاتنە وڵاتەکەمانەوە، چونکە ئەمە بووە هۆی وریا کردنەوەی دانیمارکییەکان و هاندانیان بۆ گەڕان بە دووی ئەو بەهایانەدا کە مەسیحی بوون و بڕواداریەکەیان دەسەلمێنێ.

***ڕێبوار: لەو بڕوایەدای ئەورووپاییەکان بتوانن واز لەو بیرە بهێنن کە دەڵێ "ئەورووپا چەقی گەردوونە"؟***

لارسن: ئێمە لە خۆرئاوا زۆر کەم گرنگی بە کولتووری بێگانەکان دەدەین و لەسەر ئەوە ڕاهاتووین لەسەر شێوەی "ئەورووپا ناوەندی" بیربکەینەوە. ئەمەش بەمانای ئەوەیە لە خۆرئاوا بە چاوێکی نزم تەماشای کولتوورەکانی دیکە دەکەین و پێمانوایە ئەو کولتوورانە *چەوتە* کولتوورن! ئەمەش بیرێکە لەمێژە دامەزراوە، بنەماکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دەمەی وادەزانرا ئەورووپا چەقی جیهانە. ئەم بیرە بووە هۆی سەرهەڵدانی کۆلۆنیالیزم و سەمپاشیکردنی "کولتووری ئەورووپی" بە جیهاندا. بەڵام لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا ژیان لەگەڵ ئەو جۆرە بیرکردنەوەیەدا کارێکی تا بڵێی پڕ مەترسییە، چونکە لە ڕووی پراکتیکییەوە چیدی ناتوانین وەهای پیشاندەین کە شتێکی هاوبەش لەگەڵ خەڵکی شوێنەکانی دیکەی جیهاندا کۆمان ناکاتەوە، لەبەر ئەوەی لێمانەوە دوورن! ئەمڕۆ ئێمە لەناو یەکتردا دەژین و پێویستە وەك ئەورووپی لەمەوە فێربین. مەبەستم ئەوە نییە کە ببینە هێندۆیی، بودیست و موسڵمان و هتد. فێربوون ئەرکی هەردوو لایە، بەڵام دەبێ بەلای ئەورووپاییەکەوە ئەو فێربوونە ساناتربێ وەك بەلای جیهانی سێهەمییەکەوە. بۆچی؟ چەنکە جیهانی سێهەم هەرگیز

هەڵنەستاوە بەداگیرکردنی جیهانی یەکەم و کۆلۆنیکردنی! من لە ساڵێکدا لە دایکبووم کە هێشتا هیندستان کۆلۆنی بوو، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو وڵاتانە بیرەوەرییەکی زیندوویان لە بارەی چەمکی داگیرکردن و کۆلۆنیالیزمەوە هەیە و لێرەیشەوە گەمانێکی زیاتر لە ئاست چەمکی *ئەوروپا*دا، بەڵام ئەوروپاییەکان ئەو بیرەوەریانەیان نییە کە ڕایانگرێ لەبەردەم فێربوون لە ئەویترەوە و هەڵیانسڵمێنێتەوە.

***ڕێبوار: ئایا ئەمە وەك هەوڵدانێك بۆ سازدانی گفتوگۆی ئەوروپاییەکان لەگەڵ ئەویتردا دەخرێتە ڕوو کە پێشتر لە ئارادا نەبووە؟***

لارسن: بەڵێ.

***ڕێبوار: بەڵام ئەم گفتوگۆیە پێویستی بە ڕۆچوونێکی ڕەخنەگرانەی ئەوروپا هەیە بەخۆیدا و ئەمەش پرۆسەیەکە لە زۆر شوێن ڕووبەڕووی تاوانباریی زۆر دەبێتەوە. بۆ نموونە پرۆژەی نووسەری سویدی (سڤێن لیندکڤیست) یەکێکە لەو پرۆژە ئەوروپیانەی کە ڕەخنەگرانە لیدی شارستانیەتی ئەوروپی لە ئاست ئەویتردا دەخوێنێتەوە، بەڵام هەمان کاتیشدا یەکێکە لەو پرۆژانەی ناڕەوایانە تاوانبار دەکرێ بەوەی گوایە مەرایی بۆ ئیسلام دەکا و تەنانەت کتێبی (شەیتانەکان پاکبکەنەوە)(**) بە دۆکیۆمەنتێکی دژ بە ئەوروپا لەقەڵەمدراوە. ئایا ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە ئەوروپا ئامادە نییە بەشێوەیەکی ڕادیکاڵ ڕەخنە لەخۆی بگرێ؟***

لارسن: هەڵوێستی ئەوروپا لە بەرامبەر جیهانی سێهەمدا پڕە لە بیروڕای دژ بەیەك. لە ڕاستیدا هەڵوێستێکی ناکۆکی ئاژاواچیانەیە و لەسەر بنەمای چەندین ئەفسانەوە دامەزراوە. بەڵام لە هەمان کاتیشدا ئەو باشیەی تێدایە کە خاوەنی ئیرادەیەکە بۆ دۆزینەوەی ڕێگا چارەی نوێی کێشەکان. بۆچی کتێبەکەی (لیندکڤیست) دەبێتە هۆی تووڕەیی؟ هۆکەی ئەوەیە کۆمەڵە کەسانێك هەن بەشێوەیەکی خۆ بەخۆ وا بیردەکەنەوە کە کولتووری ئەوروپی چ عەیبێکی نییە و عەیبەکە لە کولتوورەکانی تردایە. دیارە ئەمەش بیروڕایەکی چەوتە. لەلایەکی تریشەوە کەسانێك هەن پێیان وایە پێویستە لە ڕێگەی ڕێکخراوە سەربەخۆکانەوە گیانی هاوکاری پتەوبکرێ

چاکترە، نەك بەهۆی گەڕانەوە بۆ بیرەوەرییە کولتوورییەکان کە پڕن لە ڕووداوی چەوت و تاڵ..

***ڕێبوار: وا هەستناکەی هۆی سەرەکی ئەوە بێت کە ئەورووپا ئاستێکی بۆ ڕەخنەگرتن لە خۆی لەبەر چاو گرتبێ، و دەرچوون لەو ئاستە لەپێشچاوگیراوە، یان ڕێگە پێدراوە دووچاری ئەو تاوانبارکردنە توندڕەوانەیە بکرێ، کە لە نموونەی پرۆژەی ناو براودا بینیمان؟!***

لارسن : لەوانەیە..

***ڕێبوار: ئەمەش مەترسیەکە لەئاست ئەو دیالۆژەدا کە تۆ باستکرد..***

لارسن: بەڵام چەندین سەرچاوە هەیە کە ڕەخنە لە پرۆژەی ئیمپریالیزم دەگرێ و هیچ تووڕەوبوونێ ناخاتەوە.. پێموایە تەقینەوە بەرووی پرۆژەی ناوبراودا زیاتر لەبەر ئەوەیە کە پەردە لەسەر فەوزایەك هەڵدەداتەوە: پەردە هەڵدانەوە لەسەر ئەو کەسایەتیە کولتووری و فکری و فەلسەفیانەی ئەورووپا، کە لە ڕواڵەتدا ناسراون بە هاودەنگی و هاوخەمی لەگەڵ مرۆڤەکانی تری جیهاندا و لەواقیعیشدا مەبەستیان ئەوە بووە یاخود بەشداربوون لە چەوساندنەوە و ژێر چەپۆك نانیاندا.. ئەوجا پەردە هەڵدانەوە لەسەر ئەم لایەنەی کولتووری ئەورووپی، کە ئەورووپییەکان بە شوێن شانازی خۆیانی دەزانن، دەبێتە هۆی نواندنی پەرچەکردارێکی دەروونی و تووڕەبوون.

***ڕێبوار: نواندنی ئەو پەرچەکردارە دەروونیە شوێنی تێگەیشتنە، بەڵام ئەگەر ئەمە ڕێگر بێت لەبەردەم پرۆژەیەکی ڕادیکاڵانەی ڕەخنە گرتنی ئەورووپا لە خۆی، شتێکی پڕ مەترسییە.***

لارسن: گومان لەمەدا نییە.

***ڕێبوار: دوو پرسیاری کۆتایی ئەم گفتوگۆیە زیاتر پەیوەندیان بە پرۆژەی خۆتەوە هەیە. حەز دەکەم بەکورتی پێناسەیەکی پۆست مۆدێرنیتە بکەیت و ڕای خۆت لەمەڕ ئەم بزوتنەوەیەوە دەربڕی.***

لارسن: پوست مۆدێرنیتە دروشمە زاراوەیەکی ئایدیۆلۆژییە، کە ئەرکی سەرەکی ئاگادارکردنەوەی تاکەکەسە لەخودی خۆی و کێشەکانی. لەمێژووی کولتووری

ئەورووپادا، مۆدێرنیتە تەمەنێکی دوور و درێژی هەیە، جا ئەگەر هاتبا و پۆست مۆدێرنیستەکان خۆیان بە مۆدێرنیست لەقەڵەم دابا، ئەوە دەبوونە مشتی نموونەی خەرواریّ! بۆیە لە زاراوەی (پۆست مۆدێرنیتە)دا جۆریّ لە عەقڵی ڕاگەیاندن "میدیا" بەکار هاتووە. بەڵام لەناوەڕۆکی وشەکەدا لێکدانەوەیەکی قووڵتر هەیە کە دەڵیّ: ئەو بیروڕا و وێنایانەی (وەك پێشکەوتن، گەشەسەندن، ڕۆشنگەری و عەقڵانیەت) کە مۆدێرنیتە لە سەریانەوە دروست ببوو، هەموویان خەیاڵپڵاو و چاوبەست بوون و سەردەمی ئێستا سەردەمی دوای خەیاڵات و دوای چاوبەستە. (دوای، پۆست خەیاڵات) بەمانای ئەوەیە کە ئێستیّ دەتوانریّ بیر لە جیهان بکرێتەوە بەبیّ ئەوەی تێبینی پرنسیپی ئایدیۆلۆژی و "حەکایەتە مەزنەکان" بکریّ، یاخود ئەو بیرکردنەوەیە لایەنگیریکردنی کۆمۆنیزم و هەڵوێست وەرگرتن بیّ لەبەرامبەر کاپیتالیزمدا.. ئەمەش بەبڕوای من شتێکە دەتوانریّ لە بواری قسەکردن لەمەڕ ڕەهەندە مۆدێرنەکانی هونەر و فەلسەفەدا سوودی لیّ وەربگیریّ کە بە شێوەیەکی چڕ پێی دەگوتریّ هەڵوەشاندنەوەگەرایی (*Dekonstrotivism*). بەڵام ئەم بابەتە هێندەش نویّ نییە کە پۆست مۆدێرنیستەکان دەیانەویّ پێشانی بدەن: لەمێژوودا چەندین بزوتنەوەمان هەیە کە ئەرکیان هەڵوەشاندنەوەی بارودۆخە ئارامەکان بووە و سەر لەنویّ داڕشتنەوەیان. دیارە ئەمەش سەبارەت بە کولتوور و شارستانیەت گرنگیەکی تایبەتی هەیە کە خەڵکانێك پەیدا دەبن و هەڵدەستن بەو جۆرە هەڵوەشاندنەوە و پاڵاوتنانە. بەڵام پۆست مۆدێرنیتە ئەو (بارودۆخە) نییە کە لە پاش مۆدێرنیتە دێت یان مۆدێرنیتە خانەنشین دەکا.. هەر بۆیەشە زۆرکەس لە پاشەملە بە پۆست مۆدێرنیستەکان دەڵێن: (مۆدێرنە درەنگ هاتووەکان)!

***ڕێبوار: پەیوەندی خۆت لەگەڵ ئەو مۆدێرنە درەنگهاتووانە چۆن دیاری دەکەی؟***

لارسن: من ئەو بۆچوونە لەو ڕووەوە پەسەنددەکەم و پشتگیری لێدەکەم، چونکە بە ئۆرگانیزمێکی نێو کولتوورێکی زیندووی دەزانم، پێویستیمان بەوە هەیە هەمیشە کەسانێك هەبن شتە تەواو پێچەوانەکان، پێچەوانەی ئەوەی چاوەڕێدەکریّ، دەربڕن بۆ ئەوەی ناچارمان بکەن بەڵگەی باشتر لەسەر هەڵوێست و بیروڕایەکانمان بخەینە

ڕوو. ئەگەر پۆست مۆدێرنەکان دەڵێن خودا مردووە، مرۆڤ مردووە، حەکایەتە مەزنەکان مردوون، ئەوە من ناچار دەبم بە بەڵگەوە هەوڵی سەلماندنی ئەوە بدەم کە بۆچی خودا نەمردووە، بۆچی مرۆڤ نەمردووە، بۆچی حەکایەتە مەزنەکان نەمردوون؟ واتە دەبێ بکەومە گفتوگۆوە و سەرنجە فیکرییەکانم دەوڵەمەندتر بکەم و لەڕێگەی وەڕووخستنی بەڵگەوە ڕێ لە خۆبەدەستەوەدان بگرم. جا کەواتە پۆست مۆدێرنیتە بەرەو دیالۆژمان دەبا، هەر بۆیەشە شتێکی ڕاست نییە مرۆڤ سوور بێ لەسەر ئەو لەخۆڕازیبوونانەی گشت کولتووری بەبێ تێرامان شانازییان پێوە دەکا و وەك لێفەیەك دەیاندا بەسەر خۆیدا. چێژی پۆست مۆدێرن لەوەدایە کە دەڵێت: وانییە کە دەزانرا و شتەکان بەو جۆرە نین کە بیریان لێدەکرایەوە. بەڵام لە بیرمان نەچێ خودی پۆست مۆدێرنیستەکان ئەم جۆرە پێناسەیە لەسەر خۆیان پەسەند ناکەن، چونکە بە جۆرێ لە باڵبەستکردنی خۆیانی دەزانن.

***ڕێبوار: تۆ لەگەڵ (هابرماس)یشدا خەریکی پڕۆژەیەکیت، ئایا دەکرێ تیشکێ بخەیتە سەر ئەم پڕۆژەیە و شێوازی هاوکاریتان؟***

لارسن: من و هابرماس هەردووکمان گرنگی بە فەلسەفەی مافەکان دەدەین: ئەوە چییە کە لەدوا ئەنجامدا ڕوونیدەکاتەوە ڕەوایەتی چییە؟ هەموو سیستەمێکی سیاسی و سیستەمێکی کۆمەڵایەتی خاوەنی ئەم پێشنووسانەیە (یاساکان)، کە پێمان دەڵێن پێویستە بە چ شێوەیەك خۆمان ڕاست بکەینەوە و هەڵسوکەوت بکەین. ئەمەش ئەو شتەیە کە ڕەوایەتی کۆمەڵ دەسازێنێ. بەڵام یاساکان هەموو کات ڕەوا نین و بۆمان هەیە هەندێ یاسای ناڕەوا بهێنینە پێشچاوی خۆمان، ئەمەش ئەرکێکی فەلسەفیە کە لە ڕەوایەتی و ناڕەوایەتی یاسایەك بکۆڵێتەوە. یاساکان هەمیشە لە سەردەمێکی دیاریکراوی کۆمەڵگەیەکی تایبەتدا ڕەوان، بۆیە کاتێ ئێمە لە یاساکان دەکۆڵینەوە، دەبێ بە ناچاری بیر لەو پێشمەرجانە بکەینەوە کە لەو کۆمەڵگایەدا دەبنە هۆی ڕەوایەتی بەخشین بەو یاسایانە. ئێمە ناتوانین هەر لە سەرەتاوە بڵێین مادام پێشنووسەکان وا دەڵێن، دەبێ وا بکرێ دەنا سەرمان دەپەڕێنرێ! ئەمە تێگەیشتنێکی بەربەریانەیە لە مافەکان. بۆیە پێویستە بکەوینە توێژینەوە لەوەی

چۆن ئەم کۆمەڵگایە لەسەر یاساکانیەوە دامەزراوە؟ ئایا حسێبی تەواوی ورد کراوە بۆ پاراستنی هاوڵاتیان؟ ئایا یاساکان بەپێی خواستی خەڵکان داندراون تابتوانرێ ئەو خەڵکە خۆشیان بەرپرسیار بکرێن لە جێبەجێکردنیاندا و هتد.. ئەمە ئەو پرۆژە هاوبەشەی ئێمەیە.

- سوپاس بۆ ئەم گفتوگۆیە.

## پەراوێزەکان

● "*کۆنگرەی جیهانیی بۆ چارەسەرکردنی کێشەی هەژاری*" کۆنگرەیەك بوو لە ناوەڕاستی شوبات/ فەبریوەری ١٩٩٥دا بەسەرپەرشتی ڕێکخراوی نەتەوە یەککگرتووەکان لە کۆپنهاگن بەسترا.

● ● *.Seven Lindqvist: " Utrota varenda javel" 1992.*

## لەبارەی (میخائیل لارسن)ـەوە:

- ١٩٤٧ لە دایك بووە.
- خوێندنی مێژووی هزر، کۆمەڵناسی و زانستی پەروەردەی لە دانیمارك، ئەڵمانیا (فرانکفۆرت و بەرلین) و وڵاتەیەککگرتووەکان تەواو کردووە.
- ساڵی ١٩٧٣ دکتۆرای فەلسەفەی لە مێژووی هزردا وەرگرتووە.
- لە ساڵی ١٩٧٦وە سەرپەرشتی توێژینەوەی جۆر بە جۆری لەم شوێنانەدا کردووە (School Education) و (Histry Department) لە بێلاکلی (Philophiscem Seminar) لە فرانکفۆرت. ئێستاش لە زانستگەی (غوسکیلە) لە دانمارك بابەتی تیۆرەی زانست، کۆمەڵناسی، زانستی پەروەردە و ئاڵوگۆڕکردن دەڵێتەوە و لەگەڵ فەیلەسووفی ئەڵمانی (یۆرگن هابرماس) دا کار لە پرۆژەیەکی فەلسەفیدا دەکا.

## گرنگترین بەرهەمی چاپکراوی:

- *ڕەخنە لە پەروەردەی ڕادیکالیزمی کولتووری (١٩٧٤)*
- *لە بارەی زانستە مرۆڤایەتیەکان و هۆمانیستەکانەوە (١٩٧٩).*
- *پتر مرۆڤانە (١٩٧٩).*
- *بیری ئازاد (١٩٨١).*
- *مافی مرۆڤ (١٩٨٣).*
- *مێژووی ئایدیای فەلسەفەی مافەکان (١٩٩٤).*

لەگەڵ بەرهەمی نووسراو و وەرگێردراوی دیکە لەمەڕ فەلسەفە، جوانیناسی و دەروونناسییەوە کە بەزمانی جۆربەجۆر نووسراون.

# عەقڵی مۆدێرن و کۆمەڵگای کوردی

**وتووێژی: عەبدولخالق یعقووبی،**

**بۆکان، هاوینی ۲۰۰۳**

{گوماندارى و يەقينباوەڕى. پەيوەنديمان بە نەريتەكان و ڕابردووەوە. چييەتى مۆديرنبوونى ڕۆشنبيرى كورد. لەتوپەتى ناسنامەى كوردبوون. لە كەڵەكەكردنى مەعريفەوە بۆ بيركردنەوەى مەعريفيانە. ***دنياى شتەبچووكەكان***، ***كتێبى نالى*** و هەڵوێست لە لێكدانەوەى تەقليدى بۆ شيعر. نالى و شوناس، نالى و زمان و نالى و ئەوانيتر}.

*يەعقووبى: پێمخۆشە وەك پرسيارى يەكەم هەندێك لەو كەڵكەڵانەى كە پێم وايە نەك هەر بۆمن بەڵكو سەرجەم بۆ كۆمەڵگاى كوردى و مرۆڤى كورد بەنسبەتى لەگەڵ جيهانى مۆدێرنى ئەمڕۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ كێشەكانى لەئارادايە، دەستپێبكەم. ئێمەى كورد وەك مرۆڤێكى ڕۆژهەڵاتى بەدرێژايى مێژوو، بەساتەوەختى ئێستاشەوە جۆرە شەرمێكمان لە گومانكردن (شك) كردووە كەرێگاى پێنەداوين بەردەوام بەردى گومان و درڕۆنگى بخەينە گۆمى مەندى حەقيقەتە زاڵە باڵادەستەكانەوە، ئەو حەقيقەتانەى كە زۆرتريان ساختەى دەستێكى باوكانە بوون. لەشێوە تێڕوانينى ئێمەى ڕۆژهەڵاتيدا ڕەسەنايەتى دراوە بەلايەنى نەگۆڕى و مەندبوونى دياردەكان و ئەم تێڕوانينە بەجۆرێك لەجۆرەكان حاشاكردن بووە لە بزاڤ و گەڕيان و گۆڕانكارى،*

*کەچی لەڕۆژئاواو لەفیکری مرۆڤی ڕۆژئاواییو بەتایبەت لەدوای قۆناغی ڕۆشنگەری ئەوەی ڕەسەنە، زمانو حەرەکەت و گۆڕانە. واتە بەلەعنەتکردنی راوەستانو مەندی. بەڕاستی دەبێ چی بێ ئەو هۆکارانەی کە دوو ڕێگای نەك هەر جیاواز بەڵکو دژوازیشی خستە بەردەم ئەو دوو جەمسەرە فیکرییە. کامانەن ئەو دەلیلانەی کە ڕۆژئاوای گەیاندە بەردەم شۆڕشی فەرەنساو شۆڕشی پیشەکاریو جیهانی مۆدێرنو کۆمەڵگای مەدەنیو چەمکی لیبرالیسمو رەفتاری دیموکراتیکو گوندی جیهانی کە چی ئێمەی پاڵ پێوەنا بەرەو توندو تیژی ئایینیو حکومەتی تۆتالیتاریو کۆمەڵگای عەشیرەتیو خوخدەی دیوەخانو...هتد..؟*

سیوەیلی: خۆ بەدوورگرتن لە گوماندراری خەسڵەتی ئەو کۆمەڵگایانە و لەگەڵیشیدا خەسڵەتی ئەو مرۆڤانەیە کە بێ متمانەن بەخۆیان. بێ متمانەیی، مرۆڤ و شارستانییەتێك بەرهەمدەهێنێ کە خۆی لە شك، لەگومانکردن، لە دوو دڵی بەدوور دەگرێ. ئێمە لێمان تێك نەچێ مرۆڤێك کە بڕوای بە یەقین هەیە مرۆڤێکیشە کە لە هەمان کاتدا بێ بڕوایە بە پێگەی شارستانیو ڕۆڵی خۆی لەناو ئەو کۆمەڵگایەدا کەتێیدا دەژی. ئەو مرۆڤە هەمیشە بە دووی پشتیوانێکی نەگۆڕدا دەگەڕێ کە ئەو بتوانێ لەسایەیدا بەو ئارامییە بگات کە پێویستی پێیەتی، بۆ ئەوەی خۆی بە دوور بگرێ لە هەموو گۆڕانکاریەکو خۆی بەدوور بگرێ لە هەموو بزاڤێك کەئەو بەرەو قۆناغێکی دیکە دەبات یا گۆڕانێك لەودا دروست دەکا.

بە پێچەوانەوە مرۆڤی گوماندار مرۆڤێکی بێ ئۆقرەیە، لەبەر ئەوەی کە مرۆڤێکە پرسیاری هەیە، مرۆڤێکیش کە پرسیاری هەیە، دونیا وەك ئەوەی کە هەیە قەبووڵ ناکا، بەڵکو هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدایە جیهانی دەوروبەری و بۆخۆشی بگاتە ئەو جیهانەی کە ئەو پێویستی پێیەتی، بیکاتە ئەو جیهانەی کە بەهای ئەو وەك مرۆڤێك تێیدا پارێزراوە. ئالێرەوە تەماشا دەکەین مێژووی گوماندراران مێژوویەکە پڕ لە دەردەسەری، مێژوویەکە پڕ لە چەوسانەوە، مێژوویەکە پڕ لە تۆمەت بارکردن و لەهەمان کاتیشدا مێژوویەکە پڕ لەداهێنان. لەکاتێکدا مێژووی یەقینباوەڕان و یەقینکاران مێژوویەکە پڕ لەدڵنیایی و زۆر جار پڕ لەئارامییەکی گێلانە و مێژوویەکە

لەناکۆکی بەدەرە، لەکاتێکدا لەپرسیار خاڵییە. بەدیوێکی تردا مێژووی خەڵکانی گوماندار و شارستانیەتە گوماندارەکان، مێژوویەکە کە هەمیشە پرسیارکردن داینەمۆ و وزەی خۆتازەکردنەوەی مرۆڤ و کۆمەڵگایە. بەدبەختانە ئێمە لەناو ژیارێکدا چاو هەڵدێنین کە زیاتر لەوەی پرسیار هەژێن بێت پرسیار کوژە. قەدەری ئێمە وەك مرۆڤی ئەم دەڤەرە بەوە دەستنیشانکراوە کە لە کۆمەڵگایەکدا بین بەر لەوەی لەدایك ببین هەموو ئەو ڕێچکە ژیانەی ئەو قۆناغەی دەبێ پێیدا تێپەڕین لە پێش ئێمەوە، بە پێی کۆمەڵێك یاسای نووسراوو نەنووسراو، دەستنیشان کراوە. تەنها ڕێگایەك لەبەردەمی ئێمەدا ماوەتەوە ئەوەیە کە بەباشترین شێوەی مومکین بۆ ئەو کولتوورەی ئێمە تێیدا پەروەردە بووین‌و لەسەر ئاستی چاوەڕوانییەکانی ئەو کۆمەڵگایەی تێیدا دەژین، بتوانین ئەو یاسایانە (نووسراو نەنووسراو) پراکتیك بکەین بۆ ئەوەی بتوانین ئەو دڵنیاییەش بەدەست بێنین کە کۆمەڵگا خۆی پێمان نەبەخشێ. بێگومان ئەوە کێشەی زۆری بۆ مرۆڤی دەڤەری ئێمە دروست کردووە. کە مرۆڤێکە لە بونیادی کاراکتەری خۆیدا یەقین دەچێندرێ لە میانەی پرۆسەیەکەوە کە ئێمە هەم دەتوانین بە پرۆسەیەکی شارستانی ناوببەین، لەبەر ئەوەی کە ئێرە کانگای سەرهەڵدانی ئایینە یەقین خوازەکانەو هەم دەتوانین بە پرۆسەیەکی کۆمەڵایەتیشی ناوبەرین کە مرۆڤ تێیدا وەك تاکە کەس بەو شێوەیە پەروەردە دەکرێ کە هەمیشە پرسیارەکانی خۆی وەدوا بخاو هەمیشە دەست لە حەزە هەنووکەیی‌و ئێستاییەکانی خۆی هەڵبگرێ‌و هەمیشە لە چاوەڕوانی زەمەنێك دابێ کە بەهەرحاڵ لەو زەمەنەدا ئەو وەکو جەستە بوونی نییە، وەکو رووح بوونی نییە. تەنیا زەمەنێکی خەیاڵ کراوە، تەنیا زەمەنێکە کە تێیدا مژدەیەکی پێ بەخشراوە بەڵام نە مژدەبەخش دیارەو نە ئەو مرۆڤانەش کە ئەو مژدەیەیان وەرگرتووە. ئێمە لەبەینی ئەم دوو ئاراستەیەدا قەدەرێکی یەقینگەراو پرسیارکوژ، قەدەرێکی لەهەمان کاتدا فەردانییەت کوژ دەستنیشانی ڕێچکەی ژیانمانی کردووەو پێموایە هەر ئەوەش بۆتە هۆی وەدواکەوتن‌و بەدڵگرتنی ترس لەهەموو جۆر مۆدێرن بوونێك، لە هەموو شێوازێکی

مۆدێرنیزانسیۆن، ئەمەش هەم لە کایەزانستییەکانمانداو هەم لە کاراکتەری شەخسیماندا رەنگیداوەتەوە.

ئێمە هەردەم بەپێی ئەو بونیاد و پێکهاتە زەینییە، جۆرێك مامەڵە لەگەڵ دنیای دەوروبەریشماندا دەکەین کە دیسانەوە پێداگرتنە لەسەر یەقینخوازی و خۆ بەدوور گرتنە لەو گوماندارییە. لەراستیدا مرۆڤی ئەم دەڤەرەی ئێمە، مرۆڤێکی وایە کە بەدوای ***سەپرایز*** و ئەوەی کە پێی دەڵێن ***موفاجەئە***دا ناگەڕێ. ئەو شتەکان پێشتر دەزانێ و پێشتر شتەکانی پێ تەڵقین کراوە. ئەم جۆرە مرۆڤە چاوەڕێی گۆڕانی وای لێناکرێ، یاخود دەتوانین بڵێین گۆڕان لەو جۆرە کۆمەڵگایانەدا نابێتە بزوتنەوەیەکی هەمەلایەنە. هەر بۆیەشە تازەگەرەکان لەو کۆمەڵگایانەدا هەمیشە مرۆڤی بە پەراوێزکراوو هەمیشە ئەو تاکە کەسانەن کە بە چاوێکی نامۆ تەماشایان ئەکرێ. لەبیریشمان بێت خەسڵەتی گومانکاران و خەسڵەتی بێگانەکان لەیەکەوە نزیکە: گومانکارەکان لەهەمان کاتدا بێگانەشن، بێگانەکان لەهەمان کاتیشدا ئەوانەن کە لە دەرەوە هاتوون، بە میعیار و پێوەری تر دەڕواننە پێوەرەکانی ئەو شوێنەی تێیدا دەژین، هەر بۆیەشە بەچاوێکی تایبەتیش تەماشایان دەکرێ. ئێمە ئەگەر بڕوانینە بۆ نمونە بزووتنەوەیەکی وەکو (سۆفیستەکان)ی یۆنان بەوردی ئەو کێشە فکرییەمان بۆ دەردەکەوێ کە ئەوان لە کۆمەڵگای یۆنانیدا بەجۆرێك لەپەراوێزدا بوون، ئەمە وێڕای ئەوەی هەڵگری پرۆژەیەکی گەورەی هیومانیستانەش بوون و لەهەمان کاتیشدا لەناو مێژوودا پەراوێز دەکرێن.. دەتوانم بڵێم ئەو چارەنووسە، چارەنووسی هەموو کەسێکە، کە دەیهەوێ پرسیار بکا، هەموو کەسێك کە لەگۆمی یەقینەوە دەیهەوێ بچێتە ناو دەریای پرسیارکردن. پرسیار بۆخۆی جۆرێکە لە جورئەت، لە ژیانکردن وەکئەوەی مرۆڤ دەیەوێ بژی، یەقینخوازیش جۆرێکە لە خولانەوە لە بازنەیەکدا، وەك ئەوەی کە حەیوان بە شێوەیەکی گشتی پەسندی دەکات. ئەمەش جیاوازییەکی نێوان حەیوان و ئینسانە و بەهۆی ئەم جیاوازییەشەوە مرۆڤ پێگەی خۆی لە پلەی بوونەوەربوونەوە کە تەنیا شوێن غەریزەکانی دەکەوێ، بەرزدەکاتەوە بۆ پلەی مرۆڤبوون کە عەقڵی خۆی دەخاتە کار و پرسیارکردنیش بەرجەستەبوونی عەقڵە.

بەڵام حەیوان بوونەوەرێکە ناتوانی پرسیار بکا، لەبەر ئەوەی کە لەبازنەیەکدا کە سروشت بۆی دەستنیشان کردووە دەسووڕێتەوەو ئیتر قەدەری ئەو دەستنیشانکراوە. سەرەتای ژیانی هەنگاوی یەکەمە بۆ گەیشتن بە کۆتایی ئەو ژیانە و کۆتایی ژیانیشی هەر ئەوەیە کە لە پێشدا زانراوە. لەکاتێکدا ئینسان بەهۆی توانایەکی بنەماییەوە کە عەقڵە دەتوانێ خۆی لەم بازنەیە رزگار بکا و ڕەوتی ژیانی خۆی بەشێوەیەکی ڕێژەیی بگۆڕێ. بەڵام بۆ ئینسانی ئەو دەڤەرەی ئێمە ئەم تواناییە سروشتیەی خۆی بەکار ناهێنێ. ئەوە کۆمەڵێ بەڵگەو کۆمەڵێ ڕێگر هەن لەبەرامبەر ئەو بەکارهێنانەی عەقڵدا، کەپێموایە لەهەمان کاتیشدا، ڕێگرن لەبەردەم خۆتازەکردنەوەی ئەم مرۆڤەدا و خۆ تەحقیقکردنی وەك بوونەوەرێکی عاقڵ.

**یەعقووبی: ئێمە وەك مرۆڤی کوردی مۆدێرن کێشەیەکمان هەیە بەناوی خوێندنەوەو ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ سوننەت، ئێمە حاشا لەوە ناکەین کە کورد ڕاستە پێشینەیەکی بووە کە ڕەنگە لەگەڵ سەرهەڵدانی مەعریفەیەکی پرسیارکەر دژایەتی کردبێ، بەڵام لەهەمان کاتیشدا خاوەنی سوننەتێکین کە لەوانەیە کۆمەڵێك خاڵی باش و بەهێزیشی تێدابێت کە شایانی ئەوەبێ بیانخوێنینەوەو لێکیان بدەینەوە. بۆ نموونە لەبواری ئەدەبدا ئەگەر ئێمە کەسێکی وەك نالی (کە جەنابیشت کتێبێکت لەسەرنووسیوە) لەبەرچاوبگرین شیعری نالی بۆ ئەوڕۆی ئێمە سوننەتێکە شایانی خوێندنەوە، تەنانەت ئەگەر ئێمە بمانەوێ قۆناغێك لە قۆناغەکانی شێوە ڕۆشنبیری سەردەمی نالی دەست نیشان بکەین ناچارین پشت ببەستین بە خوێندنەوەی شیعرەکانی نالی، ئێستا ئەو کێشەیە لەئارادایە کە ئێمە دەشێ چۆن ڕوو بەڕوو بوونەوەیەکمان لەگەڵ سوننەت هەبێ؟ ئایا ئەگەر قەرارە لێکدانەوەیەك لەسەر سوننەت بکەین، ئەولێکدانەوەیە میکانیکی بێت یا دیالیکتیکی بێت. ئەگەر نەفیو حاشاکردنێك لە گۆڕێدایە ئایا حاشاکردنەکەمان میکانیکی بێت یا دیالیکتیکی؟ ئایا سوننەتی کوردی لەگەڵ عەقڵی ئەوڕۆی ئینسانی کورد ئەو وزەو توانایەی تێدایە کە دیالۆگێك و وتووێژێك سازبێ لەنێوان ئەو دوو عەقڵەو لەو وتووێژەشەوە کۆمەڵێك خاڵی باش وەدەست بێ؟**

سیوەیلی: من بۆخۆم بڕوام وایە کە مۆدێرنیتە یا عەقڵی مۆدێرن دژ یا نەفی کەرەوەی سوننەت نییە، بەڵکو نەفیکردنەوەی ئەو تێڕوانینەیە کە سوننەت بۆخۆی هەیەتی. لەهەمان کاتیشدا، ئەو تێڕوانینە، ئەو تێڕوانینەیە کە سوننەت هەم لێوەی سەرهەڵداوەو هەم دەیهەوێ بشی پارێزێ. مۆدێرنیتە لەوێدا لەسوننەت جودا دەبێتەوە کە تێکشکێنەرە، پرسیار لەسوننەت دەکات بەلاّم رەتی ناکاتەوە. من پێموایە ئالێرەوە ئەگەر بڕوانینە تێڕوانینی مەسەلەن چەند هەنگاوێکی کە بۆ ئەدەبی کلاسیکی نراوە، کە ژمارەشیان زۆر کەمە، بەبڕوای من ئەوە نوێنەرایەتیکردنێکی باشی مۆدێرن نییە، یا مۆدێرنیتە نییە، کە ئێمە ئیدیعای رەتکردنەوەی سوننەت بکەین، بەقەدەر ئەوەی کە مۆدێرنیتە خۆی ئەو تێڕوانینە، ئەو چوارچێوەیە بۆ سوننەت قایل نابێ کە سوننەت دەیهەوێ هەر تێیدا بمێنێتەوە. کەواتە مۆدێرنیتە شتێکە لە هەمان کاتدا لەدەرەوەی سوننەتو لەیەک کاتیشدا بەپشت بەستن بە تێڕوانینێکی تایبەت بۆ سوننەت سەر هەڵئەدا، بەتایبەت لەبواری فیکریو ئەدەبیدا. ئێمە ناتوانین هیچ خوێندنەوەیەکی مۆدێرنانەمان هەبێ بەپێی میتۆدی نوێ بۆ، بۆ نموونە شیعری کلاسیکیمان یا کولتووری سوننەتیمان ئەگەر لەهەمان کاتیشدا پێیەکمان لە سوننەتدا نەبێ.. کەواتە ئەو پەیوەندییە، پەیوەندییەکە کە ئەگەر سوننەت کانییەک بێ کەبۆی هەیە لە فەسڵێك لە فەسڵەکاندا وشك بکات، خوێندنەوەی مۆدێرنیتە بۆ سوننەت گۆڕینی ئەو کانییەیە بە دەریایەك یان بە ڕووبارێك. چۆن؟ بەوەی کە تۆ ناوت نا دیالۆگ یا گفتوگۆ لەگەڵکردن. خوێندنەوەی مۆدێرن بۆ سوننەت خوێندنەوەیەکە یان واچاکە خوێندنەوەیەك بێ لە ئیعترافکردن بەپشکۆی ژێر خۆڵەمێشێکەوە دەست پێبکا کە لە سوننەتدا هەیە. سوننەت بەتەواوی مانا یەکەیەکی مردوو نییە، بەڵکو یەکەیەکی خۆپارێزە. موحافیزەکارە. چۆن ئێمە بتوانین سوننەت لەو ڕووحە خۆپارێزانەی ڕزگار بکەینو بە پێی سەردەمو ئیمکانیەتەکانی ئێستا ئاسۆیەکی تازە بۆ ئەو پرسیارانە دەست نیشان کەین کە لە تێکستە تەقلیدیو سوننەتییەکانی ئێمەدا هەیە؟ ئەمە پێوەندی بەوەوە هەیە کە ئێمە چەندە راستگۆین لەگەڵ خۆمۆدێرنکردن و تێگەیشتن لە مۆدێرنیتە. چەندە

راستگۆین لەگەڵ ئەم دیدەدا کە ناوی دیدی مۆدێرنە بەرەو سوننەت. یەکەم خاڵ ئەم دیدە بەبڕوای من دیدێکی نەفی کەرەوە نەبێ، بەڵکو دیدێکی پێوەندی ئامێزبێ، دیدێك بێ کە لەسەر بنەمای گفتوگۆکردن لەگەڵ رابردودا دامەزرابێ. وەختێك ئێمە گفتوگۆ لەگەڵ رابردوو دەکەین‌و سوننەتیش بەشێکە لەرابردوو، ئەوە گفتوگۆکردنەکە بەمەعنای ئیعترافە بەو رابردووە. مـن پێموایە ئالێرەدایە کە عەقلانییەتێك سەرهەڵدەدا کە مەبەستی وەدەنگهێنانی رابردووە نەك نەفیکردنەوەی. هەر لێرەشدایە کە ئەم عەقلانییەتە، عەقلانییەتێکی پەیوەندخوازانەیە نەك تۆتالیتاریانە. عەقلانییەتی تۆتالیتاریانە ئەوەیە کە پەیوەندی دەبەستێ لەپێناوی سڕینەوەدا. لەکاتێکدا عەقلانییەتی چالاك یا رەخنەگرانە دەیهەوێ رابردوو وەدەنگ بێنێ لەپێناوی فراوانکردنی ئێستادا. ئەوە خاڵێکی زۆر گرنگە کە ئێستای ئێمە هەمیشە لەچاو ئایندەیەکی کە دادێ، ئێستایەکی بەرتەسکە، کە ئێمە دەزانین ئایندە بەهەرحاڵ گۆڕانێکە، حاڵەتێکی تری مۆدێرن بوونە بەنیسبەت ئێستاوە. ئێمەش وەك مرۆڤی پرسیارکەر و رەخنەگر وەك مرۆڤێك کە تەنیا نایهەوێ لە بۆتەی ئێستادا سەقامگیربێ، بەڵکو دەیهەوێ ئایندەدروستکەریش بێ. لە مێژووی عەقڵی مۆدێرندا هەمیشە مەیلێك هەیە بۆ دروستکردنی ئایندەو مەیلێکیش هەیە بۆ خوێندنەوەی رابردوو. کەواتە ئەم خاڵە جەوهەرییە کە لە یەك کاتدا ئێمە پرسیار لە سوننەت دەکەین، لەهەمان کاتیشدا ئەو پشکۆی ژێر خۆڵەمێشانە دەگەشێنینەوە بۆ رووناك کردنەوەی ئەم ئێستایەی خۆمان‌و لەپێناوی دروستکردنی ئایندەیەکدا کە مومکینە ئێمە تەنیا شانازییەکەیمان بۆ بمێنێتەوە. کەواتە من بەهیچ شێوەیەك پێم وانییە کە مۆدێرن بوون بازهەڵدانە بەسەر سوننەتدا، یا رەتکردنەوەی کوێرکوێرانەی سوننەت، ئەوەندەی کە بەدەنگ هێنانی سوننەتە، بەپێی بەرژەوەندییەکانی ئێستامان‌و لەپێناوی شتێکیتردا کە خەونەکان‌و یۆتۆپیاکانی ئێمەیە کە ئەشێت پەیوەندییان بەئایندەوە هەبێت. ئەوەشمان لەبیرنەچێ کە نە سوننەت بۆ هەمیشە دەتوانێ وەك سوننەت بمێنێتەوە، نەمۆدێرن بوونیش دەتوانێ بۆ هەمیشەو بەرەهایی وەك مۆدێرن بمێنێتەوە. سوننەت ناتوانێ لەبەر ئەوەی شتێك هەیە ناوی مۆدێرنە، مۆدێرنیش

پێوەندی لەگەڵ سوننەت بەرقەراردەکاو ئەمەش دەبێتە هۆی بەدەنگ هێنانەوەی سوننەت و گۆڕینی. هەروەها ساتەوەختی *ئێستاش* ناتوانێ دەستەبەری مانەوەی ئەم ساتەوەختە وەکو ساتەوەختێکی مۆدێرن بکا لە بەرامبەر ئایندەدا. واتە زۆر ئاساییە کە لە ئایندەدا وەك سوننەت چاو لە کارەکانی ئێمە بکرێ، لەکاتێکدا ئێمە خۆمان ئێستا پێمان وایە کاری مۆدێرن دەکەین.

کرانەوە، دروست کردنی فەزایەکی گفتوگۆ خۆ بەدوورگرتن لە عەقڵییەتی تۆتالیتارخوازیو ئامرازگەرایانە بە بڕوای من ئەو هەنگاوانەن، یان ئەو پرانسیبانەن کە رەخنەگری جیددی یا ئینسانی بیرکەرەوە رزگار ئەکەن لەوەی حوکمی موتڵەقو رەها بدات. خۆ بەدوورگرتنیش لە ڕەهاییگەریی، خۆ بەدوورگرتنە لەو یەقینخوازییەی کە باسمان کرد، لەهەمان کاتیشدا هەنگاونانە بۆ دنیای پرسیارکردنو بۆ دنیای گۆڕینو شوێندانەر کە پێوەندی بە قسەکانی پێشووەوە هەیە.

یەعقووبی: ***باشە ئێستا با ئەو پرسیارە بێنینە گۆڕێ کە هەر لەبنەڕەتەوە مۆدێرن بوون کە ئێمە کێشەی ئەوەمان هەیە کە دەشێت لەساتە وەختی ئێستادا بیکەین بە پرۆسەیەكو کاری لەسەربکەین، بۆ خوێندنەوەی سوننەت چ شوناسێك هەڵدەگرێ؟ واتە بەرای جەنابت ماهییەتی مۆدێرنییەتو مۆدێرن بوون لەچی دایەو نیسبەتی مۆدێرن بوون لەگەڵ ئێمەی مرۆڤی کورد، لەگەڵ ئێمەی نووسەرو رەخنەگرو رۆشنبیری کورد چۆنە؟ بەوتەیەکی تر ئایا وامەیە مۆدێرن بوونی ئێمە لەئێستادا بەنیسبەتی سوننەتی تایبەتی خۆمان لەگەڵ مۆدێرن بوونی رۆشنبیرێکی بیانی بەپێشینەو سوننەتی تایبەت بە خۆی جیاوازی هەبێ، لەرێگای ئەم پرسیارەوە دەمهەوێ وەڵامی ئەو پرسیارانەش بدەینەوە کەهەندێ کەس پێیان وایە مۆدێرن بوون لە قەوارەی کۆمەڵگای کوردی دەبێت ماهییەتێکی تایبەتی کوردیشی هەبێت وەمۆدێرن بوون بەشێوەیەکی بیانی رەنگە بەقیمەتی دەقاو دەق وەرگرتنی کۆمەڵێك چەمکی بیانی تەوابێت کە لەگەڵ رووحییەتو راستەقینەی کۆمەڵگای کوردیو ئینسانی کوردی نەخوێنێتەوە، ئێوە لەو بارەیەوە چۆن شوناسێك دەدەن بە چەمکی مۆدێرنییەت؟***

سیوەیلی: رەنگبێ ئەگەر بمانەوێ بەشێوەیەکی تەندروستانە قسە لەم بابەتە بکەین و بیبەستینەوە بە پرۆژەی تاکەکەسیی رۆشنبیری کوردییەوە، من پێموایە سێ خاڵی سەرەکی دەبێ لەرۆشنبیریدا هەبێ کە ئەو دەکەنە مرۆڤێکی مۆدێرن:

١. من پێموایە کە رۆشنبیر بەتایبەتی کەسێکی کە لەکایەی رۆشنبیری کوردیدا کاردەکات دەبێ پرۆژەیەکی هەبێت کە من ناوی دەنێم پرۆژەی *خۆناسین*. یانی فەردانییەتی ئەو دەبێ موشکیلێکی مەعریفی بێت لەبەردەمیدا. دەبێ خۆ دروست کردن، خۆ بەفەردکردن ئەوەی کە خاوەنی خودێك بێت، ئەبێ بابەتێك بێ بۆ فیکری ئەم رۆشنبیرە. کەواتە ئەوەی کە ئێمە خود بکەینە بابەتێك بۆ هزر ئەمە خاڵێکی زۆر جەوهەرییە بەلای منەوە کە لەهەمان کاتیشدا هەم کارکردنە بەفیکری مۆدێرن، هەم خۆمۆدێرنیزەکردنیشە لەسەر ئاستی دروستکردنی تاکایەتییەوە، چونکە لە بیرمان نەچێ، یەکێ لەخاڵە هەرە جەوهەرییەکانی فیکری مۆدێرن بەرگریکردنە لەتاکایەتیو فەردانییەتو ئەو شتەی کە پێی ئەوترێ تەشەخوس (تشخص). بەکەس بوون، پرۆژەیەکە کە ئێمە لەگەڵمانا لەدایك نابێ. بە قەدەر ئەوەی پێویستە رۆشنبیر بەپرۆسەیەکی دوورودرێژی خۆ بەکەسکردندا تێپەرێ و بەبروای من ئەو پرۆژەیە بەرلەوەی پرۆژەی هەموو تاکەکانی کۆمەڵگابێت پرۆژەی تاکەکەسە وەك رۆشنبیر. ناکرێ ئێمە، خود، دروستکردنی خود، تاکایەتی خۆمان نەکردبێ بە پرۆژەو ئیدعاو بانگەشە بکەین بۆ گۆران لەژیانی ئینسان، یان لە پرۆسە کۆمەلأیەتییەکاندا. چونکە ئەگەر مرۆڤ خاوەن خودێکی بەتاڵ بێ ناتوانێ کاریگەرییێکی هەبێ لەسەر گۆرانکارییەکانی کۆمەڵگا، واتە خود دەبێ خودێکی تۆکمەبێ، ئەبێ خاوەنی ئیرادەیەکی تایبەت بە خۆی بێ، دەبێ تێگەیشتنی هەبێ لەسەر چەمکەکانی وەك ئازادی و سەربەستی، ئەمجا دەتوانێ خودێکی کارابێت، کە بتوانێ کاریگەریشی هەبێ لەسەر پرۆسەکانی ناو کۆمەڵگا. خودی بەتاڵ خودێکە کە لە هەر کاتێکا مەترسی ئەوەی هەیە تێکەڵ بە جەماوەری خەڵك ببێتەوە. ئێمە لەپرۆسەی شکڵگیری رۆشنبیریی

خۆماندا دەیان جار ئەو ئەزموونەمان هەیە. بۆ نموونە ئەزموونی شەڕەکانی ناوخۆ تەنیا لە مەیدانی جەنگدا ڕوویان نەداوە، بەڵکو لەنووکی قەڵەمی ڕۆشنبیرەکانی ئێمەشەوە وزەی خۆیان وەرگرتووە، وزەی مەعنەوییان وەرگرتووە، ئەگەرچی زاراوەی مەعنەوی بۆ ئەو مەبەستەی ئێمە ڕەنگ بێ کەمتر دەست بدا، بەڵام بەشداریکردنی ڕۆشنبیرانی ئێمە لەو شەڕە دوابەدوای یەکانەدا و ستایشکردنی جەنگ، بەشێك بووە لە پرۆژەی ڕۆشنبیری کوردی، بەڵام دەبێ تێبگەین ئەوە ڕۆشنبیرییەکە کە خاوەنی خودێك نییە کە بتوانێ ڕووبەڕووی هەموو ئەو دیاردانە ببێتەوە کە زیان بە کۆمەڵگای مرۆڤ دەگەیەنن‌و ڕێگا لەبەردم دروست بوونی چالاکی کۆمەڵگاداو پەروەردەبوونی مرۆڤی تەندروست سازبکا. کەواتە هەر شکڵگیری ڕۆشنبیری ئێمەو کائینێك بەناوی ڕۆشنبیر لەوڵاتی ئێمەدا بۆخۆی بەڵگەیەکە لەسەر ئەوەی کە بەخودبوون‌و بەکەس بوون یەکێك نەبووە لە پرۆژە بنەماییەکانی ڕۆشنبیری کوردی.

٢. خاڵی دووەم پێموایە ئەم تاکە کە خودێتی خۆی کردۆتە پرۆژەیەك ئەبێ ئاگابێ‌و وشیاربێ بەو بەستێنە مێژوویی‌و کولتوورییەی کە خۆی تێیدا دەژی، ئالێرەدایە کەکێشەی سوننەت و مۆدێرنیتەش سەرهەڵئەدا، ئینجا لێرەدایە کە کێشەی سوننەت‌و مۆدێرنیتە دەبێتە جێی پرسیارێك بۆ ئەم خودە هۆشیارەی کە دەبێ خود بوونی خۆی لەپێشدا یەکەم پرۆژە بێ. هۆشیاری بەرانبەر بە بەستێنێکی مێژوویی‌و کولتووری لەهەمان کاتیشدا هۆشیارییە ئەگەر ڕەخنەگرانە بێت. کەواتە مەرجمان هەیە بۆ جۆری هۆشیارییەکە. هۆشیارییەکە پێویستە هۆشیارییەك بێت لەسەر بنەمایەکی ڕەخنەگرانەو پرسیار ئامێزەوە لەو بەستێنە مێژووییەی کە ئێمە تێیدا دەژین. بۆ ئەمەشیان دیسان بەڵگەیەك دێنمەوە لەبارەی مێژوونووسی کوردی. ئێمە تا ئێستا بەدەگمەن، هۆشیارییەکی ڕەخنەگرانەمان لەنووسینەوەی مێژووی خۆماندا بەکاربردووە، هەمیشە خوێندنەوەمان بۆ مێژوو نۆستالێژییانەی

تەسلیم ئامێزبووە، کە تێیدا دەبێ ئەو شتەی ناوی مێژووی کوردە بە پاکیو پوختەییو بێ گوناه بخرێتەڕوو، خاڵێکی هەرە جەوهەری بووە. نموونەی ئەو خوێندنەوەیەمان نەك هەر لە پەنجەکانی دەست تێناپەڕێ بەڵکو ناگا بە ژمارەی پەنجەی یەك دەستیش. ئێمە لەو گەرایشە خاوەن دەستەڵاتەی ناو مێژووی کوردیماندا، یەك جۆر تەماشای مێژوومان کردووە، ئەویش ئەوەیە کە میللەتێك هەیە ناوی کوردەو ئەو میللەتە مێژوویەکی هەیەو مێژووی ئەو میللەتە پڕە لە بەڵگەی بێگوناهییەکانی ئەم میللەتە. مێژوونووس وای بیرکردۆتەوە کە ئەو وەك حەقیقەتزانێك ئەیهەوێ ئەم ڕەوتە، ئەم ئاراستە مێژووییەمان بۆ ڕوون بێتەوەو هیچی تر.. ئەویش لەسەر بنەمای چەند بەڵگەیەکەوە کە دیسان بەتێپەڕینی زەمان ئەوبەڵگانە دەکەونە ژێر پرسیارەوە، هەروەکو هەر مەتنێکی تر دەبێ تەئویلی تایبەتیان بۆ بکرێ. ئەم خاڵە وای کردووە کە هۆشیاریمان لەناو ئەو بەستێنە و ئەو زەمینە کولتوورییەی تێیدا ئەژین، هۆشیارییەکی ڕەخنەگرانە نەبێت. خاڵێك لێرەدایە ئەوەیە کە ئێمە ڕەخنە وەکو جۆرێك لەدوژمنایەتیکردن تێگەیشتووین، وەکو بەکەم گرتنی تێگەیشتووین. پرۆسەی ڕەخنە لای ئێمە نەبۆتە پرۆسەیەکی فیکری، تەحلیلکردن، هەڵسەنگاندنو ئەنجام بەدەستەوەهێنان، بەڵکو وشەی ڕەخنە هەمیشە هاومانای سووکایەتیو...هتد بووە. کەواتە ئەم مرۆڤەی کە دەبێ خود بووبێتە پرۆژەی، ئەم خودە دەبێ خودێکی هۆشیاربێت و ئەم هۆشیارییە دەبێ پەیوەندییەکی ڕەخنەگرانە بە ئێستا و ڕابردووی مێژوویی و کولتووریو ژیاریی خۆیەوە دەستنیشان بکا. ئێمە بەداخەوە لەپرۆسەی شکڵگیری ڕۆشنبیریی کوردیدا ئەمەشمان زۆر کەمە، هەر بۆیە ئەو کەسانەش کە بەم ئاراستەیە کار دەکەن دیسان دەبنەوە ئەو کەسانەی کە کۆمەڵگا بەدگومانییەکی زۆریان ئاراستە دەکات. کەواتە دەمهەوێ ئەوە بڵێم کە وشیار بوونێکی ڕەخنەگرانە بەرانبەر بە بەستێنێکی مێژوویی بۆ خۆشی بەشێکە لە مۆدێرن بوون لەناو ئەو کۆمەڵگایەداو لەناو

کایەی ڕۆشنبیریدا، ئەمانە لێك پساو نین، ئێمە بۆوەی مۆدێرن بین دەبێ خاوەنی خودێك بین، دەبێ ئەو خودە پرۆژەی هەبێ، وەدەبێ ئەو پرۆژەیە لەسەر بناغەی تێڕوانینێکی ڕەخنەگرانەوە بێ، کەواتە لێرەدا ڕەخنەو مۆدێرنیتە لێکدی نزیك دەبنەوە، یانی ڕەخنە دەبێتە یەکێ لەمەرجەکانی مۆدێرن بوون. ئەو مرۆڤەی کە پێویستە ئاراستەی هۆشیارییەکی ڕەخنەگرانەی هەبێت بەرانبەر بە فەزای مێژوویی خۆی دەبێ چاوی کراوەش بێ لەئاست مێژوویەك و شارستانییەتێك لەبازنەیەکی گەورەتردا کە بازنەی مرۆڤایەتییە.

٣. ئەمەش خاڵی سێهەمە: پێویستە تەماعمان هەبێ بۆوەی بەشداری بکەین لەدروستکردنی شارستانییەتی مرۆڤایەتیدا. یانی مرۆڤی مۆدێرن کەسێکە کە نە ناسنامەی تاکایەتی خۆی تینویتی دەشکێنێ، نە ناسنامەی قەومیو نەژادی خۆی، بەڵکو هەمیشە هەڵپەی ئەوەی هەیە کە خۆی لە بەستێنێکی گەورەتردا ببینێتەوە کە بازنەی مرۆڤایەتییە. ئالێرەدایە کە بە مرۆڤایەتیکردنی خودێك سەرهەڵدەدا. من تەنیا وەختێك دەتوانم کە خودی خۆم وەك بوویەکی جیهانی بخەمە ڕووو بەشداری بکەم کە لەناو بەستێنی مێژوویی خۆمدا خۆم ناسیبێ، لەناو زاتی خۆشمدا بوویم بە پرۆژەیەك.

پێموایە ئەوسێ خاڵە، سێ خاڵی زۆر جەوهەرین کە بەداخەوە ئەگەر ڕۆشنبیری کوردی یەکەمیانی کردبێ دووهەمیان بۆی بۆتە قەبرو ئیتر نەیتوانیوە لەناسنامەی ناسیۆنالیستی خۆی، خۆ دەرباز بکاو ئەمەش بۆتە ڕێگر لەبەردەم ئەوەی کە ئەو تەماعی هەبێ بۆ ئەوەی کە مێژووی کورد بەشێوەیەك بخوێنێتەوە کە لەهەمانکاتدا کە مێژووی بەقوربانیبوونی ئێمەیە مێژووی بەشداری کردنی ئێمەشە لەناو بەستێنێکی جیهانیو ئینسانگەرایانەدا.

ئالێرەدایە کە ئێمە نرخی مرۆڤێکی وەك نالی-مان بۆ دەردەکەوێ کە یەکێکە لەو ڕۆشنبیرانەی کە دەتوانین بڵێین هەوڵدانی زۆر کاراو بنەچەیی هەبووە لەڕێی دروستکردنی گوفتەمانێك یا "دیسکۆرس" (*discourse*)ێکی شیعرییەوە، کە

بەهۆیەوە توانیویەتی لەئاستی تاکایەتی، تاقیکردنەوەی فەردانیەتی خۆی بۆ ئاستی ئەتنیکی (قەومی) خۆی، دواجار بپەڕێتەوە بۆ ئاستێکی بەرفراوانتر کە بەبڕوای من لای نالی هەوڵدانێك هەیە بۆ بەرهەم هێنانی هیومانیزمێك یا مرۆڤخوازییەك، بەپێی هەلومەرجێکی کوردیانە.

نازانم ئەو قسەیە لەڕووی زانستییەوە تاچەندە راستە، بەڵام لە شیعرەکانی نالیدا بەڵگەی زۆری ئەوە هەیە کە نالی کەسێکی لێبوردەیە، هەڵگری مودارایەکی شیعرییە، شیعر لای ئەو هەڵکردنە لەگەڵ مرۆڤدا، هەڵکردنە لەگەڵ خوددا، هەڵکردنە لەگەڵ مێژوویەکیش دا کە ئەو تێیدا ژیاوە. ئەو نمونەیە لە ئەدەبیات و مێژووی فیکری ئێمەدا زۆر کەم دووبارە بۆتەوە، وەئەمەش بەشێکی زۆری دەگەڕێتەوە بۆ ئەو چوارچێوە پرسیارکوژەی کە تێیدا ناهێڵێ مرۆڤی تاك سەرهەڵبدا، وەناهێڵێ دیدێکی رەخنەگرانە دروست بێ بۆ خوێندنەوەی رابردووو ئێستای خۆمان. دیدێکی پرسیارکوژ باوی هەیەو ئەم دیدەش بۆخۆی دەبێتە قەبرێك کە ناهێڵێ مرۆڤی رۆشنبیری ئێمە تەماحی دیدێکی ئینسانگەرایانەی هەبێ. ئەم دەردە هەر تەنیا ئێمەی نەگرتۆتەوە، بەڵکو دەتوانم بڵێم بەشێکی زۆری ئەو رۆشنبیرانەشی گرتۆتەوە کە لەناو بەستێنی مێژوویی خۆرهەڵاتیانەدا دەژین. بۆ نموونە عەرەبەکان، ئەوان لەئاستی گوتاردا توانیویانە زۆر لەو کێشانەی رێگری مەعریفەن بپەڕەنەوەو چارەسەریان بکەن، بەڵام لە بەردەم کێشەی بوونەوەرێکی وەك کورددا ئەوان دیسان لەناو ئەو قەبرە ناسیۆنالیزمگەرایانەی خۆیاندا گیر دەخۆنەوەو ئێمە لەوێدا کەدەبێ هەڵوێستی ئەوان بەرامبەر بە ئینسانی کورد و کێشەی کورد ببینین تا بۆشمان دەردەکەوێ کە رۆشنبیری ئەوان لەکام بازنەدا قەتیس ماوە. بەهەمان شێوە پێموایە رۆشنبیرانی فارسزمان گیرۆدەی یەکێك لەو بازنانەن و دەبێ کارەساتەکان بەسەر میللەتانی وەك کورددا ڕوویدەن و ئێمە بێدەنگی ئەوان هەست پێبکەین. بۆ کێشەی مرۆڤی کورد نەبۆتە کێشەی بۆ رۆشنبیری فارس؟، ئەمە بۆ خۆی پرسیارێکە. بەڵام ئێمە بەرلەوەی ئەوان تۆمەتبار بکەین دەتوانین بەو پرسیارە ئەوان بخوێنینەوە.

یەعقووبی: ئێستا وەکو چۆن کۆمەڵگای کوردی لەقۆناغی تێپەڕینداپە لە دونیایـەکی سوننەتییەوە بەرەو دنیای مۆدێرن، دیارە هەر بەو نیسبەتەش زیهنیەت و فیکر و بیر و ئەندێشەی ئینسانی کوردیش لەقۆناغی تێپەڕیندایە لەدونیایەکی سوننەتی بـەرەو دنیای پێش مۆدێرن یا مۆدێرن. ئەم تێپەڕینە دیارە جۆرێك سەرلێشێواوی و قەیران دەخاتە شوناس و بیر و ئەندیشەی ئینسانی کوردەوە، من پێموایە ئەگەر ئێمە وەك کۆمەڵگایـەکی جیهـانی سـێهەمی جارێـك بـە نیـسبەتی ڕۆژئـاوا دواکـەوتووبین بـە نیسبەتێکی تریش چونکە بەردەوام لەژێر دەسـەڵاتی کۆمـەڵێك دەوڵـەتی ناوچـەییدا بووین، بە نیسبەتی ئەو دەوڵەتە ناوچەییانەش دیسان هەر جیهانی سێهەمین، یـانی مرۆڤی کورد لەچاو مرۆڤێکی فارس یـا لەچـاو مرۆڤێکـی تـورك یـا لەچـاو مرۆڤێکـی عەرەب بەدوو قات زیاتر جێهانی سێهەمییە. ئەمـە وای کـردووە کـە ئاسـتی پارچـە پارچە بوونو لێك ترازانی وجود و ماهییەتو ناسنامەی ئینسانی کـورد زیـاتر بێـت. ئێـستا پرسـیارەکە ئەوەیـە ئێمـە بـۆ سـاخکردنەوەی ئـەو هۆویەتـە شـێواوەی کـە دەسەڵاتە زاڵەکان چ ڕۆژهەڵات وەك شەرقناسی ئێمەی ناساندووە، چ ناوچـەییەکان وەك بەشێك لە سەروەت و سامانی خۆیان ئێمەیان ناساندووە، ڕۆشنبیری کورد دەبێ پرۆژەی مۆدێرن بوون لەکوێوە دەست پێ بکا؟ ئایا خوێندنەوەی ئێمە دەبێت وەك خـۆت ئامـاژەت پێکـرد لەخودناسـییەوە دەسـت پـێ بکـات؟ ئایـا لەپـەنابردن بـۆ چەمکەکانی دنیای دەرەوە دەست پێ بکات؟ ئەگەر بمانهەوێت پرۆژەی ڕۆشـنبیری کوردی، پرۆژەیەك بێـت کـە بتوانێـت لـەو دەرفەتـە کەمـەی کـە هەیـەتی بـەجۆرێك لـەجۆرەکان تەجرەبـە تاڵـەکانی رابـردوو دووپـات نەکاتـەوە، بـەڵکو بەشـێوەیەك ڕێگایەکی تازە بگرێتە بەر لەئاستی پرۆژەی ڕۆشنبیری دەبێت چ ئاراستەیەك بگرێتە بەر؟

سیوەیلی: بێگومان وەك خۆتان ئاماژەتان پێکرد ناسـنامەی ئێمـە یـا شوناسـی ئێمـە ئەگەر بوبێتە شوناسیش شوناسێکە بەهەتیوی و شوناسێکی چەن پارەیـە و ئەمـەش کێشەی زۆر گـەورەی بـۆ ئێمـە دروسـتکردووە. لـە راسـتیدا ئـەبێ ئێمـە بپرسـین: بـۆ شوناسی ئێمـە شوناسـێکی چـەند پارەیـە؟ کـێ؟ چ بـارودۆخێکی زەمـانیو مـەکانی

لەچەندپارەییکردنی شوناس و کاراکتەری ئێمەدا ڕۆڵی بینیوە. من پێموایە چەند هۆکارێك لەپارچەپارچەکردنی شوناسی ئێمەدا ڕۆڵیان هەیە. هەندێك لەو هۆکارانە لەبناغەدا بەرنامەی سیستماتیکیانەی (ئەویتر) بوون بۆئەوەی شوناسی ئێمە بکاتە شوناسێکی چەند پارە.

بەر لەهاتنی ئیسلام شوناسی ئێمە، ئەگەر ئایینی زەردەشتی ئایینی چەوساوەکان بووبێ ئەوە تا سەردەمی ساسانیش تا ئەوەی کە لەدەوڵەتی ساسانیدا ئیتر ئەبێتە ئایینی رەسمی دەوڵەتو شکڵە تووده‌ییەکەی خۆی لە دەست دەدا، شوناسی ئێمە لەسەر بناغەیەکی زەردەشتییانەوەیە. بەلام بۆ کورد لە ساتێکدا واز لە زەردەشتیەت ئەهێنێ؟ چونکە ئیتر ئەیەوێ لەهەوڵی شکڵگیری شوناسێکی تایبەت بەخۆیدا بێ. ئیسلام ئەم موژدەیەی پێدەدا. بەلام ئیسلامیش دیسانەوە، یا موسوڵمانە سەرەتاییەکان نەك ئیسلام، موسوڵمانە سەرەتاییەکان دیسانەوە شوناسی کوردی پارچە دەکەنەوە. واتە دووری ئەخەنەوە لەوەی کە خۆی بێ، بەڵکو شتێکی پێ ئەبەخشن کە خۆی نییە. ئەگەر ئێمە لەوێوە دەستپێبکەین کە کوردەکان یەکەمین میللەت، یا نەتەوە، یا گرووپی ئەتنیکی بەپێی ئەو سەردەمە، نزیك بوون لەدەوڵەتی ئیسلامییەوە، ئەوە هەر لەسەرەتاوە، لەسەردەمی فتووحاتەوە، تەماشا دەکەین ئیتر پرۆسەی بەخشینی شوناسێك بە کورد بۆتە بەشێك لە پرۆژەی عەڕەبە موسوڵمانەکانی سەرەتا. عەڕەبە موسوڵمانەکانی سەرەتا کە کوردیان بینیوەتەوە وەك ڕێگرێك لەبەردەم پرۆژەی فتووحاتدا هەستاون بەوەی کە شوناسێکی تایبەت بدەن بەکورد تا لەو ڕێگەیەوە دەستەمۆی بکەن. ئەو شوناسەش بە عەڕەبکردنی سەرەتایی کورد بووە و من ئەمەم لە کتێبێکدا بەناوی (قەفەسی ئاسنین: یان بۆ ببمەوە بە عێراقی؟) باسکردووە. ئەوە ئەو شوناسەیە کە ئێمە وەری دەگرین و ئەوشوناسەیە کە عەرەبە موسوڵمانەکانی سەرەتا گەڕیدەکان، مێژوونووسەکان، جوغرافیزانەکان ئەکەونە خەملاندنی دیسکۆرسێك یا گوتارێك کە بە پێی ئەو گوتارە ئەسڵو رەسەنی کورد ئەگەڕێتەوە بۆ سەر عەرەب. لەو ڕێگەیەوە ئێمە دوای ماوەیەك بەتایبەتی بە کۆتاییهاتنی سەدەکانی ناوەڕاست تەماشا دەکەین ئەم پرۆسەیە لەوەی

که پرۆسەیەك بیّ ئەویتر بەسەر مانا فەرزی بکات دەبێتە پرۆسەیەك کە ئەمجا بۆخۆمان قەبوولّی دەکەین.

لەیاداشتەکانی مەئمون بەگی کوڕی بێگەبەگی پادشای شارەزوورەوە کە چەند ساڵێك پێش نووسینی شەرەفنامە نووسیونی هەتاکو شەرەفنامەی شەرەف خانی بەدلیسی، هەتاکو مەلا مەحمودی بایەزیدی هەتاکو مێژوونووسانی سەدەی بیستەممان، ئێمە کارمان لەسەر ئەوە کردووە کە کەسایەتی و ڕەگوڕیشەی ئەم میللەتەی کە کوردە بیگێڕینەوە بۆ سەر عەرەب. کەواتە لەپرۆسەی بەعەرەبکردنەوە کە ئەمە دیارییەکە ئەویتر پێمان دەبەخشیّ تا ئێمە خۆمان نەبین، یانی خاوەنی ئەو زاتە نەبین کە تیایدا منی کوردی دەخەملّیّ، پرۆسەیەکە تەبدیل دەبیّ بەپرۆسەی خۆبەعەرەبکردن. ئەنجا ئەم (من)ـە بەتالّ دەکرێتەوە، کە بەتاڵیش دەکرێتەوە بێگومان جێگەی هەر شوناسێکی دیکەی تێدا ئەبێتەوە کە ئەویتر پێت ئەبەخشیّ. ئەویتر یەکەمجار منی کوردی بەتالّ ئەکاتەوە بۆ ئەوەی منی خۆی، یا موسوڵمانبوونی خۆی یا منی عەرەببوونی خۆی گەورەتر نیشان بدا لەوەی کە هەیە. لەڕێی بچووککردنەوەی منی کوردییەوە، وردە وردە ئەم منە کوردییە ئەوەندە لاواز دەبیّو ئەوەندە هەست بەدلّنیایی دەکا لەوەی کە بەلّیّ بەرژەوەندییەکانی پارێزراون، تەماشا دەکەین ئەمجارەیان دەکەوێتە سەرئەوەی بۆخۆی خۆی بەعەرەب بکات. بۆخۆی ئەو شوناسە وەربگرێت و بە شوناسی راستەقینەی خۆی بزانیّ، کە لە بناخەدا ئەویتر پێی بەخشیوە. ئەوەش دیسان کەرتبوون و پارەبوونێکی تری شوناسی ئێمەیە. کورد دیسان لە مەئموون بەگەوە لە کۆتایی سەردەکانی ناوەڕاستەوە خۆی ئەکەوێتە سەر ئەوەی کە شوناسی خۆی پارچە پارچە بکاو ئەم پارچە پارچە کردنە ئەتوانم بلّێم هەتا سەدەی بیستیش لەبواری مێژوونووسی ئێمەدا بەردەوامی خۆی هەیە. ئێمە چەندین سەرچاوەمان هەیە کە تیایدا ئەسلّو نەسەبی کەسایەتییە ناودارەکانی کورد دەگێڕنەوە سەر یەکێك لە کەسایەتی، یان سەردارە موسوڵمانە عەرەبەکان، یاخود ئەیگێڕنەوە سەر تیرەیەکی عەرەب یا ئەیگێڕنەوە سەر بنەماڵەیەکی عەرەب و لێشمان تێك نەچیّ شەرەف خان مەیلێکی بەفارسکردنی کوردی هەیە، بنەماڵەی

خۆی بۆ نموونـه دەباتـەوە سـەر گۆشتاسـبی بیـستەمین پادشـای فـارس، لەکاتێکدا کەسێکی وەکو مەلا مەحموودی بایەزیدی گەرایشێکی بەتورککردن یا بەعـەرەبکردن و بەبەدەویکردنی کوردی هەیە، یـانی کـورد دەباتـە سـەر عەرەبـە بەدەوییـەکان، ئـەو عەرەبانەی کە لەناوچوون. بەم شێوەیە لەدوای دامەزرانـدنی دەوڵەتـە رەسمییـەکانی ئەم ناوچەیە ئەوە دیسان قۆناغێکی دیکە و هەر یەکـەیان بـەپێی فـۆرمی توندوتیـژی دیکە و لەبەرژەوەندی دەوڵـەتی مـۆدێرنی ناسیۆنالیـست کـە لـەم ناوچـەیەدا دروسـت ئەبن، ئەوانیش دیسان لەچەند پارەکردنەوەی شوناسـی کوردیـدا رۆڵێکـی بەرچـاویان دەبێ. من دەمەوێ بەشێوەیەکی ڕاشـکاو بڵێم کـە کـورد وەك کائینێـك وەك مرۆڤێـك بـواری مـۆدێرن بـوونی بـۆ نەماوەتـەوە، یـەعنی هـەموو ئـەو زەمینانـەی لـەژێرپێ هێنراونەتە دەر کە تیایدا کورد دەتوانێ کـائینێکی مـۆدێرن بـێ. ئەمـەش کێـشەیەکی گەورەی بۆ ئێمە دروست کردووە و ئالێرەوەیە پڕۆژەی یەکەمی مرۆڤـی کـورد بریتیـە لە خۆ بیناکردنەوە و بەرهەمهێنانی خودێکی تایبەت بەخۆی. ئێمە لە ڕووی عـەقڵی و فیکرییـەوە یەقینرێـژ کـراوین. وەختێـك عـەقڵ‌و فیکـرت یەقینرێـژ کرابـێ ئـیتر هـەر لیباسێکی کە لەبەرکەی وەکو بۆدریار دەڵێ سیمۆلاکرۆم و وانموودکردنـە. بـۆ نموونـە ئەگەر بەرگی مۆدێرنی لەبەرکەی‌و ئیدعای مۆدێرن بکەی، وانموودکردنـە و ئیدعایەکـە بۆوەیە کە تـۆ ئەتـەوێ مـۆدێرن دیـاربی، ئـەگینا لەبناغـەدا تـۆ زەمینـەکانی مـۆدێرن بوونت لێ سەندراوەتەوە. ئەوەی کە هەیە کۆمەڵێ هەوڵدانە، کۆمەڵێ هەوڵدانە لەبەشە جیاوازەکـانی ئـەم هەرێمـەدا، ئـەم پانتاییـە جوغرافییـەدا کـە کوردسـتانە و ئـەم دەنگانەش بێگومان ڕووبەڕووی کێـشەی زۆر گـەورە ئەبنـەوە، ڕووبـەڕووی ئیتهامـاتی زۆرگەورە ئەبنەوە.

ئەگەر ئەمڕۆ لە کوردستانی ئێمەدا کۆمەڵێك دەنگی مۆدێرن هەبن یا کۆمـەڵێك دەنـگ هەبن کە بیانەوێ جیاواز لە ئەو بەستێنە مێژووییەی خۆیان تیا ئەژین‌و ئـەو بەسـتێنە کولتوورییەی کە زاڵە، کاربکەن، بەبڕوای من هەر تەنیا ئیدعایەکردن بۆ مۆدێرن بـوون و بەکارهێنانی چەمك‌و زاراوەی وەرگیراو، یا وەرگێڕاو، یا بابڵێین داهێنراو لەلایەن ئەو کەسانە و ئەو دەنگانـەوە بـەس نییـە. بـەلای منـەوە مۆدێرنبـوون لەهـەمان کاتیـشدا

قەبووڵکردنێکی ئەخلاقیيانەی ژيانی مۆدێرنە. ناکرێ ئێمە چەکدار بین بە فیکری مۆدێرن بەڵام لەئاستی ئەخلاقی کۆمەڵایەتیدا لەئاستی پەيوەندييەکانماندا و لەئاستی رەفتاری رۆژانەماندا سوننەت دووبارە بکەينەوە. من لەگەڵ ئەوەشدا کە پشتیوانی تەواوی ئەو کارە فیکرييانە دەکەم و جێی خۆشبەختیمن، بەڵام گلەييەکی يا بابڵێین رەخنەی توندیش ئاراستەی هەر کەسێك دەکەم کە بەناوی مۆدێرنيتەوە بەچەمکەکانی مۆدێرن قسان ئەکا بەڵام ناتوانێ رەفتاری مۆدێرنانەی هەبێ.

ئێمە وەك مرۆڤ هەريەکەمان دەتوانين خاوەنی هەڵەی خۆمان بین‌و بکەوینە ناو بازنەيەکەوە کە زەحمەت بێت بەبێ باجێکی زۆر لێی دەربچین، بەڵام خاڵی جياوازی لەبەينی دیکتاتۆرييەتی رۆشنبیر يا هەڵەی رۆشنبیر و هەڵەی جەللادێکدا ئەوەيە کە رۆشنبیر ئەگەر هەڵەيەکیش بکا زيانمەندی يەکەم خۆی دەبێت. بەڵام جەللاد وەختێك هەڵە دەکا زيانی هەڵەکەی خەڵقانی دیکە ئەگرێتەوە. ئالێرەدايە کە دیوارێك هەيە، يا جيا کارەيەك هەيە لەبەينی ئەوەی کە رۆشنبیر هەڵە بکا يا هەرکەسێکتر هەڵە بکا: هەڵەی رۆشنبیر هەڵەيەکی قورسە و قورساییەکەی تەئسیرێکی خراپی دەبێ لەسەر خەڵك، ناکرێ ئێمە چەکداربین بە چەمکە نوێيەکان بەڵام بە زيهنیەتێك لەژيانی رۆژانەماندا، لە مامەڵەماندا لەگەڵ قوتابيەکان، لەمامەڵەماندا لەگەڵ هاوسەرەکەمان، لەگەڵ منداڵەکان، لەگەڵ ئەو شەقامەی پيا تێدەپەرین، لەگەڵ درەختەکان، ناکرێ ئێمە تەقلیدیانە رەفتار بکەین.

لەبواری گروپەبوونیشدا، ئێمە ئەمڕۆ ئەبینین هەر رۆشنبیرە مۆدێرنەکانی ئێمەن کە بوونەتە چەندین گروپ هەر رۆشنبیرە مۆدێرنەکانی ئێمەن کە ناتوانن کاری هاوبەش پێکەوە بکەن، هەر رۆشنبیرە مۆدێرنەکانی ئێمەن کە ئەتوانن قسە لەگەڵ يەکتر نەکەن، هەر رۆشنبیرە مۆدێرنەکانی ئێمەن کە بەجۆرێك لە جۆرەکان دەتوانن عەزيەتی رۆحی ئەوەی نوێ بدەن. هەر لەناو رۆشنبیرە نوێکانی ئێمەدايە جۆرێك لەلووتبەرزی و جۆرێك لە بابڵێین شانازی کردنی بێ سنوور بە خۆيانەوە هەيە. بەبڕوای من ئەمە پارادۆکسێکە لەزاتی ئینسانی رۆشنبیردا، ئەگەر خودێك خودێکی کامڵ بێت‌و خودێك خۆی رەها کردبێ لەهەموو ئەو شتانەی، ئەو هێزانەی کە

ئەیانەویٚ ئەو خودە بەتاڵ کەنەوە، بەبڕوای من دەبێ ئەو خودە لە ڕۆشنبیردا تەحقیق بووبێ، بەڵام نائومێدانە دەڵێم کە ئێمە کاری جوان دەکەین بەڵام ئەو سەمیمیەتەی کە پێویستە کار و بەرهەم گرێ بداتەوە بەشەخسیەتی نووسەرەوە، زۆر زۆر کەمە و ئەوە یەکێکە لەو کێشە ئەخلاقییانەی کە ڕۆشنبیری مۆدێرنی ئێمە هەر تەفسیرێکمان هەبێ بۆ مۆدێرن، پێوەی دەتلێتەوە. ڕەنگبێ ئەوەش بەسبێ بۆئەوەی ئەنگێزەی بەردەوام خۆناسیمان لەلا دروست بکات وەکو تاکێك، وەکو ئینسانێکی سەربەخۆ، چونکە خۆدروستکردن شتێ نییە ئێمە بڵێین لەمیانەی قۆناغێکی تەمەندا خۆمان دروست دەکەین و ئەمجار ئەڕۆین پرۆژەکانی ترمان جێبەجێ دەکەین. پرۆژەی خۆ دروستکردن پرۆژەیەکە تا هۆشیاریی مرۆڤ کاربکا، عەقڵی کاربکا، دەبێ بەردەوامیش بێ لەسەری. بۆیە لەهەمان کاتدا کە من هەوڵدانە جدیانەی ناو کایەی ڕۆشنبیری و دروستبوونی ئەو گوتارە تازانەی ناو ڕۆشنبیری کوردی دڵ خۆشم دەکەن ئەوەندەش ڕەفتاری هەڵگرانی ئەم گووتارە دەمخاتە بەردەم جۆرێك لە تەئەممول و ئەوەشم بۆ ئەسەلمێنێ کە پارادۆکسێك لەزاتی ئەم کەسەدا هەیە، مەعریفە نەیتوانیوە، مەعریفەیەکی ئەخلاقیانەبێ و ئەخلاق پەی نەبردووە بە بازنەی مەعریفی.

یەعقووبی: باشە کاك ڕێبوار ئێمە ئێستا لەمەیدانی ڕۆشنبیری کوردیدا جۆرە کایەکردن بە هەندێك چەمکی مەعریفی مان هەیە، هەروەك خۆشت ئاماژەت پێکرد کۆمەڵێك گرووپی لێك جیاواز جیا بوونەتەوە بۆئەوەی کە کاربکەن لەم پانتاییەدا، بەڵام بەڕاستی پێوەندی نێوان ڕۆشنبیری مۆدێرنی کوردو مەعریفە چۆن دەبینی؟ ئایا ئەو پێوەندییە، ئەو پێوەندییە تۆکمەیەیە کەدواجار کەڵەکەکردنی مەعریفە ببێتە هۆی قووڵ بوونەوە بەناو ڕەهەندەکانی مەعریفە، یان نا زۆرجار وائەست دەکەین کە ئەو کەڵەکە کردنە هەر لەئاستی کەڵەکە بونێکی ئەندازەییو ڕێژەییدا دەمێنێتەوە؟ پێت وانییە کە ئەو کایانەی کە ئەمڕۆ بەناوی مۆدێرن خوازی دەکردرێت زیاتر کایەکردن بێ بەچەمکەکانی مەعریفی وەك رووکەشی چەمکەکان یان لەراستیدا کایەکردن بێ بەو چەمکە مەعریفییانە بۆ خوێندنەوەی گۆشە نوتەکەکانی مرۆڤی

کورد، چارەنووسی کورد، بەراستی ئێمە تا چەندە زیانمان بینیوە لەوەی کە وەك خۆت باست کرد لەبری پێوەندییەکی قووڵی مەعریفی زیاتر ئێمە پێوەندییەکی رووکەشی مەعریفییە، گەلێ جار پێوەندی عاتفیمان هەیە بە مەعریفەوە بە فیکرەوە ئەوە تا چ ئاستێك ئەوڕۆ رۆشنبیری کوردی تووشی گێروگرفت کردووە؟

سیوەیلی: مۆدێرن بوون شتێك نییە ئێمە بەر لەداهێنانێکی مۆدێرنانە ئیدعای بۆ بکەین دەنا هەروەکو ئیدعایە دەمێنێتەوە. هەر لەمێژووی مۆدێرنیتەشدا ئیدعایە هەمیشە ئەو شوناسە بووە کە پاشتر سەریهەڵداوە، یا بابڵێین ئەوە پاشتر بووە کە بە کارێك، بەئەسەرێك بە تەرزێك لە بیرکردنەوە و هزرین وتراوە: هزرینی مۆدێرن. کەواتە هەمیشە شوناسەکە دوای ئەنجامدانی کارەکە هاتووە، کەچی لای ئێمە بەپێچەوانەیە، لای ئێمە ئیدعایەکە لەپێشەوە دێ، بێ ئەوەی ئێمە بەرهەمێك ببینین کە ئیدیعاکەی لەسەر کراوە.

یەعنی بەرهەمەکە خۆی نابێتە ئەوەی سەرنجی ئێمە رابکێشێتو بڵێ ئەم بەرهەمە، زیهنەتێکی مۆدێرن بەرهەمی هێناوە بەڵکو هەر زەینیەتەکە خۆی بەرلەوەی بەرهەم سەرهەڵدا ئیدعای مۆدێرن بوون دەکا. بەرهەممان هەیە هێشتا لەچاپخانە نەهاتووەتە دەرەوە، یا بەرهەممان هەیە هێشتا دەسنووسەو پاکنووس نەکراوە یا بەرهەممان هەیە هێشتا نەنووسراوەو لەزیهنی نووسەردایە، بەڵام ئیدعای زۆر گەورەی بۆ دەکرێ بەرلەوەی ئەم بەرهەمە ئەسڵەن وجودێکی ماتریالی هەبێ، وجودێکی بەرجەستەی هەبێ لەناو ئەو بەستێنەدا کە پێویستە ئەو بەرهەمەی تێدا بخولقێ! بۆیە من ئەمەش دەبەستمەوە دیسان بە ئەو بونیادە زیهنیەیە تەقلیدیو سوننەتگەرایەی کە ئینسانی کوردی پێ پەروەردە کراوە.

حەزکردن لەجۆرێ لە بەخۆداهەڵگوتن و لەم رێگەیەشەوە دوورخستنەوەی هەموو پرسیارێکی رەخنەگرانە لەوەی کە ئێمە چی دەکەین، لەراستیدا ئەوە کێشەیەکی زۆر گەورەی ناو رۆشنبیری ئێمەیە کە ئەوەندەی ئیدعای تیایە ئەوەندەی کردەوەی تیا نییە، ئەوەندەی کە ئێمە ئاراستە فیکرییەکان، کەسایەتییە فیکرییەکان، کتێبەکانو زاراوە مۆدێرنەکان بەکاردەهێنین بۆ گەیشتن بە پێگەیەکی کۆمەلآیەتی و بەرژەوەندی

شەخـــسی، ئەوەنـــدە قووڵبوونـــەوەو شـــۆڕبوونەوەمان نییـــە بـــەمانا فەلـــسەفیو کارکردییـەکانی ئـەو چـەمکو مەفاهیمانـەدا، ئەوەنـدە رۆڵمـان نییـە لـە گواسـتنەوەی مەعریفە لە بەستێنە جیاوازەکـانی دنیـاوە بـۆ بەسـتێنی خۆمـان، ئەمـەش ئـەوەی لێ سـەوزدەبێ کـە جۆرێـك لەپاشـاگەردانی سـەرهەڵبدا. ئەوەنـدەی لەهــەر شـارێکی کوردستان ئیـدعای مـۆدێرن هەیـە بـڕوا ناکـەم لـەهیچ یـەکێك لەشـارە هاوشـێوەکانی ولأتانی دراوسێی ئێمە یاخود بابلێین هـەتا جیهـانی خۆرئـاوادا بـەو شـێوەیە ئیدعایـە هەبێت. بۆ نموونە ئێمە چەندین ئیـدعامان هەیـە لەسـەر پـۆل ریکـۆر لەسـەر میـشێل فۆکۆ لەسەر جاك دریدا و هابرماس، بەبێ ئـەوەی بەرهەمـە ئەساسـیو بنەماییـەکانی ئەم رۆشنبیرو بیریارانە بەجدی خوێندرابنەوە. ناڵێم وەرگێردرابن، چـون مـەرج نییـە، ئەشێ ئێمە گرووپێك لە رۆشنبیرانمان هەبێ ئەو زمانە بزانن کـە بتـوانن لـەرێی زمـانی دووهەمەوە بەم بەرهەمانـە ئاشـنا بـبن، بـەلأم ئیدعایەکـە زۆر گـەورەترە لـەوەی کـە لەهەر شوێنێکی دیکەی ئەو دنیایەدا هەیە.

جا بۆیـە لێـرەوە ئێمـە دەتـوانین ئەمـە بکـەین بـەپێوەر ئایـا ئـەم جـۆرە بـەرخوردە توانیویەتی ببێتە پەیوەندییەکی مەعریفی یا تەنیا ئیرتیباتە لەپێناوی شتێکی دیکـەدا کە هەرچۆنێك پێناسەی بکەین بەهەر حـاڵ مەعریفـە نییـە، چـونکە یـەکێك لـەو خاڵـە جەوهەرییانە کە پێویستە لە پەیوەندی مـەعریفیا هـەبێ ئەوەیـە کـە ئـەو مەعریفەیـە دەبـێ مەعریفەیـەکی عـەقڵانی بێـت. دواجـار ئێمـە ئـەزانین کـە مەعریفـەی عـەقڵانی لەهەمان کاتـا مەعریفەیەکـە رەخنەگرانەیـە کەواتـە هـیچ وەختێـك ئیدعایـە کـردن یـا بـابلێین خـۆ بـەمۆدێرن لەقەڵـەم دان، ئەگـەر لەهـەمان کاتیـشدا بریتـی نـەبێ لـە دروستکردنی پەیوەندییەکی مەعریفی وەکـو ئیـدعا ئەمێنێتـەوەو ئـەو پاشـاگەردانییە سـازدەکا کـە هـەمووومان بەشـێوەیەك لەشـێوەکان بەدەسـتییەوە ئـەناڵێنین. ئێمـە خەڵقانێك ئەبینین کە لەیەك کاتدا دەتـوانێ فۆکـۆیی بـێ، دریـدایی بـێ، ڤیبـەری بـێ، ئاڵتۆسێری بێ، پۆپەری بێ و هابرماسییش بێت. چەندین شوناسی مەعریفی بۆ خـۆی دیـاری بکـا، بـەلأم لەیـەك شـوێندا نـاتوانێ پـەیوەندییـەکی مەعریفیانـە لەگـەڵ ئـەم سەرچاوە فیکرییانە دروست بکا سەبارەت بە خودی خۆی و لە پێناوی ئەو کێشانەدا

كە ئەو لە كۆمەڵگای خۆیدا پێیانەوە دەتلێتەوەو پێویستە چارەسەریان بۆ بدۆزێتەوە هەر بەكۆمەكی ئەم سەرچاوە فیكرییانە.

ئەمە ئەو كێشەیەیە كە بەبڕوای من چ لەم دیو چ لەودیو ئێمە بەدەستییەوە دەناڵێنین‌و ئەمەش پاشاگەردانییەكی دروست كردووە، خاوەن گۆڤار و دەستگا ئەدەبی‌و فیكرییەكانیش لەم مەسەلەیەدا بەوەی كە پێوەرێكیان نییە بۆئەوەی چ شتێك بڵاو بێتەوە، چ شتێك بڵاو نەبێتەوە، وایانكردووە كە لێشاوی بابەتی لاواز ڕوو لەخراپ بوونی زیاتر بێت. چۆن ئێمە حوكم بدەین بەسەر بەرهەمێكدا كە فیكرییە و بەرهەمێكە كە ناتوانێ فیكری بێ، ئەم پێوەرە نییەو ئەمەش دەتوانین بڵێین ئەوشتە چاكانەی بڵاودەبنەوە مرواریيەكانی ناو دەریان. بۆ نموونە من لەم سەفەرەمدا لە شارە جیاوازەكانی ئەم بەشەی كوردستان چەندین كەس‌و چەندین گرووپم بینیوە كە هەریەكەیان بەشێوەیەك لەشێوەكان هەڵگری پرسیاری جوانن، پرۆژەی جوانن كە ئەوە هەمووی جێی دڵ خۆشییە خاڵێك كە زۆر سەرنجی ڕاكێشام ئەوەیە كە خوێندنەوەیەكی جیدی هەیە بۆ هەندێ گۆڤاری وەك ڕەهەند و گۆڤاری ئازادی‌و ئەو جۆرە گۆڤارانەی كە لەودیو لەواقیعدا هەڵگری پرۆژەی فیكری زۆر جیدی بوون، خاڵە سەرنج ڕاكێشەكە بۆ من لەوەدایە كە چۆن تۆ شەرعییەتی مەعریفی خۆت لە پرۆژەیەكی وەك ڕەهەندەوە بەدەست ئەهێنی بەڵام ناتوانی ئەم مەعریفەیەی كە لەوێوە بەدەستی دێنی بەكاری بێنی بۆ ئێرتیبات بەرقەراركردن لەگەڵ مرۆڤەكانی دەوروبەرت، لەگەڵ ئەو كۆمەڵگایەی كە تیا ئەژی‌و بۆچی تۆ وەختێك فلان نووسەر كەپێی موعجیبی ئەیخوێنییەوە، بۆ ئەمە نابێتە بەشێك لەرەفتار و نابێتە بەشێك لەبیركردنەوەت؟ ئەوە بۆ من بۆتە پرسیارێك. بەڕاستی ئەوە بۆ من وا ئەكا بڵێم كە هەر تەنیا بانگەشەكردن بۆئەوەی كە ئێمە بەئاراستەیەكی فیكری یا بەئاراستەیەكی ئایدیۆلۆژی یا فەلسەفی سەرسامین بەس نییە بۆئەوەی كە توانیبێتمان ئەم سەرسامییە هەڵگێڕینەوە لە ئاستێكی بالاتردا بۆ پەیوەندییەكی مەعریفی كە ئەو ئێرتیباتە مەعریفییە هەموو رەفتار و هەموو كردار و ئەخلاقیات و تەفەككوری ئێمەش بگۆڕێ. ناكرێ ئێمە بۆ نموونە ئینتمامان بۆ پرۆژەی گۆڤارێكی وەكو ڕەهەند

بـیٚ بـەلاٚم لـە نووسـینماندا ئـەو خالاٚنـە رەچـاونەکەین کـە ئەشـێت لـە نووسـینی نووسەرەکانی ئەو پرۆژەیە یا لـەناو ئـەو پرۆژەیـەوە سـەری هـەلگرتبیٚ. یـانی ئەگـەر پرۆژەی گۆڤاری رەهەند، پرۆژەیەکی مۆدێرنی وابیٚ کە شایانی ئەوەبیٚ رێچکە دەست نیشان بکاو چاوی لێبکریٚ، بە بڕوای من ئەو چاولێکردنە لەهەمان کاتیشدا ئەبیٚ چـاو لێکردن بیٚ لەو خەمە ئەخلاقیانـەی کـە بـەناو ئـەو پرۆژەیـەدا بەرجەسـتە بوونـەوە و رەنگیان داوەتەوە.

**یـەعقووبی: لـەم بەشـەی وتووێژکەمانـدا، کـاك رێبـوار پـێم خۆشـە هەنـدێك لەسـەر کارەکانی خۆت بدوێیتو کۆمـەڵێك پرسـیار بێنینـە ئـاراوە، هەڵبـەت بەداخـەوە مـن هەندێك لەکارەکانتم نەدیتووەو نەخوێندێتەوە، بەلاٚم پـێم خۆشـە لـەکتێبی (دنیـای شتە بـچووکەکانەوە) دەسـت پـیٚ بکـەین. ئـەوەی راسـتی بێـت لـەم کتێبـەدا ئـەتۆ بەشێوەیەك لەشێوەکان گۆڕانکارییەکت لەدیدی زاڵـی نووسـینی کوردیـدا بـەدیهێنا. ئەگەر تا بەر لەم کتێبەو بەر لەم شێوە دیدە بۆنووسین، حکایەتی نووسینی کوردی حکایەتی گێڕانەوەی بابەتە دیارو ئاشـکراو گـەورەکان بـوون، بـەلاٚم لـە کتێبەکـەی جەنابتەوەو لـەدنیای شـتە بـچکۆڵەکانەوە تـۆ حکایەتەکـەت گـۆڕی بـە گێڕانـەوەی حکایەتی شتە بچکۆڵەکانو دیاردە وردەکانو ئەو شتانەی کە رەنگە لە پەراوێزەکاندا شاردرابێتنەوە. بەڕاستی چۆن بوو کە جـەنابت پێـت وابـوو بـیری کوردیو فیکـری کوردی ئەو بۆشاییەی تێدایە کە تا ئێستا سەرنجی رانەکێشراوە بۆلای دنیـای شـتە بـچکۆڵەکانو دنیـای شـتە بـچکۆڵەکان شـایانی ئـەوەن کـە باسـیان لێبکرێـتو بخوێندرێنەوە.**

سیوەیلی: ئەوە دیدی ئێمەیە کە شتەکان بە بـچووك دەبینـیٚ یـا بەگـەورە، شـتەکان لەخودی خۆیاندا وەك ئەوەی کە هەن گەورەو بچووك نـین لـەڕووی ئـەرزش و بـەهاوە هەریەکەیان ئەرزشی خۆی هەیە، بەلاٚم ئەوە زاویەی دیدی نووسـەرە کـە دەتـوانیٚ لـە شتە بچووکەکان شـتێکی گـەورە بدۆزێتـەوەو لەشـتە گەورەکانیـشدا ڕەهەنـدی ورد و زەنگیانەیی بدۆزێتەوە. کەواتە من لەسەر دوانەی گەورە و بچووك کـارم نـەکردووە تـا ویستبێتم بڵێم: هەندێك شت بچووکنو هەندیٚ شت گەورەن.

چـی بۆتـه هـۆی ئـەوەی بـەو شـێوەیە بنووسـم؟ نـازانم و ئەمـەش بـۆمن پرسـیارە !
هەڵبەتـه مـن داوای لێبـوردن دەکـەم، هـیچ قـسەم نییـه بیـسەلمێنێ کـه تـوانێبێتم لەڕێگەی ئەو کتێبەوە ئەو ئەرکە جێبەجێ بکەم کە ئێـوە ئامـاژەتـان پێـدا. بـەڵام زۆر بەسادەیی پێت بڵێم لەوەختێکا من ئیشم لەسەر ئەو کتێبە کردووە، کە هەموو زیهـنو هەموو خەیاڵگەی رۆشنبیری ئێمە، یا بەشێکی زۆر زۆری سەرقاڵە بەوەی کە وەڵامێـك بۆ ئەو قەیرانانە بدۆزێتەوە کە سیاسەتو حزبایـەتی لـه کۆمـەڵگای ئێمـەدا بەرهـەمی هێناونو ئەم کێشانەش زۆربەی وزەی رۆشنبیرانی ئێمـەو وزەی تـەحلیلیو شـرۆڤەیی رۆشنبیرانی ئێمەی بەلای خۆیدا راکێشاوە، تۆ ئەگـەر ئامـارێکی ئـەو وتـار نووسـینانە بکەی کە لە نەوەدەوە بۆ دووهەزار نووسراون تەماشا دەکـەی زۆربـەی هـەرە زۆریـان خولیاکەیان خولیایەکـە بەپلـەی یەکـەم لەلایـەن دوو بـاڵی سیاسـی یـا حزبییـەوە لـە کوردستانی ئەودیوا دەست نیشان کراوە، یانی ئەو دوو حیزبە سـەرەکییە توانیویانـە تەواو ببنە سەرپۆشێك، ببنە قەفەسێك کە نەهێڵن رۆشنبیری ئێمە بـیر لـە بابـەتی تـر بکاتەوە. بیرکردنەوەی ئێمە لەو ماوەیەدا بیرکردنەوەیە لەو ئەنگێزانەی کە سیاسەتی پـــارتیو یەکیـــەتی لـــەزیهنی رۆشـــنبیرانا دروســـتیانکردووە، مـــن وەك جۆرێـــك لەبەرپەرچدانەوەی ئـەوەی کـە زیهنـی رۆشـنبیر نـابێ لـەدەرەوەی خۆیـەوە ئاراسـتە بکرێو هەموو وزەی هەر لەو پانتاییەدا سەرفبکا، بیرم لەوە کردەوە کە دەشـێ ئێمـە بە جۆرێکی کەش مێژووی کۆمـەڵگای خۆمـان بنووسـینەوە، دەشـێ ئێمـە حیکایـەتی دیکە لەسەر کۆمەڵگای خۆمـان بەرهـەم بێـنینو دەشـێ وەزیفەیـەکی دیکـە ئـەرکێکی دیکـە بدەینـە پـاڵ نووسـین کـە لـە هـەمان کاتـدا بەرهەمهێنـەری مەعریفەیـەك بـێو بەرهەمهێنەری ئیستاتیکاو جۆرێکی دیکـەش لـە جوانیناسـی بـێ لـەبواری نووسـیندا. لێـت ناشـارمەوە نووسـین لەسـەر شـتە بـچووکەکان وەکـو خـۆت فـەرمووت شـتە بـە پەراوێزکراوەکان و لەسەر حاڵەتە دەگمەنەکان، ئاسان نییە لەبەرئەوەی کـە نووسـین هەمیـشە نووسـین بـووە لەسـەر شـتە گـەورەکان، نووسـین هەمیـشە مێـژووی شـتە گەورەکان بووەو بەدەنگهێنانی شتە گەورەکان بووە. یا بابڵێین ئەوە ئیقتیداری شـتە گـەورەکان بـوون کـە نووسینیـشیان راپـێچ کردۆتـە ژێـر خزمـەتی خۆیانـەوە. بـەڵام

لەشوێنێکدا نووسین دواجار دەیەوێ ئاراستەیەکی دیکە بۆ خۆی دەست نیشان بکا کە پێم وابێ تا ئەندازەیەکی کەم من توانیبێتم لەهەندێ وتاری ئەو کتێبەدا ئاوڕ لەو شتانە بدەمەوە کە نووسەری کورد تا ئەو کاتە بۆی نەبوونەتە خولیا، یان زۆر کەم ئاوڕیان لێدابۆوەو بێگومان خەسڵەتی ئەم نووسینەش تایبەتمەندی خۆی هەیە. ئەمە نووسینێکە کە مەعریفەی عەقڵانیو حیسییات تێکەڵ دەبێ تیایدا. سنووری نێوان دەرەوە و ناوەوە، تایبەت و گشتی و سەبجەکتیف و ئۆبجەکتیف تێکەڵ دەبن و شتێکی دیکە دروستدەبێ بەناوی هاوبەش. ئێمە بۆ نووسینی بەشەکانی ئەو کتێبە دەستپێکردنێکمان هەیەو فراوانکردنی بازنەیەکمان هەیە و دواجار گەڕانەوەیەکمان هەیە بۆ خاڵی سەرەتا، تاکو بزانین ئایا لەو سەفەرەدا کە بەناو دەقدا دەیکەین چ شتێ گۆڕاوە.. لەهەمان کاتیشدا ئەو بەرهەمە هەوڵدانێکیشە بۆ خۆدەربازکردن لەو عەقڵییەتە رۆژنامەییەی کە بەگشتی لەهەندێ نووسینی وەك نووسینی کورتە وتاری کوردیدا، ژانری وتاری کوردیدا، زۆرباو بووەو من هەوڵمداوە کە ژانری وتار ڕەهەندێکی دیکەی بێتە سەر ، یان دەوڵەمەندتر بێ بە دیدێکی جوانیناسانەی زیاتر، بەجۆرێ کە وتار لەیەك کاتدا مەعریفە و لەهەمانکاتیشدا چێژێکی جوانیناسانەمان پێ ببەخشێ. چەندە من لەو کێشەیەدا سەرکەوتوو بووم یان نا، نازانم، بەلآم ئێستا کە بیری لێ ئەکەمەوە پێموایە ئەو کتێبە لەوێوە سەرچاوەی گرتووە کە خۆ دەربازکردنو نووسین دەربازکردنێك بووبێ لەو ئیقتدارەی کە فەزای سیاسی سەپاندبووی بەسەر نووسینی کوردیدا. ئەڵبەت من بەبێ ئیدعا نالێم ئەو کتێبە زۆر گۆڕانی گەورەی دروست کردووە، بەلآم بەهەرحاڵ هەوڵدانێك بوو بۆ من. پەیگیری ئەم هەوڵدانەم، لەبەرهەمێکی تردا کردووە بەناوی (نەتەوەو حەکایەت) کە ساڵی پار چاپ بووە، یانی مەبەستم بووە کە جۆرێکی دیکە لە شکڵی وتار بەرهەم بێنم کە جیاواز بێ لەوانەی ئێمە لە رۆژنامەو لەهەندێك لە گۆڤارەکان ئەیخوێنینەوە.

ئەمانە لێکۆڵینەوە نین بەقەدەر ئەوەی وتارن. بەو مانایەی کە هەڵگری سوننەتێکی تایبەتن بۆ وتارنووسی و هەڵگری ڕەهەندێکی جوانیناسیانەن لە بواری نووسیندا. بێگومان خوێندنەوەی کەسێکی وەکو (والتەر بنیامین) فەیلەسووفی ئەڵمانی،

ئاگاداربوونم لە هەندێ کاری وەك (ژۆرژ باتای) و (مۆریس بلانشۆ)، دەوری سەرەکیان هەبووە لەوەی کە من بتوانم بەچەمکەکانی ئەوان بیرکەمەوە یا چەمك و تێڕوانینەکانی ئەوان کەڵکەڵەی ئەو جۆرە نووسینانە لای من بڕەخسێنن. بەهەرحاڵ لەڕووی مەعریفییەوە بنیامین لەو کتێبەدا (دنیای شتە بچووکەکان) ڕەنگدانەوەیەکی زۆر دیارو ئاشکرای هەیە، چ بەوەی من ڕاستەوخۆ بیروڕاکانیم گواستۆتەوە، چ بەوەی کە بیروڕاکانیم بەستکردووە، مەسەلەن یەك دێڕم وەرگرتووەو دوایی لەم دێڕەوە من چوومە ناو دنیایەکی تایبەتەوە، یا بەوەی کە بیرم بە تەرزە فیکری بنیامینی کردبێتەوە و قسەی خۆمم لەوێوە کردبێ، یان شتگەلێکم کردبێتە کێشە و لەئاستی دەقدا، پانتاییەکی هاوبەشم ئاشکرا کردبێ کە پێش هەموو شێ داوەتمان دەکات بۆ بینینێکی دیکەی شتەکان.

**یەعقووبی: کاك ڕێبوار جەنابت دیارە ئەم کتێبەت ئەو کاتە نووسی کە لەئەورووپا دەژیای، لەڕاستیدا ئەم کتێبە تا چەندە کاریگەرێتی ژیانی فیکری ئەورووپاتی پێوە دیارە، بەوتەیەکی تر تا چ ئاستێك فیکری ڕۆژئاوا بۆ زیهنیەتێکی ڕۆژهەڵاتیی و قەڵەمێکی نووسەرێکی ڕۆژهەڵات بووە هۆی ئەوەی کە بۆ نموونە لەم کتێبەدا باس لە جەستە بکرێت، کە دەزانین تا ئەو کاتیش لەڕاستیدا جەستە هیچ کات نەچووبووە نێو قەوارەی نووسینی کوردییەوە.**

سیوەیلی: ڕەنگە نەتوانین لەوبارەیەوە قسەی کۆتایی بکەین. ئەوە ڕاستە کە جەستە لەم کتێبەدا ئامادەییەکی بەرچاوی هەیە. ڕاستە وتاری (دەست) لەئەنجامی بینینی دیمەنێکەوەیە کەتیایدا دوو سەرکردەی کورد پێویستە تۆقە لەگەڵ یەك بکەن، دەست بدەنە دەستی یەکتر، بەڵام ئەوان ئەم کارە ناکەن، کەسی سێهەم کە (مادلین ئۆلبرایتە) دێت ئاگاداریان ئەکاتەوە کە ئێستا ئێوە پێویستە لەبەردەم کامێراو میدیاکاندا تەوقە لەگەڵ یەکتر بکەن وەکئەوەی ڕەمزی ئاشتبوونەوەیە. ئەمە دیمەنێکی تەلەفیزیۆنیو ڕاگەیاندنە کە دەبێتە هاندەر و کەڵکەڵەی ئەوە ئەخاتە سەری منەوە کەباس لەدەست بکەم، ئەرکەکانی دەست، ڕەمزیەتی دەستو دەست وەکو بەشێك لەجەستە بخەمە بەرباس. لە وتارێکی تردا نیگای (ئەویتر) ئەبێتە هۆی

ئەوەی من باس لەچاو بکەم، نیگای ئەوی تر وەك هێزێك كە منی تاراوگەیی بە جۆرێکی تایبەت دەبینێ، کە لەو تایبەتمەندییەدا جۆرێك لەچەوسانەوەو ستەمکاری ئەبینیەوە، ئەمە ئەبێتە ئەنگێزەی ئەوەی من گرینگی بدەم بەچاوو ئەو ئامرازانەی کە لەناو مێژووی تەکنەلۆژیادا درێژ کراوەی چاو وەکو لێنز، چاویلکە، دووربین، ئامێری وێنەگرتنو ئەوانە. لەم وتارەدا بوو هەستمکرد بە جیاکارەیەك لە نێوان بینین و تەماشاکردندا و پاشانیش بەهۆی خوێندنەوەی کارەکانی (پاوڵ ڤیرلیۆ) زیاتر لەمە تێگەیشتم. کەواتە ئێمە جارێك لەجەستەوە ئەچینەوە بۆ ناو لایەنەکانی تر، یا جارێك لە لایەنەکانی ترەوە دێینەوە ناو جەستە و لەم نێوانەشدا هیچ شتێ کەمبایەخ نییە.. وتارێکی تر سەبارەت بە کتێب و کتێبفرۆشتنە. من ناچارم کتێبەکانم بفرۆشم و ساخیان بکەمەوە و دێم وتاری (کتێبەکان، هاورێکان، مەرگو بیرەوەری) دەنووسم. ئەوە شتێکی زۆر ئاساییە هەموومان لەبەشێك لە قۆناغی ژیاماندا ناچار ئەبین کە کتێبەکانمان زایە بکەین و بیانفرۆشین، بەلاَم ئەمە چۆن هەڵگێرینەوە، ئەم کردە رۆژانەییە چۆن هەڵگێرنەوە بۆئەوەی کە مەعریفییانە کاری لەسەر بکەین. بۆیە لەوێدا تۆ تەماشا ئەکەی پێوەندییەك دروست ئەبێ لە بەینی کتێبەکان، لەبەینی هاورێکانو لەبەینی مەرگو بیرەوەریدا، ئەوە لەهەمان کاتیشدا یاد هێنانەوەی مەرگێکی دیکەشە کە مەرگی باوکمانە. کەواتە لەم کتێبەدا ئەگەر تازەییەك هەبێ ئەوەیە شتە زۆر تایبەتییە شەخسییەکان و حیسییەکان تەبدیل دەبن بە بابەتێکی مەعریفیو فیکری. چەندە من لەم پرۆسەیەدا سەرکەوتوییم بەدەستهێناوە نازانم، بەلاَم بێگومان وەکو ئێوە ئاماژەتان پێدا نووسینی ئەو کتێبە بێ کاریگەریی نەبووە لەو فەزایەی من لە ئەوروپا تیایدا ژیاوم، نەك هەر لەسەر ئاستە مەعریفییەکەی، بەڵکو لەسەر ئاستی ژیانی رۆژانە و کۆمەلاَیەتیش.

یەعقووبی: جەنابت لە کارێکی دیکەتدا کە دیارە لەو کارە دەگمەنانە بوو کە لەپانتایی نووسینی لێکۆڵینەوەی کوردیدا هاتە ئاراوە، کتێبێکت نووسی لەسەر نالی و بە شێوەیەکی مۆدێرن هەندێ لە قەسیدەکانی (نالی)ت خوێندۆتەوە. من پێمخۆشە لێرەدا ئاماژە بە رستەیەکی دریدا بکەمو پاشان لەرێگەی ئەم رستەیەوە پرسیارێك

بێنمە ئاراوە. دریدا لە شوێنێك دەڵێ مانا لەگەڵ ئەو سیستمە وزەو توانایانـەی کـە تاکەکەسی نین، دەق دەگرێو شکڵ دەگرێ، مانا هـیچ پێوەندییـەکی بـە شوناسـی شەخسییەوە نییە بەڵکو لەگەڵ ئەو حەوزەیە کۆمەڵێك وزەو توانا پێوەندی هەیە کە رەنگە ئەم وزەو توانایانە شەخسی نەبن.. بە وتەیەکی تر ئەوە کێشەو ئاوقـابوونی ئەو هێزە ناشەخسیانەیە کە تەئویل دەخولقێنێ، دریدا لەسەر ئەوە پێدادەگرێ کـە ئەو قسەیە بەمانای ئەوە نییە کە هیچ مەبەستێك بۆ سەرهەڵدانی ئەو دەقە لـەئارادا نەبووە، بەڵکو ئەوەی کە دواجار بۆ راڤەکە کاریگـەرێتی هەیـە ئـەو هێـزە غەیـەرە شەخسیانەن کە لەنێو دەقەوە سەرهەڵدێنن. من پێموایە لـەم کتێبـەدا بەشـێوەیەك لەشێوەکان جەنابت ئەو شێوە دیدە دریداییە بۆ خوێندنەوەی نالی بەکاردێنی، یانی پێتوایە نالی ئەو نالییەیە کە لەناو دەقەکەدا بوونی هەیە، نالی دەرەوەی دەق نالییەك نییە کە بۆ تۆ سەرنج راکێش بێت بۆیە بـۆ نموونـە خوێندنـەوەی تـۆ بـۆ قەسـیدەی مەستوورە خوێندنەوەیەکە کە لەدیدێکی ئاکادیمیکی سوننەتی کە بێگومان جۆرێـك سەرسووڕمان بەدی دێنێ کە ئایا بەڕاسـتی ئەمـە نالییـە، قەسیدەی مەسـتوورەت بەشێوەیەك خوێندۆتەوە کە لەگەڵ ئەو هێزە غـەیری شەخـسیانەی نـاو دەقەکـەوە ڕووبەڕوو بوویتەوەو هەر بۆیەش خوێندنەوەیەکی تازەیە بەنیسبەتی خوێندنەوەکانی پێشووی نالی، پرسیارەکە ئێستا ئەوەیە بەڕاستی تۆ چۆن بـو کـە پێـت وابـوو نـالی راستەقینە نالییەکە کە دەبێ لەناو دەقەکانەوە بۆی بڕوانین، ئەو غوربەتەی کە نالی لە قەسـیدەی (قوربـانی تـۆزی رێگـەتم) هەیـەتی غوربەتێکـە کـە تـۆ هـان دەدا بـۆ خوێندنەوەیەکی مۆدێرن لەسەر دەقێك کە لە کۆمەڵگایەکی سوننەتیدا خولقاوەو لە زیهنیەتێکی حوجرەییەوە سەری هەڵداوە.

سیوەیلی: ماوەیـەکی زۆر لـەناو مێـژووی رەخنـەی ئـەدەبی ئێمـەدا تاقـە جۆرێـك لـە خوێندنەوە ئەوەبوو کە ئێمە بەر لەوەی باسی دەق بکەین ئەبێ باس لەداهێنەری ئەم دەقە بکەین و داهێنـەری دەق لەهـەمان کاتـدا بێـژەری دوایـین حەقیقەتـەکانیش بـوو لەسەر دەق، بەمانایەکی تر داهێنەری دەق یەزدانی دەق بوو کە لەوێدا ئەو توانیبووی خەسڵەتێکی موقەددەسانەش بەدەق ببەخشێ کە دەق ئیتر زمانێکی تایبـەت بـەخۆی

نەبیٚو زمانی دەق لەهەمان کاتدا زمانی نووسەر یا بەرهەمهێنەری دەق بیٚ. ئەمە وایکرد کە بەشێکی زۆر لەدەقە کلاسیکیەکانی ئێمە هەر لەم چوارچێوەیەدا تەماشایان بکریٚ کە موفەسیری ئەم جۆرە دەقانە بەو دەقانەیان رەوا دەبینیٚو ئەمەش ئەو کێشەیەی بۆ ئێمە دروستکرد کەدوای ساغ بوونەوەی دیوانی شیعری کلاسیکە گەورەکانمان و دوای ئەوەی کە زانیمان ئەم شیعرە لەرووی مانابیەوە وامان پێدەڵیٚو ئەم وتەیە ئەو مانایە دەبەخشیٚ، ئیتر کاری ئێمەبوو بە خوێنەرێك کە ناتوانین داهێنان لەو دەقانەوە هەڵبێنجین، بەڵکو ئێمە دەتوانین تەنیا ئەو مانایەی کە نووسەر مەبەستیەتی دیسانەوە دووبارە بکەینەوە! کاری یەکەمی رەخنەگرێك کە بیەویٚ بە دیدێکی مۆدێرنانە، جا هەر ئاراستەیەکی خوێندنەوەی رەخنەیی هەبیٚ، ئەوەیە کە نەبێتە دووبارە کەرەوەی ئەومانایەی کە رەخنەی سوننەتی بەدەقی رەوا بینیوە، بەڵکو بتوانیٚ دەق هەم لە ئەو ئیقتدارەی کە نووسەر هەیەتی رزگار بکاو هەم لەو سوننەتە رەخنەییە چەق بەستووەش رزگاری بکا کە دەسەلآتێکی پەیدا کردووە و هەموو دەقەکان بەیەك چاو دەخوێنێتەوە. کێشەی من لەسەرەتای سەرەتادا ئەوە بوو کە نالییەك بخوێنمەوە کە تایبەت بیٚ بەخۆم، مانایەك لەدەقی نالیدا بەرجەستە بکەم کە من لێی تێدەگەم، بەبیٚ ئەوەی گویٚ بدەمە ئەو یاسایانەی کە لەناو مێژووی رەخنەی ئێمەدا نالییان پیٚ دەخوێندرێتەوە، بەمانایەکی تر من چۆن بتوانم لەئەنجامی خوێندنەوەی مانایەکی تایبەت بۆ غوربەتی نالی باس لە غوربەتی ئێستای خۆم بکەم، یان باس لەتاراوگە بوونی ئێستای خۆم بکەم، یاخود باس لەو مانایە بکەم کە من لەئێستای خۆمدا بۆ شوێن، بۆ زەمانو مەکانو مێژوو و بۆ جوانی دەیبینم و هەستی پیٚ ئەکەم. دەقی نالی بەهەموو مانایەك دەقێکی کراوەیە. یانی دەقێکە کە خۆی ئەدا بەدەست چەندین خوێندنەوەوە و دەقێکە کە ئەتوانیٚ لەهەر سەردەمێکدا وەلآمدەرەوەی کۆمەڵیٚ پرسیاری جیدی بیٚ و خۆی بەرهەم بهێنێتەوە، ئەگەرچی بەپێی رەخنەی سوننەتی دەقی نالی لەدیوانی نالیدا کۆتایی پێهاتووە. ئیتر تا ئەویٚ برێەکاو ئەوە ئاخرین حەقیقەتەکانە لەسەر ئەو مانایانەی کە نالی بەرهەمی هێناون. بەلآم تێروانینی رەخنەگرانەی جیددی بۆ دەقی نالی تێروانینێکە کە

پرسیارەکانی نەك لە سوننەتێکی تەقلیدی رەخنەی ئەدەبیەوە وەردەگریّ بەڵکو لەئێستاوە پرسیار ئاراستەی دەق دەکا، هەر هەمان پرۆسەی کە ناوت نا ئیعترافکردن بە سوننەت، خودی ئەم پەیوەندی دروستکردنە دابینکەری مانەوەی دەقی سوووننەتیە، تەئمین کەری ئەوەیە کە ئێمە دەقێك، کە مێژوو ناوی ناوە دەقی سوننەتی بکەین بە دەقێکی ئێستایی لەرێی ئەو پرسیارە ئێستاییانەی ئاراستەی دەکەین. پرسیارێك کە ئەم دەقە ئەشێ بتوانێ وەڵامیان بداتەوە لە نەتیجەی ئەم وەڵامەوەیە کە ئێمە رابردووەکان بانگهێشتن دەکەین بۆ ئێستاو ئەمە ئەو پرۆسەیەیە کە (پۆڵ ریکۆر) ناوی دەنێ (هاو چەرخانەکردنی) رابوردوو لەرێی ئەو پرسیارانەوە کە ئێمە ئێستا دەیانکەین لە رابوردوو. ئێمە رابوردوو نەك هەر وەدەنگ دێنین بەڵکو بانگهێشتنیشی دەکەین بۆ ئێستاو بەو مانایەش مرۆڤەکانی وەکو نالی دەبنە مرۆڤی هاوچەرخ و ئێمە ئەو دیدە مێژوویییەیان لەسەر هەڵدەگرین کە نالی وەها پێناسە دەکات، کەلەم ساڵە لەدایك بووەو لەم ساڵەدا مردووە. ئەمە ئەوەیە کە رەخنەی سوننەتی دەیکا، رەخنەی سوننەتی لەناو چوارچێوەیەکی مێژووییدا شیعری نالی سەقامگیر کردووە، یەعنی ژیانی نالی لەهەمان کاتیشدا چوار چێوەی مانایی شیعری نالی پێکدەهێنێ، بەڵام خوێندنەوەیەکی تەئویلکەرانە بۆ شیعری نالی ئەوەیە ژیانی نالی وەك شەخسێك تا ئەندازەیەك مەبەستمانەو بەڵام ئێمە مانەوەی نالیمان وەك مانا، وەك گوتار پێویستمان پێیەتی کە ببێت بە بەشێك لە ئێستامان، چونکە ئێستامان لەوە بەرتەسك ترە کە بتوانین تیایدا ئاسوودە بین، بۆوەی تیایدا ئاسودە بین دەبێ لەگەڵ رابردووەکانی کە لەهەمان چوارچێوەی بەرتەسکانەی خۆیاندا ژیاون و ئەوانیش وەڕز بوون لە ئێستای خۆیان، ئێمە بتوانین ئەم دوو وەڕەزبوونە، ئەم دوو پرسیارکردنە لەگەڵ یەکتری هاوتاکەینەوە و جۆرێك لە پێوەندییان لە نێواندا دروست بکەین. ئەم پەیوەندییە هەم نالی گەورەترو روونترو بەرفراوانتر پێشان دەداو هەم دنیای ئێمەش لەو بەرتەنگیو خەفەقانو تەنگە نەفەسییەی خۆی رزگار ئەکا.

کەواتە خاڵی جەوهەری لەلای من ئەوە بوو کە نالییەك بهێنمە ناو ژیانی خۆمەوە، نەك مەعناکانی ژیانی خۆم بسەپێنم بەسەر نالیا، بەڵکو بە ماناکانی نالی فراوانییەك لەناو

ژیانی خۆمدا دروست بکەمو ئەمەش پێویستی بەکەرەسەی رەخنەیی بەکەرەستەی شیکردنەوەو شیتەڵکاری هەیە کە ئەوە حیکایەتێکی ترە، بەلآم ئەنگێزەی ئاوڕدانەوەی من لە نالی ئەوەیە کە، یەك بەرپەرچی ئەو دیدە مێژووییە بدەمەوە کە تیایدا شیعر سەقامگیردەکا، دوو، چۆن بتوانم شیعری (مەستوورە) شیعری (هەی کەرێکم بوو چ پەیکەر) و هتد لەو بازنەیەی کە سوننەتە تەقلیدییەکانی رەخنەی ئەدەبی بۆیان دەستنیشان کردووە رزگار بکەم؟ ئەوەش پێویستی بەوە هەبوو هەڵبژاردەیەك بکەم بەناو دەقەکانی نالی دا، دەقی نالی لەوە بەرفراوان ترە کە ئێمە بتوانین لەیەك بەرهەمدا هەموو قسەی خۆمانی لەسەر بکەین بەڵکو دەبێ ئێمە قسە کردنمان لەسەر نالی قسەی هەمیشەیی بێو گفتوگۆکردنمان لەسەر نالی یەکێك بێ لە ئەرکەکانی هەر نەسلێك کە پێیوایە پرسیاری هەیەو پێیوایە کە دەقی ئەدەبی دەقێکی کراوەیە.

**یەعقووبی: کاك ڕێبوار نالی وەك یەکەم شاعیرێك کە بیهەوێت قوتابخانەی شیعری گۆران بەجێ بێڵێتو رووبکاتە قوتابخانەیەکی شیعری سۆرانیو ئینجا لە قەوارەی کلاسیکی عەرووزیدا زمانێکی پاراوو تاڕادەیەك کوردییەکی خۆشو لەهەمان کاتدا بەکارهێنانی کۆمەڵێك واژەی عەرەبیو کایە پێکردنیان لەنێو ڕێساکانی دەستووری زمانی کوردیدا، بەراستی چی مەبەست بووە؟**

**ئەم پرسیارە دوو جەمسەری لێ دەبێتەوە:**

**ئایا نالی ویستوویەتی تەنها وەستایەتیو شارەزاییو لێزانیو پسپۆری خۆی لە بواری شیعری کلاسیکی و عەرووزی بنوێنێ، وەك زۆر شاعیری کلاسیك کە تەنها ئەمەیان مەبەست بووە؟ یان ئەوەی نالی ویستوویەتی ئەوەیە شیعری کوردی بە جۆرێك لە قوتابخانەیەکی تازەدا تاقی بکاتەوەو لە هەمان کاتیشدا پێ دابگرێ لەسەر کۆمەڵێك چەمکی نیشتمان خوازانە بەپێی رووحیەتی ئەو سەردەمی دەسەلآتی کوردی کە دیارە دەسەلآتێکی میرنشینانە بوو؟ ئایا لە پشت ئەوە فیکرو فەلسەفەیەك یاخود گوفتمانێك لەئارادایە کە نالی ویستوویەتی لەوڕێگایەوە زەقی بکاتەوە؟**

سیوەیلی: من وەڵامی ئەو پرسیارە ئاوا ئەدەمەوە: لە بەردەم نالیدا، ئێمە لەبەردەم جیهانبینییەکی شیعریداین. بەمانایەکی تر، شیعر پوختەی تێڕوانینی مرۆڤێکە کە نالییە، بۆ مرۆڤ، بۆ سروشت، بۆ ئاژەڵ بۆ گەردوون. یەعنی وەختێك ئێمە ئەڵێین جیهانبینی شیعری نالی، کە ئەم جیهانبینییە زمانێکی هەڵبژاردووە کە زمانی شیعرە و ئەم شیعرە لەهەمانکاتدا هەڵگری تێڕوانینێکی بەرفراوانە بۆ ئەو رەهەندانەی کە باسم کردن، هەربۆیەش دەتوانین ئێمە بڵێین جیهانبینی شیعری نالی و زەحمەتە بڵێین جیهانبینی شاعیرێکی دیکەی کلاسیکی کورد، چونکە ئەو جیهانبینیانە هەموویان ئاراستەك لە ئاراستەکانی تەسەووفو دەسەلاتی ئایینی یا دەسەلاتی کۆمەلایەتی یا دەسەلاتێکی رۆشنبیری زاڵە بەسەریاندا، بەلام لای نالی ئێمە جیهانبینییەکی سیستماتیك ئەبینینەوە کە تێڕوانینێکی تیایە، کە تەئەمولی تیایە دەربارەی ئینسان و بەرانبەر بەحەیوان، کە تەئەمولی تیایە بەرانبەر بە سروشت، تەئەمولی تیایە بەرانبەر گەردوونو دنیای میتافیزیکی، کەواتە ڕووبەڕوو بوونەوەمان لەبەردەم نالی دا ڕووبەڕووبوونەوەیەکە لەبەردەم جیهانبینییەکی شیعریدا.

خۆشبەختانە دەتوانین بڵێین بۆ یەکەمجارە، شیعر هەرتەنیا نابێتە رەنگدانەوەی حاڵەتێك لە حاڵەتەکانی مەسەلەن فەنای ئیلاهی یا نابێتە حاڵەتێك لە حاڵەتەکانی تەئسیرگوزاری بۆ کارەساتێکی کۆمەلایەتی، نابێتە رەنگدانەوەی لیقای مورید لەگەڵ شێخەکەیدا، بەڵکو شیعری نالی بریتییە ل تەئەمولکردنێکی سیستماتیکیانە لە کۆمەڵێ رەهەندی گەورە، کە ئەم رەهەندانە بە درێژایی مێژوو هەم خولیای فیکر، هەم خولیای فەلسەفەو شیعریش بوون. بە مەعنایەك نالی بەرجەستەکەری بیروڕایەکی بەرفراوان ترە لەو بیروڕایەی کە شاعیرانی هاوسەردەمی خۆی هەر لە شیعردا دەریان بڕیوە. ئەوان بیروڕاکەیان دواجار لە ئاستێکدا کۆتایی پێدێ و جڵەودەکرێ. بەلام نالی دەتوانین بڵێین بیروڕاکانی لە ئاستێکدا کۆتایی پێنایە، بەڵکو چەندین ئاست بەخۆیانەوە دەگرن.

بۆ دەربڕینی ئەم جیهانبینییە نالی پێویستی بە تێڕوانینە بەرانبەر بەزمان و ڕۆڵی زمان لە گەیاندنی ئەم جیهانەی ئێمەدا. ئەو زمانە بۆ نالی، لەبەرئەوەی نالی کەسێکە

هەوییەتی کوردبوونی خۆشی بەلاوە گرینگە، هۆشیاری ئەم شاعیرە ئەگاتە ئەوەی کە ئەبێ ئەم جیهانبینییە لەناو زمانێکدا بەرجەستەبێ کە زمانی ئەوە، کە نزیکترین پێکهاتەیە لە خودی خۆیەوە، ئەو دێڕە شیعرەی کە تیایدا هەم ئاماژە بە زمانو هەم ئاماژە بە هۆشیاری ئەو دەکا کە ئەو بۆ زمانی کوردی هەڵدەبژێرێ، هەم ئاماژە بە مانای جیهانبینی خۆی دەکا، رەنگبێ یەکێك بێ لەو بەڵگانەی کە ئەم بیروڕایەی ئێمەی لەسەر دروست دەکرێ ((کەس بە ئەشعارم نەڵێ خۆکوردییە، خۆکردییە)). هۆشیارییەکە ئالێرەدایە کە ئەو دەڵێ هەڵبژاردنم بۆ زمانی کوردی، (خۆکردییە). ئێمە وەختێك کارێکی خۆکردی دەکەین کە هوشیاریمان هەبێ بە گرینگیی ئەو کارە و مەبەستێکم هەبێ، کە ئەو مەبەستە ئەو خەونەی من بێنێتە دی کە هۆشیارییەکەم ئەیەوێ کاری بۆ بکا: (کەس بەئەشعارم نەڵێ خۆکوردییە)) یانی لە ئاستی کۆمەڵایەتیدا مەیهێننە خوارەوە. (خۆ) لە زمانی کوردیا شتێکە کە ئێمە بمانەوێ شتێکی پێ بێنینە خوارەوە ئەڵێین (جا خۆ ئەوە..) ئەم هاتووە ئەم دەربڕینە کۆمەڵایەتییە تەقلیلگەرایەی بەکارهێناوە بۆئەوەی بڵێ ئەوەی من ئەیکەم ئەوە نییە کە ئێوە بیری لێدەکەنەوە و مەبەستانە. رەنگە ئەو (ئێوە)یە ئێوەیەکی وەهمیش بێ، رەنگە ئەوە گوتاری نالی بێ بەرانبەر بەگوتاری سەردەستی عەرەبیو فارسی کە ئەو دوو زمانە هەردوکیان زاڵ بوون لەوکاتەی شیعری کوردیا و دەرچوون لە دوو گوتارە بە گوناه لێکداروەتەوە. نالی گوتویەتی ئەوەی من دەیکەم، (خۆ کردیە)، رێکەوت و قەدەر نییە، لە گەمژەیی و بێدەسەڵاتییەوە نییە، ئەمە زمانی شیعرە و ئەگەر کەسانێ ئەمانەی من بە شیعر نازانن، چونکە بە کوردین، نادانن، چونکە (هەرکەسێ نادان نەبێ خۆی تالیبی مەعنا ئەکا). کەواتە شیعر بەرجەستەکردنی مەعنایە، کە ئەمەش ئەو شتەیە من ناوی ئەنێم جیهانبینی شیعری نالی، کە هەڵگری رامانێکی فراوان و قووڵە بۆ ئەو رەهەندانەی کە پێشتر باسمکردن.

خەسڵەتێکی دیکەی زمانی کوردی بۆ نالی ئەوەیە کە نالی کەسێکە لەخەمی ئەوەشدایە زمان بەرلەوەی کۆڵەیەکی سەلماندنی (ناسیۆنالیزم) و (قەوم مەداری) بێ، ئەو لەزمانی کوردی ئەو رەکیزەیە دروست دەکا کە ئێمە پێویستمان پێیەتی بۆ

پێناسەکردنی روانگەی ناسیۆنالیستیانە. کەواتە ئەمە حەساسیەتی شاعیرێکە بەرانبەر بە زمانێك کە تا ئەو کاتە زمانی رۆژانەییە و مەسرەفکراوە و هێشتا زمانی نوسراو و ستاندارد نییە، ئەمە جگە لەوەی کە نالی کەسێکە ئەیەوێ بمێنێتەوە، نالی کەسێکە نایەوێ ماوەی ژیانی شیعریی ئەو یەکسان بێ بە ماوەی ژیانی مەتریالیانەی ئەو، یا ژیانی جەستەییانەی ئەو. نالی وەك مرۆڤێکی هۆشیار دەزانێ لە تەمەنێکدا لەدایك بووەو لەتەمەنێك کۆتایی پێدێ، بەلاَم ئەو نایەوێ تەمەنی شیعریش هەمان مەودا وەربگرێ. ئەیەوێ تەمەنی شیعری زیاتر ریشەدار بێ زیاتریش بمێنێتەوە، بۆیە لەزمانی کوردی پانتاییەك دروستدەکا کە مانەوەی ئەو دەستەبەر بکا لەناو مێژووی ئایندەدا. بەلگەشمان ئەوەیە کەشیعری نالی راستە لەناو ئەو چوارچێوە زمانییەدا لەدایك دەبێ کە شیعری عەرەبیو فارسی پێ نووسراوە، بەلاَم شیعری نالی تا دێتە سەر هەر روونتر ئەبێتەوە، یەعنی زیاتر ئارایشێك بەخۆیەوە دەگرێ کە لەسەر بنەمای تواناکانی زمانی کوردی دروست بووە، نەك لاساییکردنەوەی توانای زمانە زاڵەکان لە نووسینی شیعردا. بەم پێیەش شیعری نالی بە مانا یۆنانییەکە، نە میمیسیسە و نە تەخنەیە، بە لَکو پۆیسیس و داهێنانە لە نەبوونەوە بۆ بوون و ئەمەش وادەکا کە شیعری نالی رەنگدانەوە نەبێت، بەلْکو ئەفراندن بێت: (کانی دەزێن بە ئاوو درەخت ئاوسن بەبا، شایی بەهارە، بولبولە داماد و غونچە بووك). سەیری ئەم پاقژبوونەوەی زمانە لەچاو هەندێك شیعری دیکەیدا، سەیری ئەم شەفاف بوونە کە لەهەمان کاتیشدا هەلگری خەسلەتەکانی ئەو جیهانبینییەیە کە باسمکرد. پێموایە جیهانبینی لەوێدا ئەبێتە جیهانبینی کە شەفافیەتی خۆی هەبێو ئەم شەفافیەتە بتوانێ تەعبیرێکی زمانی بۆ خۆی بدۆزێتەوە.، کاتێدەلێین نالی یەکێکە لەو کەسانەی دەتوانین لە ئەنجامی قسەکردنمانەوە لەسەری باس لە زۆر شتی دیکە بکەین، باس لە دروستکردنی ناسنامەیەکی نەتەوەیی بکەین کە شیعر بناخەکەی بێ، باس لە ستایشکردنی سروشتو بوونەوەرەکانی سروشت بکەین، باس لە حەساسیەتی شاعیرێك بکەین کە لەیەك کاتدا نەك غەمی خۆی دەخوا بەلْکو غەمی هەموو ئینسانێ دەخوا و هتد.، جا پێموایە ئەوە ئەو ئەنگێزانە بن کە ئەشێ شاعیرێکی وەکو نالیان

هان دابیّ بۆئەوەی ئاوڕ لە زمانی کوردی بداتەوەو زمانی کوردی بکاتە سەنگەری مانەوەی شیعریانەی خۆی. لەکاتێکا ئێمە ئەزانین نالی وەك شاعیرێك باش هۆشیار بووە بەرانبەر بە مەرگی خۆی، بەلاّم بەرانبەر بەشیعری خۆی ویستویەتی ئەو مانەوەیە دەستەبەر بکاو هەر ئەم دەقانەیشن کە بوونەتە سەرچاوەیەك بۆ ئێمە تاکو بتوانین باس لە هەڵێنجانەوەی جیهانبینییەك بکەین کە بەجیهانبینی شیعری نالی بەناوبانگە.

یەعقووبی: فۆکۆ باسی دوو جۆر (مـن) دەکات. دوو جۆر مـن لـە یەکتری جیاواز دەکات، منێکی دیکارتی کە منێکە نامێـژوویی منێکە دەیهەویّ زیهنیەتی خۆی لەدیاردەکانی دەرەوە بەشتێکی جیاوازو جودا بزانیّ، و منێکی (کانتی) کە منێکی مێژووییە، منێکە کە تێکەڵ ڕوداوەکانی دەوروبەری خۆیەتی، منێکە کە لەنێو جەنگەی ساتەوەختی ئێستایدا دەژی. ئەگەر لەڕێگای ئەو پۆلێن بەندییەوە خۆمان بەناو جیهانی شیعری نالیدا بکەین، دەبینین نالی بە پێچەوانەی زۆر شاعیری کلاسیکیو بەپێچەوانەی دیدی زاڵی شیعری کلاسیکی زۆرجار خۆی لەئاست ڕووداوە مێژووییەکانی سەردەمی خۆی نەبان نەکردووە، بۆنموونە بۆ من ئەمە پرسیارێکی گرینگە کە چۆنە شاعیرێکی کلاسیکی وەکو نالی دنیای شیعرەکانی بەر لە غوربەتیو دوای غوربەتی زۆر جیاوازن، چۆنە نالی کاتیّ کە غوربەتێکی مێژوویی بەسەردا دێتو ناچارە ولاّتی خۆی بە جیّ بێڵێت وەك شاعیرێکی کلاسیکی لەبەرانبەر ئەم غوربەتە مێژووییەدا هەڵوێست ئەگرێتو قەسیدەی (قوربانی تۆزی ڕێگەتم) ئەنووسیّ؟ ئەمە پرسیارێکی گرینگە، کەچی تۆ ئەبینی لەشیعری شاعیرانی بالاّدەستی کلاسیکی فارسیدا کە دیارە نالی عەرووزەکەو قاڵبەکەو قافیەکەی لەوان وەرگرتووە ئەم دیدە نابیندریّ بۆ وێنە حافیز وەك بالاّدەست ترین شاعیری کلاسیکی فارسی بەردەوام باس لەمنێك ئەکا کە ئەو منە منێکی ئەزەلییە، بە وتەیەکی هەمان منی دیکارتی نامێژووییە: (من ملك بودمو فردوس برین جایم بود – ادم اورد در این دیر خراب ابادم) تەواوی هەوڵەکانی حافیز بۆ گەڕاندنەوەی شانو شکۆو گەورەیی منی مرۆڤە بۆ ئەو منە ئەزەلییە، گەڕاندنەوەی شوێنی مرۆڤە بۆ ئەو شوێنە ئەزەلییەکە بەهەشت

بێ، ئەمە بەڕای جەنابت چ پێناسەیەك وەردەگرێ لە شیعری نالیدا كە نالی ویستوویەتی وەك شاعیرێكی كلاسیكی لەناو بارودۆخی مێژووییدا بمێنێتەوەو ئایا ئەوە نابێ بەبەڵگەی ئەوەی كە لەئاستی گوتاردا نالی داماوو، یان بابڵێین وابەستەی گوتاری شیعری كلاسیكی نەبووە بەڵكو بۆ خۆی بەرهەمهێنەری جۆرە گوتارێكی تایبەت بووە لە قۆناغی شیعری كلاسیكی كوردیدا.

سیوەیلی: ئەو ناسنامە چەند پارەیەی كە پێشتر باسمان لێوە كرد، وتمان ئەو ناسنامەیە (ئەوی تر) بەئێمەی بەخشیوەو دواجار ئێمە قەبوڵمان كردووە، لەڕەخنەی تەقلیدی ئێمەشدا رەنگدانەوەی خۆی هەبووە، بەو مانایەی كە رەخنەی تەقلیدی ئێمە هەمیشە باوكی مەعریفی بۆ شاعیرە گەورەكانی وەكو نالی دروست كردووە. هەمیشە تەسلیم بووە، یەعنی لە پێشەوە تەسلیم بووە كە نالی وەك شاعیرێكی كورد لە سێبەری شاعیرێكی فارسی وەكو حافزدایە. من پێموایە ئەمەش دیسان هەمان خۆبەكەم زانینی مێژووییەی كوردە لەئاست ئەوانی تردا. ئێمە لەیەك كاتدا كە شتی هاوبەش زۆرە لەنێوان نالیو شاعیرە كلاسیكە مەزنەكانی ئەدەبیاتی خۆرهەڵاتدا بەڵام جیاوازیش هەیە، ئەم جیاوازییە نابێ لەبەرئەوەی هەموویان لەمەنزوومەیەكی ئیسلامیدا یا لەڕووی تەكنیكییەوە هەمان تەكنیكیان بەكارهێناوە فەرامۆش بكەینو لەپێش چاوی نەگرین. نالی وەك شاعیرێك وەك تاكە كەسێك وەك كوردێك، تایبەتمەندی سەربەخۆی خۆی هەیە كە جیای دەكاتەوە لە شیعری شاعیرانی دیكەی خۆرهەلات، بەڵێ نالی خوێندەوارێكی باشی شیعری پێش خۆی بووەو ئەمەش رەنگدانەوەی هەیە لەهەموو ئەو تەكنیكە بەرزەی لەشیعری نالیا، بەرز لەچوارچێوە كلاسیكیەكەیدا، بەلام لە هەمان كاتیشدا نالی سەربەخۆیی خۆی پاراستووە هەروەكو چۆن هەندێ لە شاعیرانی دیكەی ئێمەش سەربەخۆیی خۆیان پاراستووە، كەواتە پێبەخشینی باوكێكی شیعری بەنالیو قەتیسكردنی لە چوارچێوەی سێبەری شاعیرێكی وەك حافیزدا جگە لەو خۆ بەكەم زانینەی كە رەخنەگرە سوننەتیەكانی ئێمە پێوەی موبتەلا بوون هیچ شتێكی ترمان پێ نادات. بۆئەوەی خۆمان لەو بەكەمزانینە رزگار بكەینو بۆئەوەی گرینگی نالی لەچوار چێوەی شیعری

کلاسیکیماندا بەو خسوسیاتانەی کە جیای دەکاتەوە لە شاعیرانی دیکەی کلاسیکی خۆرهەلاتی ناوەڕاست، ئەبێ خۆمان لەودیدە رزگار بکەین بەوەی کەبێین دەقی نالی نەك بەبەراورد بەو شاعیرانە بەڵکو لەخۆیدا تەماشا بکەین.

یەکێك لەو خاڵە جیاوازییانەی کە جەنابت ئاماژەت پێدا ئەوەیە کە نالی کەسێکە پێیەکی لە خاکداو پێیەکی لەسەر عەردی شوێنی ژیانی مرۆڤەکان چەقیوەو هەندێ جاریش لەهەندێ لە قەسیدەکانیدا، یان بە شێوەیەکی گشتیتر بڵێم: چونکە ئەو مرۆڤێکی ئایینیە، مەلایەکە، شێوەی بیرکردنەوەی ئایینی زاڵە بە سەر شیعرەکانیا، بەلام ئایین نەبۆتە هۆی ئەوەی دەستنیشانی جیهانبینی شیعری ئەو بکا. ئەو تەنیا هەر قەسیدەی ئایینی نەگوتووە بگرە ئەو زۆربەی شیعرەکانی هەڵوێستگرتنێکی ئاشکران لەو زەمەن‌و زەمانەی کە تێیدا ژیاوەو تاڕادەیەکی زۆریش ئەمەی وەك پەرچەکردارێکی ناڕەزاییانە بەکارهێناوەو شیعری کردۆتە ئەو پانتاییەی کە تیایدا ناڕەزایەتی ڕەخنەگرانەی نالی رەنگیداوەتەوە بەرامبەر بەو ڕووداوانەی کە ڕوویانداوە.

قەسیدەی (قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خۆش مرور) لەڕاستیدا هەر قەسیدەیەك نییە کە تیایدا سکاڵای نالی یا نوستالیژیای نالی ڕەنگیدابێتەوە، بەقەدەر ئەوەی ئەو قەسیدەیە مەحکوومکردنی کردەوەی ئەویتریشە.. نالی پرسیار دەکا لەوەی کە ئایا چی ڕوویداوە دوای کۆچی ئەو، دوای جێهێشتنی ئەو شوێنانەی کە ئەو جێی هێشتوون، یا بەشێوەیەکی سروشتی جێی هێشتوون. ئەو حوزورێکی زیهنی زۆر ڕوونی هەیە لەسەر هەر یەکێك لەو شوێنانە، بەلام بوونی بێگانەو داگیرکردنی ئەو شوێنانە لەلایەن ئەویترەوە وا لە نالی ئەکا کە گومانەکانی خۆی لە کردەوەی بێگانە، لە شیعرەکەدا بەرجەستە ببێ، یانی نالی چاوەڕوانییەکی لە (رۆمییەکان) یا لەهێزی داگیرکەر نییە کە بێ زیاتر ئاوەدانی بەشارو زێدو نیشتمانی ئەو ببەخشێ، بەڵکو هەمیشە لە قەسیدەکانیدا جارێك ئەمانگێڕێتەوە بەر یادەوەری خۆی کە تێیدا هەم گەنجییەتی خۆشی بەیان ئەکاو هەم ڕوونی‌و ئاشکرایی ئەو مەوقعییەتە مێژووییانەش دەگێڕێتەوە، کەچی لەدێری دووهەم بەپێی ئامادەیی زەینیی من لەنێو بەیتی دوەمی هەموو ئەو قەسیدەیەدا هەم پیری خۆیمان بەیاد دێنێتەوە کە ئێستای نالییەو هەم

بەدگومانی خۆی یا گومانی خۆشیمان بەرانبەر بە کردەوەی بێگانە وەختێک ولآتەکەمانی داگیرکردووە بۆ ئاشکرا دەکەن. ئا ئەو گومانکردنە بۆ خۆی هەڵگری دیدێکی رەخنە ئامێزی نالییە بەرامبەر بەوەی ئەوانی تر چییان لەئێمە دەوێ، نالی نەهاتووە بڵێ ئەرێ فلان مزگەوتیان بەرزکردەوە ئەرێ فلآن باخچەیان دروستکرد، نەخێر ئەڵێ ئەو باخچەی کە هەبوو وێرانیان کرد، کەواتە چاوەڕوانی نالی لە ئەویتر ئەو چاوەڕوانییە بوو، ئەمەش هەڵوێست گرتنێکی زۆر جیدییە لەو گۆڕانکارییانەی کە لەو کاتەدا ڕوویانداوە. ئەمە یەك شتیشمان پێدەڵێ: کە ئێمە لە نووسینەوەی مێژووماندا مەرج نییە هەر تەنیا پشت بەو مەتریالآنە ببەستین کە لەسەر مێژوو حیسابن بەڵکو ئەکرێ لەمیانەی خوێندنەوەیەکی جیدیو وریایانەماندا بۆ شیعریش، بەشێك لە مێژووی خۆمانی لێهەڵێنجین. لە هەڵوێستگرتنی نالی لە ئاست تێڕوانینی مرۆڤی کورد بەرامبەر بە بێگانە کاتێ ولآتەکەت لێداگیر دەکا، دەتوانی زۆر شت وەرگری. کەواتە گوتاری نالی گوتارێکە تیایدا ئەو جیاوازبوونی خۆی لە ئەویتر بەرجەستە ئەکاو بەرەنگاریی خۆی بەرانبەر بە ئەویترو کردەوەکانی ئەویتر تێیدا ڕوون دەکاتەوە. نالی بەم مەعنایە میراتێکیش بۆ ئێمە بەجێ ئەهێڵێ. میراتێك کە جیایە لەو میراتەی لە سەردەمی نالی وپێش نالیا هەبووە، سەردەمی نالی تەسلیم بوون بووە بە گووتاری ئەوی تر، لەکاتێکدا نالی دەیەوێت جۆرێك لە جیاوازی بەرقەرارکا لەبەینی خۆیو ئەوی تر، ئا ئەمەگرینگی نالیەو ئینسان گەراییو مرۆڤدۆستی نالی ئەلێرەدا دەرئەکەوێ. بەبێ ئەوەی تەمایوز بێتە هۆی رق بوونەوە لە ئەوی دیکە، بەبێ ئەوەی جیاوازی ببێتە هۆی سرینەوەی ئەوی تر، بەبێ ئەوەی دروست کردنی خاڵی جیاوازی بەمانای سرینەوەی خاڵە هاوبەشەکان بێ لە بەینی نالی وەك کوردێك و ئەوانی تر وەك غەیرەکان. هەرئەم خەسڵەتەشە لە شیعر و جیهانبینی نالیدا وای لێدەکات کە تەنیا هەر نەبێ بە بەشێك لە مێژووی ئەدەبی ئێمە، بەڵکو ببێت لە مێژووی ویژدانی ئێمە. نالی میراتێکی بۆ بەجێ هێشتوین یا خەزێنەیەکی بۆ داناوین، ئەوە ئێمەین چەند دەتوانین بەهرە لەم خەزێنەیە وەربگرین بەبێ ئەوەی

تەقدیسی بکەین. نالی پێویستی بە پیرۆزکردن نیە بەقەدەر ئەوەی پێویستی بە ئەوە هەیە تێی بگەین. ئەرکی ئەوەی ئێمەیە کە بەوشێوە تەماشای نالی بکا.

**یەعقووبی:** لەدوابەشی ئەو ووتووێژەدا گەلێك سوپاسی رۆشەنبیرو نووسەری کوردستان ئەکەم، کاك رێبوار سیوەیلی خۆشەویست کە زەحمەتی قبوڵکردو وەڵامی پرسیارەکانی داوە. کاك رێبوار گەلێك گەلێك سوپاس.

**سیوەیلی:** زۆر سوپاس، زۆر خۆشحاڵ بووم کە جگە لەوەی نووسینو بەرهەمی هەندێك لەو قەڵەمە جیدیانەی ئەم دیو ئەخوێنمەوە، بەڵام هەر بینینتان لەنزیکەوە جێی شانازییە، زۆر سوپاس.

# پەیوەندیی ڕۆشنبیر،
# دەسەڵات و ڕاگەیاندن

## گفتوگۆی: بێستوون نووری

{پەیوەندیی ڕۆشنبیر و دەسەڵات لە کوردستاندا. هەڵوێستی ڕۆشنبیران بەرامبەر دەسەڵات و هەڵوێستی دەسەڵات بەرامبەر ڕۆشنبیران. ڕاگەیاندنی حیزبی لە کوردستان و ڕۆڵی ئیعلامییە حزبییەکان بەرامبەر دەستەبژێری ڕۆشنبیران و بەربەست دروستکردن بۆیان. دابڕانی ڕۆشنبیران و حکومەت و حکومەت و هاوڵاتیان..}

**بێستوون: هەموو ئەو بیر و بۆچوونانەی لەبارەی پەیوەندیی نێوان ڕۆشنبیر و دەسەڵات دەخرێنە ڕوو، لە دوو ئاراستەدا چڕ دەکرێنەوە. ئاراستەی یەکەمیان پێی وایە کە ڕۆشنبیر دەبێ لە دەرەوەی دەسەڵات پرۆژەکانی تەرح بکا و کاری بۆ بکات، ئاراستەی دووەم باوەڕی وایە کە ڕۆشنبیر دەکرێ لە نێو دەسەڵات و حزبیشدا بێت و بە پاڵپشتی حزب و دەسەڵات کار بۆ پرۆژەکانی بکا. ئایا لە کوردستان چەند زەمینە لەبار بووە تاوەکو ڕۆشنبیر بتوانێ بەسەربەخۆیی پرۆژەکانی خۆی پێشکەش بکا؟**

ڕێبوار: من نامەوێ لە گفتوگۆیەکی ئاوادا، بچمە ناو کێشە تیۆرییەکانی پەیوەندیی نێوان دەسەڵات و ڕۆشنبیر، چونکە جگە لەو دوو ئاراستەیەی ئێوە دەفەرموون، بیروڕای دیکەش سەبارەت بەو پەیوەندییە هەیە. بەڵام هەوڵدەدەم ئەوەندەی پەیوەندیی بەدۆخی کوردستانی خۆمانەوە هەبێت وەڵامتان بدەمەوە. لە ڕاستیدا

ئەوەی ئێمە بە دەسەڵاتی کوردی ناوی دەبەین، تا ئەم ساتەوەختەش هیچ پێناسەیەکی ئەوتۆی بۆ ڕۆشنبیر نییە جگە لەوەی کە گوێی لەم زاراوەیە دەبێ، لە زەینی خۆیدا مرۆڤێکی گێرەشێوێن، ڕەخنەگر و دووڕووی دژ بە بەرژەوەندییە حیزبی و حکومییەکانی بیر دەکەوێتەوە، کە پێیوایە هیچ لە سیاسەت نازانێ و بارودۆخ و «بەرژەوەندیی بزوتنەوەی سیاسی لەبەر چاو ناگرێ» و بەئارەزووی خۆی قسان دەکا. بەشێکی ئەم تێگەیشتنە لە ڕۆشنبیر دەلالەت لە هەژارییەکی فیکری دەکات کە زۆربەی ئەوانەی لە کایەی سیاسیی کوردیدا کار دەکەن، هەم بەرامبەر بە بنەما تیۆرییەکانی سیاسەت و هەم بەرامبەر بە ڕۆڵی ڕۆشنبیران لە سیاسەتدا، دووچاری بوون. بەڵام بەشێکیشی پەیوەندیی بەو کەسایەتییەوە هەیە کە بەڕاستی مرۆڤێکی دوو ڕوو و مەراییکەرە و هێندەی لەخەمی ئەوەدایە ناوی خۆی وەك ڕۆشنبیر بنووسێ تا «ڕۆشنبیرانە» وەربگرێ، یان لەبەردەم سکرتێری فلان و فیسارە بەرپرسدا مەرایی بکا و خەریکی بازبازێنی حیزبی بێت، ئەوەندە خولیای تێگەیشتن و قسەکردن و هەڵوێست وەرگرتنی لەسەر مەسەلەکان نییە. بۆیە دەسەڵات نەك هەر پێویستی بەمجۆرە کەسایەتیە نییە و دەشزانێ هیچ پرۆژەی پێ نییە، بەڵکو باشیش دەزانێت چۆن بە سووکە پەیمان و مانگانە بۆبڕینەوەیەك ڕازیی بکا، یاخود ئەگەر کار گەیشتە ئەوە، بە دوو هەڕەشە بێدەنگی بکا. زۆر لەو وتارانەش کە بەناوی سیاسی و سکرتێرەکانیشیانەوە بڵاو دەبنەوە، ئەو جۆرە ڕۆشنبیرانە دەیاننووسن. بەکورتی ئەمە بارودۆخی هەنووکەیی ڕۆشنبیر و پەیوەندیی نێوان زۆرینەی ڕۆشنبیر و سیاسییە لەم کۆمەڵگایەدا. بۆیە من لەلایەکەوە هەوڵدانی سیاسیانە دەبینم کە نایەوێت ڕۆشنبیر وەکخۆی هەبێت و خاوەنی پرۆژە بێت، لەلایەکی تریشەوە بە لێشاو ڕۆشنبیر دەبینم کە هیچ پەیوەندییەکی تری بە سیاسییەوە نییە جگە لە ملکەچی و بێزمانی و شەرمنی زیاتر. لەم نێوانەشدا شوێنێ بۆ پرۆژەی سەربەخۆ و پەیوەندی نامێنێتەوە و هەموو پرۆژەکان دەکەونە بەردەم چاودێریکردنی سیاسیانە.

هەڵبەت من ئەوە بە پەیوەندیی نازانم و پێموایە ڕۆشنبیر و سیاسی دەتوانن پەیوەندییان لەسەر بنەمایەکی ڕێزدارانەی مرۆڤانەوە هەبێت، کە بتوانن بیروڕای تیا

بگۆڕنەوە، یەکتر بەئاگا بهێننەوە و لەسەر مەسەلەی هەستیار و گرنگی هاوبەش، پێکەوە قسان بکەن و پڕۆژەی هاوبەشیشیان هەبێ و هیچکامێکیشیان دەست لە مەرجەکانی خۆی لەبەرامبەر ئەویتردا هەڵنەگرێت. بەڵام ئەوەی چاوەڕوانیمان هەبێت کە سیاسییەکان گوێڕایەڵی ڕۆشنبیرەکان بن، ئەوە بە هەڵەدا چووین، چونکە ئەوان لە دوو گۆشە نیگای جیاوازەوە تەماشای مەسەلەکان دەکەن کە دەیانگەیەنێ بە بەرژەوەندیی جیاواز و ئەمەش بڕیاری جیاوازیان پێدەدات کە زۆرجار یەکناگرنەوە. بۆیە پێویستە ئەو ململانێیەی نێوان سیاسی و ڕۆشنبیر هەر بمێنێ، بەمەرجێ ئەمە نەبێتە هۆی دابڕان و خۆشاردنەوەیان لە یەکتر و بێڕێزیکردنیان بە کەسایەتی یەکتر.

**لە وڵاتێکدا ئەگەر ڕۆشنبیرەکان لە سیاسییەکان ڕازیی بوون ئەوە بەمانای ئەوەیە دیکتاتۆریەت هەیە و ئەگەر سیاسییەکانیش ستایشی ڕۆشنبیرەکانیان کرد، ئەوە فاتیحە بۆ ئەو ڕۆشنبیرانە بخوێنە.** من هەروەك چۆن دژی خۆشاردنەوەی سیاسییەکانم لە ڕۆشنبیرە جیدییەکان و دەرگا داخستن بە ڕوویاندا و بە چاوی نزم تەماشاکردن، بێکارکردن و بێحورمەتیکردن بەهەموو خاوەن هزر و قەڵەمێك ڕەتدەکەمەوە، ئاواش دژی ئەو ڕۆشنبیرانەم کە بەهەر دوو دەست لە سیاسییەکان دەخۆن و کەچی لە چایخانە و مەیخانەکاندا سەر دەنێن بە سەری یەکترەوە و لێمان دەبنە گیڤارا، تیۆریزەکەر و ڕەخنەگر و لە قسە و قسەلۆك و هەناسەی قووڵ هەڵکێشانیش زیاتر مەراقی تریان نییە.

**بێستوون: ئایا ئەم قسانە لە ئەزموونی تایبەتییەوە دەکەیت، مەبەستم ئەوەیە تۆ بۆخۆت پەیوەندیت لەگەڵ سیاسییەکاندا چۆنە و ئایا هەرگیز پڕۆژەیەکت پێشکەشکردووە تا سیاسییەکان پەسەند یان ڕەتیان کردبێتەوە؟**

ڕێبوار: پەیوەندیی من بە کەسایەتییە سیاسییە خاوەن بڕیارەکانەوە هەمیشە لە چوارچێوەیەکی ڕێزدارانە و ڕەخنەگرانەدا بووە و هەیە، چ بە نووسین و چ بە چاو پێکەوتن و دانیشتنی دوورودرێژ. تا ڕادەیەکی زۆریش گوێ بۆ قسەکانم گیراوە بەبێ ئەوەی ڕەنگدانەوەی هەموویان لەبواری پراکتیکیدا ببینمەوە. هیچ نەبێ تا ئێستا هیچکامێ لەو کەسایەتیە سیاسیانەی لە کات و بۆنەی جۆربەجۆردا بینیومن و

دەيانبينم، لەسەر بيروڕايەك كە دژيان بووبێت و ڕەخنەی توندیش بوبێت لە سیاسەتیان، گلەییان لێنەكردووم یاخود هەڵوێستی توندیان بەرامبەر نەنواندووم و تەنانەت وەك مامۆستایەكی زانكۆ هاوكار و پشتیوانم بوون و زۆر ڕێزیشیان لێگرتووم. ئەوە ئەخلاقی من نییە ئەگەر كەسێ تەكلیفی نەشكاندم و لەسەر قسەی من یارمەتی بۆ خێزانێك نارد، پرۆژەی كارەبای گوندێكی جێبەجێكرد، چەند قوتابییەكی ناردە دەرەوەی وڵات و دەستگیرۆیی هاتنەوەی ڕۆشنبیرێكی هەندەرانی گرتە ئەستۆی خۆی و مەسرەفی تەعزیەی خێزانە شەهیدێكی كرد، نەخۆشێكی بۆچارەسەر ناردە دەرەوە، ڕۆژنامەنووسێكی لە زیندان ڕزگار كرد و دەیان شتی تر..، بیشارمەوە و شەرم بكەم لە باسكردنی. لەگەڵ ئەوەشدا كە دڵنیام هەندێ لە بیروڕایەكانی من سیاسییەكانی تووڕە كردووە، بەڵام كەسیان هیچیان بە چاودا نەداومەتەوە، تەنیا لە مەسەلەی ئەو وتارەدا نەبێت كە لەسەر بڕانی كارەبای دووكان لەسەر هەولێر بڵاومكردەوە و چەند كەسێكی لە هەردوولا بۆ ماوەیەكی دوورودرێژ لێ تۆراندم. سیاسەتی ئەوان ئەوەیە هەندێجار گوێدەگرن و بەشێوەیەكیش گوێدەگرن كە مرۆڤ بۆ ساتەوەختێ وا هەست بكا بەگوێی دەكەن، بەڵام دواجار بەشێكی تری ئەو سیاسەتە ئەوەیە كە نایەوێت، یان ناهێڵن بەگوێت بكەن. لەگەڵ ئەوانەشدا من بەگشتی لە پەیوەندیی سیاسیەكان و ڕۆشنبیرانی كورد ڕازیی نیم و پێموایە پێویستە ئەوان هەنگاوی تر بنێن بۆ پتەوكردنی ئەو پەیوەندییە و پێویستە ئەو هەنگاوەش لە سیاسییەكانەوە بێت. لەلایەكەوە پێویستە سیاسییەكان وێنای خۆیان لەسەر ڕۆشنبیر بگۆڕن و هەر چاوەڕوانیی ئەوەی لێنەكەن ستاییشی خۆیان و كارەكانیان بكا، لەلایەكی تریشەوە پێویستە ڕۆشنبیر بە هەمان نیگا تەماشای سیاسییەكانی خۆمان نەكات كە تەماشای داگیركەرانی پێدەكات. من وێڕای هەموو ڕەخنەیەكم لە سیاسییەكانی كورد و ناكۆكیم لە بیروڕادا، وێڕای ئەوەی ڕەسمی هیچكامێكیانم بە دیواری ماڵ و شوێنی كاركردنمدا هەڵنەواسیوە و هەڵیناواسم، بەڵام بەراووردیشیان ناكەم بە بێگانە و لەبەردەم نەیارانیشدا نایان شكێنمەوە. ئەمە پەیوەندیی شەخسیی و كۆمەڵایەتی و ئینسانیانەی منە بە كەسایەتییە سیاسییەكانەوە و هیچ پەیوەست

نییە بە تێڕوانینی فیکریی منەوە بۆ سیاسەتی ئەوان. ئەمەش هەمان پەیوەندیی منە بە هەر مرۆڤێکی ترەوە لەم دنیایەدا، جا لەهەر پلە و پایەیەکدا بێت و لە هەر کایەیەکدا کار بکات.

سەبارەت بە پڕۆژە پێشکەشکردنیش، دەبێت بڵێم: تا ئێستا لەگەڵ چەند مامۆستای زانکۆ و ڕۆشنبیر کۆمەڵێ پڕۆژەی گەورەمان پێشکەش بە سەرۆکایەتی حکومەت کردووە، بەڵام هیچکامیان جێبەجێ نەکراون و هیچ وەڵامێکی ڕەسمیشمان وەرنەگرتووە جگە لەوەی گوتویانە پڕۆژەکان شتی باشن و لەبەرژەوەندیی کۆمەڵگادان و پێویستە جێبەجێ بکرێن. بۆ نمونە ئێمە ماوەی چوار ساڵە پڕۆژەیەکمان پێشکەش بە سەرۆکی حکومەت کردووە بۆ کردنەوەی «سەنتەری توێژینەوە لە ژیانی ڕۆژانە» و تەنانەت فەرمانی وەزارییشی دەرچووە و کار گەیشتە ئەوەی بینایەی بۆ تەرخان بکرێ، کەچی لەپڕ و بەهۆی دەستێوەردانی لاوەکی و قەیرانی ماڵییەوە و بەبێ ڕوونکردنەوەی ڕەسمیی وەستێنرا. کاتێکیش بارودۆخی ئابووری باش بۆوە، کەس لەو ڕووەوە بە پیرمانەوە نەهات. ئەمساڵیش لەدوای کارەساتی یەکی شوبات و بۆ کەمکردنەوەی ئەو شلووقییەی هێزەکانی ئاسایش لەشاری هەولێردا دروستیانکردووە، بە سەرپەرشتی سەرۆکایەتی زانکۆی سەلاحەدین و بەشداریی وەزارەتەکان، لەوانەش وەزارەتی ناوخۆ، پڕۆژەیەکمان پێشکەش کردن تا مەسەلەی ئاسایش لە هەولێردا بچێتە چوارچێوەیەکی مەدەنیانەوە. بەڵام ئەمەش پشتگوێ خرا و هیچ ڕەنگدانەوەیەکیمان نەبینی، کە لە ڕاستیدا ئەنجامی ماندووبوونی مانگ و نیوێکی کارکردنی بەردەوامی کۆمەڵێ مامۆستا و ڕۆشنبیر بوو. ئەمانە و دەیان پێشنیاری دیراسەکراوی تر سەبارەت بە بارودۆخی ئافرەتان، گەنجەکان، ڕاگەیاندن، پەروەردە و زانکۆ، بەبێ ئەوەی هیچ ئاکامێکی کۆنکرێتییان هەبووبێ.

**بێستوون: ئایا ئەم هەڵوێستانەی دەسەڵات سارديان نەکردویتەوە و نائومێد نەبوویت؟**

ڕێبوار: مەرج نییە مرۆڤ هەمووکاتێ بە کۆی ئەو دەستکەوتانە بگات کە هەوڵیان بۆ دەدات و هەمیشە خواست و ئاواتەکانیش زیاترن لە ئەنجامدراوەکان. گرنگ ئەوەیە

توانای ئەوەمان هەبێ نرخ بۆ ئەو دەستکەوتانە دابنێین کە تا ئێستا بەدەستمان هێناون، نەك بەچاوی نزم و کەمبایەخ تەماشایان بکەین. زۆرکەس لە بارودۆخی وەکئەوەی کوردستاندا ڕێگا ئاسان و حازر بەدەستەکان هەڵدەبژێرێ، یان کۆڵ دەدات، یاخود خۆی لەگەڵ دەسەڵاتدا دەگونجێنێ و لە یەکێ لە فیرقەکانی مەدح و سەنای حیزبدا دەبێتە ئەندام و عاقڵ دەبێ. من حەزم لەوەیە برێ ***کێلانە*** و ***مارومـاجانە***، کار بکەم و لەمەشدا ماندوو دەبم. بەڵام نائومێد نابم، تەنانەت ئەو کاتەی دوو ساڵ لەمەوپێش بەڕەسمیی و لە تەلەفۆنێکدا ئاگادار کرامەوە کە ئەم وڵاتە بەجێ بهێڵم، هەر نائومێد نەبووم.

**بێستوون: لەپاش ڕاپەرینەوە، بەتایبەتی لەم دواییانەدا کۆمەڵێك پرسی چارەنووسسازی پەیوەند بە کورد بڕیاری لەسەر درا، بەڵام بۆ هیچ یەك لە مانە ڕۆشنبیر پرس و ڕای پێ نەکرا، یاخود ئاگاداریان نەبوو.. ئایا دەسەڵات نایەوێ ڕۆشنبیران لە مەسەلە چارەنووسسازەکاندا دەنگیان هەبێ، یاخود ڕۆشنبیران خەمساردن..؟**

ڕێبوار: هەروەك لە وەڵامی پرسیاری پێشووتردا ئاماژەم پێدا، ئەوەی ئێمە پێیدەڵێین دەسەڵات، تێگەیشتنێکی تایبەت و ستانداردی نییە بۆ ڕۆڵی ڕۆشنبیر لەم وڵاتەدا و ئەسڵەن هەندێك لە دەسەڵاتدارەکانیش بەشێوەیەکی گشتی بەچاوێکی نزم تەماشای ئەهلی قەڵەم دەکەن. هەندێجار کە لێرە و لەوێ دەبینین سیاسییەکان لەگەڵ دەستەیەکی تایبەتدا لە ڕۆشنبیران کۆدەبنەوە، ئەمە زیاتر لە نومایشێکی پێشتر پرۆڤە لەسەر کراو دەچێ تا لە پرس و ڕا پێکردن. ڕەنگە جار و بار هەندێ لە یاساناس و لایەنە پسپۆڕییەکان ڕاوێژێکیان بۆ مەسەلەیەك پێبکرێ تا سیاسی لەو هەڵە یاساییانە دوور بخەنەوە کە بۆی هەیە دووچاریان ببێ، بەڵام ئەمەش لە بڕوایەکی تەواو بە پرۆسەی ڕاوێژکردنەوە نەهاتووە. ئەو ڕۆشنبیرانەش کە جاروبار لەگەڵ بەرپرسەکاندا دادەنیشن، بەهۆی لیستێکەوەیە کە پێشتر ئامادەکراوە و لە ئامادەکردنیشیدا زۆر حسابی ئەوە کراوە، ئەو کەسە شەرمنانە ببەنە لای بەرپرسە دەسەڵاتدارەکان، کە هیچ قسەیەکی جیدی و پرۆژەیەکیان پێ نییە. بۆیە ئە

مەجلیسانەدا هەر لا دەکەیەوە، ڕۆشنبیر دەبینی بە فرسەتی دەزانێ نامەیەك، یان پسووڵەیەکی داخوازی تایبەتی بداتە ئەو کەسەی بۆ لای چووە و مەسەلەکە لە دوای نانخواردنێکی خۆش، کۆتایی پێدێت. ئەو پرسە چارەنووسسازانەی جەنابتان باسی دەکەن، لە ئەساسدا بۆ گفتوگۆ و بیروڕا وەرگرتنی ڕۆشنبیر و خەڵکانی شارەزا نەخراونەتە ڕوو، بەڵکو دوای ئەوەی بڕیاری سیاسییان لەسەر دراوە، ئەنجا کۆمەڵێ لە کارمەندانی بواری ڕاگەیاندن، کە مەهارەتێکی باشیان هەیە لە دووبارەکردنەوەی بێسوودی قسەی سەرکردەکان لەبابەت ئەوەی کە زوو زوو دەڵێن: «وەك جەنابی سەرۆك بارزانی فەرمووی»، یان «لەسەر ئامۆژگاری جەنابی سەرۆکی حوکمەت» و «وەك لە وتارەکەی سەرۆکی حکومەتدا هاتووە» و ئەمجۆرە دووبارە کردنەوانە، بەبێ ئەوەی بتوانن خاڵی جەوهەری لەو گوتانەدا بپێکن و شیبانبکەنەوە و بۆ خەڵکیان ڕوونبکەنەوە. پاشان بەستنەوەی ئەمانە بە هەندێ مەعلوماتی سواوەوە، بەبێ ئەوەی بتوانن یەك ئەنجامگیری عەقڵانیانە لەو قسانەی دەیکەن، وەدەست بهێنن. دوای ئەوەی ئەم پسپۆڕانەی ڕاگەیاندن هەم خۆیان و هەم هەندێ لە بەرپرسەکانیش بە لاڕێدا دەبەن، ئەمجا دێن و دەیانەوێ ڕای گشتیش بشێوێنن و دەکەونە دۆزینەوەی ئەو کەسانەی کە دەتوانن لە بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنیدا، یان لە کۆڕێکدا، هەندێ بۆرە ڕەخنە دەر ببڕن و بکەونە دروستکردنی بازنەیەکی پیرۆز بەدەوری پرۆژەکەدا تاکو کەس ڕەخنە و بۆچوونی جیدی لەسەر ئەو مەسەلە چارەنووسسازانە دەر نەبڕێ، نەبا لە دژی بەرژەوەندی حیزب و خەیاڵگەی حیزبیانەی ئیعلامییەکان بکەوێتەوە. ئەمەیان لە مەسەلەی فیدراڵییەتدا، لە کۆنفرانسەکانی ئاشتبوونەوەی نیشتیمانی و گەلێ بواری تردا کرد و سانسۆرێکی نادیاریان لەسەر کۆمەڵێ قەڵەم و دەنگ فەرز کرد. بۆیە بەبڕوای من ئەگەر سەرکردە سیاسییەکانیش بیانەوێ هەندێ بیروڕا بزانن، کە هەر وایشە، ئەوە ئیعلامییەکانیان وەك دانیاڵ بێڵ دەڵێ: دەبنە پاسەوانی بەردەرگای میدیاکان و تەسفیە حسابی خۆیان لەگەڵ ڕۆشنبیراندا دەکەن و ناهێڵن دەنگی هەموو کەس بگات و سانسۆریان دەکەن.

**بێستوون: باشە کەواتە بارودۆخی ڕاگەیاندنی ڕەسمیی حیزبەکان چۆن هەڵدەسەنگێنی؟**

ڕێبوار: لەوەڵامی ئەم پرسیارەتدا ناچارم قسەکانم لەسەر ئەو ڕاگەیاندنە چڕ بکەمەوە و لە دوا ڕۆژیشدا زۆر بەفراوانتر دیراسەی دەکەم، کە ماوەی چوار ساڵە لە نزیکەوە ئاگاداری هەم و بیروڕا و ڕۆشنبیریی ئیعلامیانەی زۆربەی ئەندامەکانیشی دەزانم، ئەویش ڕاگەیاندنی پارتی دیموکراتی کوردستانە. جگە لەوەی لە ڕابردوودا و لە ساتی هەستیاردا زۆرترین نووسینەکانی خۆم بۆ گۆڤاری گوڵان، برایەتی و خەبات ناردووە، هەروەها درێغیم نەکردووە لە دەوڵەمەندکردنی بە بیرۆکەی جیدی و پێشنیاری بەسوود بۆ کارمەندەکانی، بەڵام هەر ئەم ڕاگەیاندنە و سیاسەتی بەڕێوەبردنەکەی هەمیشە شوێنی سەرنجدانی ڕەخنەیی من بووە و پێشتریش قسەم لەبارەوە کردووە. پێموایە ئەم ڕاگەیاندنە لەگەڵ ڕێزمدا بۆ کۆی کارمەندەکانی کە زۆربەیان دەناسم، چەند خەسڵەتێکی نەگۆڕ و مشەخۆرانەی تایبەت بەخۆی هەیە و کۆمەڵێ قەیرانی بەردەوامیش لەخۆیدا دووبارە دەکاتەوە کە پێویستە ڕاشکاوانە باسبکرێن.

یەکێك لەو نەگۆڕانەی ناو ڕاگەیاندنی پارتی ئەوەیە زۆربەی هەرە زۆری ئەندامە بڕیاردەرەکانی پێشتر لە حیزبی شیوعیدا بوون و لەماوەی جیاواز و فرسەتی جۆربەجۆردا و بەهۆی ئەو ئیمتیازانەی بۆیان دابینکراوە، هاتوونەتە ناو پارتییەوە و تۆڕێکیان بەدەوری ڕاگەیاندنەکەیدا چنیوە. کێشەی هەرەسەرەکیی ئەم تۆڕە ئەوەیە کە ئەو ناکۆکیی و ململانێیانەی پێشتر لە حیزبی داییکدا لە نێوانی هەندێ لە ئەندامەکانی ئێستای ڕاگەیاندنی زڕدایکدا هەن، وەکو خۆیان ماونەتەوە و بگرە خەستتریش بوونەتەوە، چونکە لێرە مەسەلەی پێگە و دەسەڵات و پارەی تێکەوتووە و لەوە دەرچووە هەر ناکۆکییەکی ئایدیۆلۆژی بێت. ئەمەش قەیرانێکی گەورەی سیاسەتی بەڕێوەبردنی لە ڕاگەیاندنی پارتیدا دروستکردووە و بەشەکانی ئەو ڕاگەیاندنەی بە نووسراو، بیسراو و بینراوەوە، لەڕووی ئیداری و تەکنیکییەوە ئیفلیج کردووە و بۆتە ڕێگر لەبەردەم ئەوەی ڕۆڵی خۆی لە کۆمەڵگادا بگێڕێ و زەمینەسازی بکات بۆ سڕینەوەی دیاردە دزێوەکان و هووشیارکردنەوەی هاووڵاتیان. ئەمە جگە

لەوەی بواری بۆ کارمەندەکانی نەهێشتۆتەوە وەکو پێویست گەشە بە خۆیان بدەن. دیارە ڕاگەیاندنی پارتی پێویستە خۆشحاڵ بێت کە ژمارەیەکی زۆر کارمەندی گەنجی کچ و کوڕی هەیە کە بەشێکیان لە ئێرانەوە هاتوونەتەوە و ئەزموونیان هەیە، بەشێکیشیان لەژێر کاریگەریی هیچ ئایدیۆلۆژیەتێکدا نین و دڵسۆزیشن و خۆشبەختانە ئەزموونی ناو بەعسیشیان نییە. بەڵام قەیرانی ئیداری و ململانێی نائیعلامیانەی بەڕێوەبەرەکان و نەبوونی دیموکراسییەتی ئیداری و زاڵبوونی سەنتراڵییەتی تاکەکەس و دەسەڵاتی میزاجی شەخسی، وایکردووە بەشێکی زۆری ئەم گەنجانە سارد ببنەوە و لە ڕووی دەروونییەوە ماندوو بکرێن و بەو جۆرە تەماشای کارەکەی خۆیان نەکەن کە فرسەتێکە بۆ خۆدروستکردن و داهێنان. ئەمە بارودۆخی هەریەك لە سەتەلایتی کوردستان، دەزگای گوڵان و ڕۆژنامەی برایەتی جاران و خەباتی ئێستایە و لە هەریەك لەم دەزگایانەدا دەیان کارگوزار و کارمەندی بەتوانا و خاوەن خەونت هەیە کە لەبەر ئەو ململانێیانەی لە نێوان ئاستەکانی بەڕێوەبردندا لەئارادان ناتوانن، وەکو پێویست چالاك بن.

خەسڵەتێکی دیکەی نەگۆڕی ئەم ڕاگەیاندنە ئەوەیە کە زۆربەی ئەو کەسانەی تیایدا بڕیار دەدەن و بیروڕا دەردەبڕن، ڕاگەیاندنیان نەخوێندووە، لە دەورەی زانستیدا بەشدار نەبوون و ئەو ڕۆشنبیری و شارەزاییە ئاماتۆرییەی فێری بوون، زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ ئەزموونی شەخسی و لەمەشدا هەندێکیان هەنگاوی باشیان بڕیوە کە پێویستە پارمەتی بدرێن بۆ گەشەبەخۆدان. هەندێکی تریشیان پێگەیشتووی سەردەمی شەڕی ناوخۆن و ئێستاش بەهەمان عەقڵییەتەوە بیردەکەنەوە، کە پێموایە ئەمە زۆر مەترسیدارە، چونکە نە ڕێزێکی تێدایە بۆ بیروڕای سەرکردایەتی حیزبەکەیان و ئەو هەوڵانەی دەدرێن بۆ بەرپاکردنی ئاشتی و لێبووردەیی و ئاشتبوونەوەی نیشتیمانی، نەپێویستییەکی ئێستا و هیچکاتێکی تری کۆمەڵگاکەشمانە. هەندێك لەو بەڕێزانەش وێڕای ئەوەی کە پارتین و خەڵکی یەك شار و لەیەك بەشیشدا کار دەکەن، بەڵام ناکۆکیی کوشندەی شەخسیی لە نێوانیاندا هەیە و ئەمەش ڕەنگدانەوەی سلبیی خۆی هەبووە.

نەگۆڕێکی تری ناو ڕاگەیاندنی پارتی ئەوەیە کە گۆڕانەکانی هەمیشە گۆڕانن لە شێوەدا نەك لە ناوەڕۆکدا. بۆ نمونە مدیرەکان زوو زوو دەگۆڕێن، بەڵام سیاسەتی ئیعلامیی هەر بەداخراوی دەمێنێتەوە کە سیاسەتێکە بەردەوام ستاییشکەرە نەك ڕەخنەگر و بابەتهەژێن. هەڵبەت ئیعلامی پارتی زۆر بانگەشەی ئەوە دەکات کە گۆڕاوە، بەڵام ئەم گۆڕانە لە ڕەنگاوڕەنگردنی لاپەڕە و گۆڕینی دیکۆری هەندێ لەبەرنامەکانی سەتەلایتی کوردستان (کە لە دوای کارەساتەکان لە تەعزییەخانە دەچێ نەك کەناڵی ئاسمانی)، زیاتر تێپەڕی نەکردووە. بەڕێوەبەرە نوێیەکانی ئەم ڕاگەیاندنەش بەرلەوەی سیاسەت و بەرنامەی نوێی خۆیان ڕابگەیەنن، لە پێشدا دەکەونە خۆ نوێکردنەوە، پێکەوەنانی گرووپی خۆیان و مۆبێلەکردن و فەرشکردن و تەجهیزکردنی دەزگاکەیان بە دوا مۆدێلی کومبار و تاقمی قەنەفە.

ئەوەی کە بەمشەخۆرییش ناوم برد، یان ڕاستر وایە بە گرێی (ئۆدیب)ی ڕاگەیاندنی پارتی ناوی ببەم، بریتیە لەو چاودێریکردنە بەردەوامەی بۆ ڕاگەیاندنی یەکێتی هەیەتی. من زۆر جار دەگەمە ئەو قەناعەتەی ئەگەر ڕاگەیاندنی یەکێتی نەبایە ئەوە ڕاگەیاندنی پارتی زۆر خراپتریش دەبوو. بۆیە لە تێڕوانینێکی خێرادا دەتوانین بڵێین: لەماوەی ئەو چەند ساڵەی ڕابردوودا نمونەی بەردەم ڕاگەیاندنی پارتی بریتیبووە لە ئیعلامی یەکیەتی و زۆربەی ئەو گۆڕانکارییە شکڵیانەش کە لەم ڕاگەیاندنەدا کراون، لاساییکردنەوەیەکی ڕتووشکارانەی ئەو شتانەبوون کە لە ڕاگەیاندنی ئەولادا بوونەتە شتی ڕۆتینی. بۆیە لە پێناوی ئەوەی ڕاگەیاندنی پارتی ببێتە خاوەن سیمای تایبەت بەخۆی، پێویستە خۆی لەم عوقدەیە ڕزگار بکات، چونکە ڕاگەیاندنی یەکێتیش قەیرانی زۆری تایبەت بەخۆی هەیە کە یەکێکیان بریتییە لە عوقدەی «مۆدێرنیزەبوونێکی ڕواڵەتکارانە»، بەبێ ڕەچاوکردن و گەڕانەوەی بۆ بنەماکانی مۆدێرنیتە کەگرنگترینیان بریتین لە ئازادی ڕادەربڕین و هەڵسوکەوتی دیموکراتیانە و شەففافیەت. لەوێش بڕیارەکان لە «سەرەوە» دێن و لەوێش چەندین گفتوگۆ لەگەڵ نووسەران و ڕۆشنبیران تۆمار دەکرێ و هەرگیز بڵاو ناکرێنەوە. ڕاگەیاندنی یەکیەتی بەگشتی و لە ڕواڵەتدا مۆدێرنە، بەڵام لە خزمەتی ئەو بەهایانەدایە کە دژی

مۆدێرنیتەن و لەگەڵ عەقڵییەتی ڕۆشنگەرانەدا وێکنایەنەوە. بۆیە ئەم دوو ڕاگەیاندنە قەیرانی ناسنامەیان هەیە و لەنێوان ئەوەی «زمانحاڵی حیزب» یان «ڕاگەیاندنی کۆمەڵگای مەدەنی»بن، وزەی خۆیان بەفیڕۆ دەدەن. هەڵبەت هەریەکێ لەو خاڵانە و زۆری تریش پێویستە بە دوور و درێژی و بەبەڵگەوە قسەیان لەسەر بکرێ، کە ئێرە شوێنی ئەو باسە نییە. هێندە هەیە هیچکامێ لەم ڕاگەیاندنانە نەیانتوانیوە ئەو ئیمکانیەتە تەکنەلۆژییە زۆرەی بەردەستیان هاوشان بە پەرەپێدانی ڕۆشنبیریی ئیعلامی و تێگەیشتن لە تیۆرەکانی ڕاگەیاندن، بەکار بهێنن بۆ پەروەردەکردنی کارمەندەکانیان و دروستکردنی ڕاگەیاندنێك بە تایبەتمەندیی کوردیانەوە. نمونەی ئەم بۆچوونەش ئەو مامەڵەیە بوو کە ئەم ڕاگەیاندنانە لەگەڵ ڕووداوەکانی لێدان لە عێراق و بەعەرەبیکردنی بەرنامەکانیان و پرۆژەی بەعێراقیبوونەوەدا کردیان و بەداخەوە لە هەمووشیاندا نشووستییان هێنا لەوەی بتوانن دیدێکی ئیعلامیانەی تایبەت بە کۆمەڵگای کوردستانی بخەنە ڕوو. ئەمەش جێی ئەسەفێکی زۆرە، چونکە بەڕاستی دەکرێ ئێمەی کورد بەو تەکنەلۆژییە ئیعلامییە زۆرە و بەو هێزە مرۆییە گەنجەی هەمانە، ڕاگەیاندنێکی سەرکەوتوومان هەبێ کە هەم خزمەت بە بەرژەوەندی حیزبەکان و هەم خزمەت بە کۆمەڵگا بکات و چیدی ڕێگا نەدرێ سەرچاوەی زانیارییەکانی مرۆڤی کورد لەسەر کوردستانیش، هەر کەناڵە عەرەبییە شۆڤێنییەکان بن..

**بێستوون: ئایا ئەم ڕاگەیاندنە چەندە لەو کەمتەرخەمییە و ساردوسڕییەی پەیوەندیی نێوان ڕۆشنبیر و دەسەڵاتی دەکەوێتە ئەستۆ، لە نەڕەخساندنی شەففافیەتێکی زیاتر بۆ ڕوونکردنەوەی هەڵوێستەکانی سەرکردایەتی کورد لەبەرامبەر مەسەلەکاندا تاوەکو ڕۆشنبیر لە ژێر ڕۆشنایی قسە و لێدوانەکانی سەرکردایەتی هەڵوێستی ڕوون وەربگرێ؟**

ڕێبوار: ئەم ڕاگەیاندنە هەموو ئیمکانیەتێکی تەکنەلۆژیانە و پەیوەندارانەی لەبەر دەستایە بۆ دروستکردنی ئەو شەففافییەتە. کێشەمان لەگەڵ خودی ڕاگەیاندنەکە نییە، کێشەکە لەگەڵ ئەو تەئویلەدایە کە ئیعلامییەکان بۆ شەففافییەتی سیاسی و بۆ

پەیوەندیی نێوان ڕۆشنبیرانی جدی و سیاسییەکان هەیانە. ئیعلامییەکان بەپێی هەندێ ڕێنومایی وەهمی یان نووسراو، خۆیان تەفسیری هەندێ بارودۆخ دەکەن و بەپێی ئەو ئەنجامە عەفەویانەی پێیدەگەن و بەهۆی کەرەمی خوا و سەلیقەی تایبەتەوە، ئیشی لەسەر دەکەن. ئەگەر هیچ بەرپرسێ قسەی نەکرد و کەس تووڕە نەبوو، ئەوە لەسەری بەردەوام دەبن و ئەگەریش ناڕەزایی هەبوو ئەوە خێرا دەیگۆڕن و ئوسلوبێکی دی دەگرنە بەر. لەبیرمان نەچێت کەسایەتییەکی وەکو بەڕێز مەسعود بارزانی تا ئێستا لایەنی کەم دوو جار بە «ڕەسمی» ناڕەزایی خۆی بەرامبەر بەهەندێ ئوسلوبی ئیعلامییەکانی پارتی دەربڕیوە. **بۆیە لە پشت ئەم کارکردنە ئیعلامییەوە، نە تێگەیشتنێکی قووڵ هەیە بۆ تەکنەلۆژیای ڕاگەیاندن، نە شیکردنەوەی سۆسیۆلۆژیانە هەیە بۆ ڕۆڵی ڕاگەیاندن لە کۆمەڵگای ئێمەدا و نە خوێندنەوە و ڕەخنەی جدییش هەیە بۆ دیاردەکان و نە هەوڵدانیش هەیە بۆ ئەوەی ئەم ڕاگەیاندنە تایبەتمەندیی کۆمەڵگای کوردستانی وەربگرێ.** ئیعلامییەکان نەك هەر لە ڕاگەیاندندا بواریان بۆ شەففافییەت نەڕەخساندووە و لە بەهێزکردنی پەیوەندیی سیاسی و ڕۆشنبیراندا یارمەتیدەر نەبوون، بەڵکو زۆریش کاریانکردووە بۆ دابڕکردنی سیاسی لە ڕۆشنبیرانی سەربەخۆ و خاوەن دەنگ. لە زمان ئەم ئیعلامیانەوە زۆر بەکەمی گوێمان لەوە دەبێ کە فلانە سیاسی مرۆڤێکە «تێدەگا، هێمنە و ڕەئی هەیە و ڕەخنە قەبووڵ دەکا». ئەوەی گوێمان لێدەبێ و لێبووە ئەوەیە کە زۆربەی ئیعلامییە دەسەڵاتدارەکان هەمیشە ویستوویانە وێنەی مرۆڤی تووڕە، نالێبووردە و لەڕووی ڕۆشنبیرییەوە هەژار، لەسەر سیاسییەکان بەرهەم بهێنن و زۆر جار کە بۆخۆیان شتێکیان بە دڵ نابێ بە پاساوی ئەوەی «سەرەوە تووڕە دەبن» ڕەتیدەکەنەوە و زۆر شتیی تریش کە لێرەدا باس ناکرێن. ئیتر سەبارەت بە ڕۆشنبیران چی بە سیاسیەکان دەڵێن، ئەوە هەر بۆخۆیان دەیزانن. لەلایەکی ترەوە و لەماوەی ئەو چوار ساڵەی ڕابردوودا من شایەتی ئەوەبووم کە چۆن هەندێ لە ئیعلامیی و میردەزگا بەهۆی ململانێی ناو خۆیان و میزاجیی شەخسییەوە، چەندین ڕۆشنبیر و مامۆستای زانکۆیان بەپەراوێزکردووە، نەیانهێشتووە لە موناسەبەکاندا بەشدار بن و لە

میدیاکانیشدا دەربکەون. ئەمە جگە لەوەی لەسالانی پێشتردا توندوتیژیی هەندێك لەمانە بەرامبەر بە ئایین و بریندارکردنی هەستی هاوولاتیانی مسوڵمان بەهۆی ڕۆشنبیرییەکی هەرەمەکییەوە لەسەر دین، بوونەتەهۆی دروستکردنی پەرچەکرداری توندی خەڵك بەرامبەر بە هەر کارێکی مەدەنی و خزمەتگوزارییەك کە لەم شارەدا دەکرێ. هەرەوەها هەر ئەمانە چەندین کەسایەتی و دکتۆری زانکۆیان ئازاردا، ڕۆشنبیرەکانیان لەکار دەرکردن و تەنانەت کار گەیشتە ئەوەی هەندێك لەم «کاوبۆیانە»ی ناو ئیعلامی پارتی لەناو نوسینگەکانی خۆشیاندا بەهۆی پاسەوانەکانیانەوە توندوتیژیی جەستەیی (لێدان و پەلاماردان) بەرامبەر بە خەڵکانێك بنوێنن و سووکایەتیان پێبکەن. ئەمە جگە لەوەی قەڵەم بەدەستەکانی دەوروبەری خۆیان هانداوە بەناوی خۆیان و خواستراوەوە، لە ئەنتەرنێت و ڕۆژنامەکاندا بە ئارەزووی خۆیان سووکایەتی و قسەی ناشیرین بەو ڕۆشنبیر و کەسایەتیانەی هەندەران بڵێن، کە چاوەڕێی هاتنەوەیان بۆ کوردستان لێدەکرێت. تەنانەت زۆر هەوڵیشیانداوە شوێن بە ئەو کەسانە لەق بکەن کە هاتوونەتەوە بۆ کوردستان و لە بواری جیاوازدا کار و خزمەت دەکەن. ئەمەش بەهۆی خەتهێنان بەژێر ئەو ڕەخنانەیاندا کە لە حیزب و هەڵوێستەکانیان گرتوون و لە ڕێگەی دروستکردنی مەلەفی تایبەت بۆیان. نمونەیەکی کۆمیدی ئەمکارەیان بریتیە لە کۆپیکردنەوەی وتارێکی من بە ژمارەیەکی زۆر و ناردنی بۆ زۆربەی کەسایەتی و دەزگاکان وەك بەڵگەیەك لەسەر ئەوەی ئەها فلانکەس چی بە حیزب گوتووە، لەکاتێکدا ئەو وتارە تەنیا دووسەد نووسخەی لە ئەورووپا بڵاوکراوەتەوە!. نمونەی زۆری لەم بابەتەم لایە کە لەو توێژینەوەیەی پێشتر ناوم هێنا، پشتیان پێدەبەستم. بۆیە هەتا مدیرییەتی ڕاگەیاندن لەم دەڤەرەدا ئەوە ئوسلوب و ڕەفتار و بیرکردنەوەی بێت، پەیوەندیی نێوان سیاسی و ڕۆشنبیر هەر ئاوا سارد و سڕ دەبێت و سیاسی هەمیشە لەو بەختەوەرییە هزرییە بێبەش دەبێت کە ڕۆشنبیری جیدی پێیدەبەخشێت و لەسەر ئەو وێناکردنە هەڵەیەی بەردەوام دەبێ کە بۆ دەنگی ڕۆشنبیرانەی ڕەخنەگر هەیەتی. من چاوەڕوانیم ئەوە بوو ئیعلامییەکانی پارتی لە شارێکی ستراتیژیی وەکو هەولێردا، زۆر

حەکیمانەتر بیریان کردباوە و هیچ کار و رەفتارێکیان لەبەرامبەر نووسەران و رۆشنبیرانی بەرێزی ئەم شارەدا نەنواندبا کە ببێتە گلەیی خەڵك لەسەر مەرجەعییەتی سیاسی ئەوان.

**بێستوون: هەر ئەم دابڕان و لێکدوورییەی نێوان دەسەڵات و رۆشنبیر، چەند کاریگەریی هەبووە لەسەر دابڕانی دەسەڵات بە حزب و حکومەتەوە لەگەڵ جەماوەر؟**

رێبوار: ئەو دیوارەی لە نێوان رۆشنبیر و دەسەڵاتدا دروستکراوە و (لەمەشدا رۆڵی هەندێ لە ئیعلامییەکان لەبەر چاوە و لەکاتی خۆیدا باسیان دەکەم)، خۆبەخۆ بۆتە دیوارێکیش لە نێوان دەسەڵات و هاووڵاتیاندا. ئیعلامییەکان بەوەی کە دەیانەوێ وەك رۆشنبیریش دەربکەون رێگەشیان بەخۆیانداوە بەناوی هاووڵاتیانەوە قسان بکەن، لەکاتێکدا ئەوە ئەرکی رۆشنبیر نییە بەناوی کەسەوە قسە بکات جگە لە خۆی. بۆیە ئەم بەهەڵە تێگەشتنە لە رۆڵی رۆشنبیر و ئەو خۆخستنە برییەی ئیعلامییەکان، بۆتە هۆی بەرهەمهێنانی ئەو بیرورا هەڵەیەی کە دەڵێت پێویستیمان بە رۆشنبیر نییە و لێرەشەوە رێگا خۆشکراوە تاکو رۆشنبیر بە مرۆڤێکی «مشەخۆر» و «گێرەشێوێن» و «دژ بە بەرژەوەندییەکانی دەسەڵات و حکومەتی هەرێم»، پێناسە بکرێ. ئەم هەڵەیە چەند ئەنجامێکی بەدی لێکەوتۆتەوە کە کاریگەرییەکی زۆریان هەیە لەسەر پەیوەندیی دەسەڵات و هاووڵاتیان. یەکەمیان ئەوەیە شەففافییەت و راشکاوی نەماوە و ئەمەش بۆتە هۆی کوشتنی متمانەی خەڵك بە حکومەت و دەسەڵات، ئەو شەففافیەتەی کە پێویستە لە ئەنجامی گفتوگۆی رۆشنبیرانەوە دروست ببێت. چونکە هاووڵاتیان نە بەو جۆرە تەماشای رۆشنبیر دەکەن کە دەسەڵات و ئیعلامییەکانی دەیکەن و نە ئیعلامییەکانیش بە دەنگی رۆشنبیرانەی کۆمەڵگا دەزانن. هاووڵاتیان و جەماوەر، ئیعلامییەکان بە بەشێ لە دەسەڵات دەزانن و ئەوەی ئەوان دەیڵێن و دەینووسن، هەرچەندە رەخنەگرانەش بێت، بە شتێکی بڕیار لەسەر دراو و فەرمانپێکراو وەریدەگرن. ئەمەش پێماندەڵێ لە روانگەی خەڵکەوە ئەوان ناتوانن جێگەی رۆشنبیران بگرنەوە. چونکە ئەرکی سەرەکیی ئەوان بریتییە لە دروستکردنی

پردی گفتوگۆی ڕاشکاوانە لە نێوان کۆمەڵگا و دەسەڵات لەلایەك و لە نێوان ڕۆشنبیران و سیاسیدا، لە لاکەی دییەوە.

دووەمین ئەنجامی خراپی ئەم بارودۆخە ئەوەیە، کە ئەرکی ڕۆشنبیران وەك هێزێکی بێلایەنی پرسیار وروژێنەر و وەك تەفسیرکەری پەیوەندییی نێوان دەسەڵات و کۆمەڵگا، لاواز و پاسیڤکراوە. ئەمەش هەم بۆتە هۆی ئەوەی دەسەڵات و حکومەت لە دەنگی سەربەخۆ و بێلایەنەوە ئاگاداری ئەوە نەبن بەڕاستی لە کۆمەڵگادا چی ڕوو دەدات، هەم بۆتە هۆی پتەوبوونی بەدگومانی خەڵکیش لە ئاست دەسەڵاتدا.

سێیەمین ئەنجامی خراپی ئەم بارودۆخە سۆسیۆ سیاسییە ئەوەیە، لەم ڕاگەیاندنەدا ڕەخنە و گفتوگۆ و بیرورا گۆڕینەوە نەبۆتە کولتوورێك بۆ هەڵسەنگاندنی مەسەلەکان و کاریگەریی ئەمەش لە کرانەوەی کۆمەڵگادا بەڕووی فرەیی و جیاوازیدا، پشتگوێ خراوە. بۆیە ئەوەی کە لە ڕاگەیاندن و میدیا ڕەسمییەکانی حکومەت و دەسەڵاتدا دەیبینین و گوێمان لێی دەبێ، لە زۆربەی حاڵەتدا جگە لە مەسرەفکردنی قسە و دروستکردنی شانۆییەك لەسەر ئەوەی گوایە گفتوگۆ هەیە، زیاتر نییە. بێگومان ئەمەش بۆتە هۆی داخرانی زیاتری کۆمەڵگا و بێدەنگبوونی ڕۆشنبیران و بەشداری نەکردنیان لە تەفسیرکردنی ئەو مەسەلانەدا کە پەیوەستن بە پەیوەندیی نێوان حکومەت و هاوڵاتیانەوە.

- زۆر سوپاس..

# شەڕ و تەنیایی..

## (ئەمەریکا ڕزگارکەرە، ئازادکەر نییە).

***(گفتوگۆیەك لەگەڵ ڕادیۆی ئازادی)***

{پێشینەکانی شەڕی ئەمەریکا لە عێراق.
ئەمەریکا ڕزگارکەرە بەڵام ئازادمان ناکات!
هەڵوێستی کورد لەشەڕی ئەمەریکا و بەعسییەکان. فیدرالیزم وەك درووشم. تەنیایی کورد لە شەڕدا..}

**ڕادیۆی ئازادی:** ***وەك بینیمان شەڕی ڕزگاری لە دژی ڕژێمی عێراق دەستی پێکرد، تۆ دەرهاویشتە و دەرئەنجامەکانی ئەم شەڕە چۆن دەبینیت؟ یاخود پێتوایە کەشتی ئەم شەڕە لە کوێ لەنگەر دەگرێ؟***

**ڕێبوار:** با لە ڕاستییەکەوە دەستپێکەین کە پێماندەڵێت: ئەم شەڕە بەرلەوەی ئەم چوارچێوەیەی ئێستای وەربگرێت، دەستییپێکردووە و ئەمە تەواوکەری چەند شەڕێکی ترە کە ئەمەریکا لەگەڵ هاوپەیمانەکانی بە مەسئولییەتی خۆی دەزانێ ئەنجامیان بدات. ئەو شەڕە تەواونەکراوانەی کە وا چاوەڕواندەکرێت ئەمەریکا بەم شەڕەی ئێستای تەواویان بکات و ئیتر لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا بەردێك لەسەر کێشەکان دابنێ، بە بڕوای من ئەمانەن: لە هەشتاکان بەدواوە ئەمەریکا شەڕێکی لەسەر بەجیهانیکردنی سیستەمی دیموکراسییەتی لیبرالی، کە دوایین داهێنانی ئەمەریکا

خۆیەتی، دەستپێکردووە. ئامانجی یەکەمی ئەو شەڕەی بریتیبووە لە بە بازاڕکردنی جیهان و لابردنی هەرکۆسپێك لەبەردەم گەشە و فراوانبوونی ئابووریی ئەمەریکیدا. دیموکراسیەتی لیبرالی وەکئەوەی بیرمەندەکانی لەدوای ڕووخانی بلۆکی سۆڤێتی جاران، قسەیان لەسەر کردووە و حکومەتی ئەمەریکیش پشتیوانی لەو تیزە دەکات، دەبێت ببێتە سیستەمێکی جیهانگرەوەی بێ نمونە و جێگای کۆی سیستەمە ئایدیۆلۆژی و ئیدارییەکانی دیکە لە جیهاندا بگرێتەوە و بتوانێت کۆمەڵگا لۆکالّی و نێودەوڵەتیەکانیش کۆنترۆڵ بکات و بەوجۆرەش ئابووریی جیهان بە ئابووری ئەمەریکاوە پابەند بکات. ئێمە لەیادمان نەچێت کە ئەمەریکا مێژوویەکی هەیە لە زنجیرەیەك جەنگی نەپساو پێکهاتووە و ئەمەش کێشەیەکی گەورەی ئابووری بۆ دروستکردووە. سیاسەتی ئەمەریکا بەوجۆرە بووە کە لە ڕێگەی دووبارەکردنەوەی جەنگەکانەوە، ئەو بۆشاییە پڕبکاتەوە کە لە ئابووریی ئەو وڵاتەدا سەریانهەڵداوەو هەمیشەش مەسرەفی شەڕەکان بوونەتە ڕێگر لەبەردەم هاتنەدی ئەو خەونەدا کە بە (خەونی ئەمەریکایی) بەناوبانگە. بۆیە شەڕ لە میللەتی ئەمەریکا، کە خەوبینترین میللەتی سەر ڕووی زەویە، شەڕانیترین میللەتی دروستکردووە، کە هەردەم بۆ دەربازبوون لە قەیرانەکانی ناوەوەی پێویستی بە بەدوژمنکردنی ئەوانیتر هەیە.

هەروابێتەوە ئەم شەڕە تەواوکەری شەڕێکی ترە کە بریتیە لە سەرکوتکردنی بزوتنەوە ئیسلامیە توندڕەوەکان لەم ناوچەیە و لە شوێنەکانی تری جیهاندا. ئەمەریکا لەدوای هاتنە سەرکاری ڕژێمی کۆماری ئیسلامیی ئێرانەوە، نەیتوانیوە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ سنوورێك بۆ دەسەڵات و ئەو پشێویانە دابنێ، کە بزوتنەوە توندڕەوە ئیسلامیەکان لەم ناوچەیە و پاشان لە کارەساتی یازدەی سێپتەمبەرەوە لە ناو خودی ئەمەریکاشدا، کێشەی گەورەیان بۆ ئەو وڵاتە ناوەتەوە.

هەروەها ئەم شەڕە تەواوکەری شەڕێکی ترە لە پێناوی هێنانەوە مایە و وەدەستهێنانەوەی ئەو هەیبەتەی ئەمەریکا تا ڕووخانی دیکتاتۆریتی پادشایی ئێران، لە خۆرهەڵاتی ناوەڕستدا هەیبوو. دوایئەوەی شۆڕشی گەلانی ئێران(١٩٧٩) سەری گرت و پاشان کەوتە دەست باڵی شیعەی ئەنتی ئەمەریکایی، ئەوە بوو هەیمەنەی

ئەمەریکا لەم ناوچەیەدا کۆتـایی پێهـات و دووچـاری ڕیسواییەکی بێنمونـە بـوو. لـەو کاتەوە دەوڵەتە یەکبەدوای یەکەکانی ئەمەریکا ویستویانە لە خۆرهـەڵاتی ناوەڕاسـتدا پایەگایەکی نوێ بۆ خۆی دروسـتبکاتەوە، کـە بەرژەوەندیـەکانی تێـدا پـارێزراو بـن و تازەکەرەوەی هەیمەنـەی ئەمـەریکاش بـن لـە ناوچـەیەکدا کـە تێکەڵێکـە لـە نـەوت و ئیسلام، واتە هەردوو ئەو ڕەگەزەی کە ئەمەریکا پێویـستی زۆری پێیانـە: نـەوت وەك زێڕێکی ڕەش و ئیسلامیش وەك دوژمنێکی ئامادە !.

هەروەها لە هەمووان نزیکتر ئەم شەڕە تەواوکەری شـەڕی کوێتـە کـە سـاڵی ١٩٩١ لـە لایەن ڕژێمی بەعسەوە داگیرکرا و لێرەشـەوە، تەواوکـەری ئـەو پرۆژەیەیـە کـە جۆرج بووشـی بـاوك پێـی هەڵـسا و تـەواوی نـەکرد و مایـەوە بـۆ بووشـی کـوڕ کـە ئێـستا سەرکردایەتی ئەم هێرشە دەکا بۆ لابردنـی ڕژێمـی عـیراق. بۆیـە پێموایـە ئـەم شـەڕە شەڕی ڕزگارکردن نییە و وا چـاکە ئێمـەی کـورد، هەڵوێـستێکی ژیرانـەتر لـەم شـەڕە وەربگـرین و واپێدەچـێ تەندروسـترین هەڵوێـستیش ئـەوە بـێ کـە بـێین ئـەو زمـانی قسەکردن و گوتارەی کە لەسەر ئەم شەڕە لەلایەن ڕاگەیانـدنی ڕۆژئـاوایی بەگشتی و ئەمـەریکی بـە تایبـەتی، بەرهـەمهاتووە، کـە گوایـە شـەڕی ڕزگارکردنـە و هەنـدێ لـە بەرهەڵستکارانی عیراقیش دڵییان بەمە خۆش کردووە، هەڵبوەشێنینەوە. تێگەیـشتنی تەندروسـتانە لـەم شـەڕە ئەوەیـە کـە بڵـێین: شـەڕی ئـازادکردن نییـە و تـەواوکردنی ئەوشەڕانەی ترە کـە لـەم ناوچـەیەدا بـۆ ئەمـەریکا هاتوونەتـە پـێش. چـونکە ئەگـەر شەڕی ئازادکردن بێ و مەبەستیشمان لەم ئازادکردنە، ئازادیی گەلانی عێـراق بێـت لـە ستەمی ڕژێمی بەعس، ئەوا دەبـوو بـەر لـە کارەسـاتی هەڵەبجـە، بەرلـە ڕووداوەکـانی ئەنفال و لێدان لە هاووڵاتییانی باشوور و ووشککردنەوەی هۆرەکان و لێدان لە هـەموو بزوتنەوەیەکی ئازادیخواز لە عیراقدا، ئەم شەڕە کرابایە نـەك ئێستا. بـەڵام ئێـستا بـا قسە لەسەر کرۆکی بابەتەکە بکەین کە ئەویش ئەوەیە: ئێستا شـەڕ هەیـە و بپرسـین، داخۆ وەك ئێوە دەڵێن: کەشتی ئەم شەڕە لە کوێ لەنگەر ئەگرێ ؟

پێموایە چەندە بۆ ئێمە کە لە دەرەوەی خوێندنەوەیەکی عەسکەرییانەین بـۆ شـەڕ و هەروەها لە دوورەوەی کەسانێکین، کە نەخشەی ستراتیژی ئەم شەڕەیان دارشـتووە،

ئەوا چ وەکو کورد بە دەسەڵاتی سیاسیشەوە، تا سەرکردەی حیزبەکان هیچ نازانین و نازانن لە بارەی ئایندەی ئەم شەڕە. وەکئەوەی لە ڕاگەیاندنی جیهانییشدا بەدیار دەکەوێ تەنانەت داهاتووی ئەم شەڕە بۆ خودی نەخشە دارێژەکانیش ڕوون نییە، چونکە کاتێ سووپاکەیان هاتە ناو خاکی عیراقەوە وایان دەزانی میللەتی عیراق خۆیان دەدەن بەدەستەوەو ئەو چەکانەی لە ڕژێم وەریان گرتووە لە دژی ڕژێم خۆی بەکاریان دەهێننەوە. بەڵام ئەوە ماوەی چەند ڕۆژێکە ڕووداوەکان پێچەوانەی ئەم خوێندنەوە عەسکەرییانەیان سەلماندووە و زۆر لە لێکدانەوەکانی ئۆپۆزیسیۆنی عێراقییش بۆ ئەم کۆمەڵگایە کورتیان هێنا.. ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە مەودایەك هەیە لەنێوان تێگەیشتنی ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی بۆ عێراق و لە نێوان تێگەیشتنی عێراقیەکان بۆ خۆیان. هەر بۆیەشە ئێستا داڕێژەرانی ستراتیژی ئەم شەڕە لە جۆرێك بەخۆداچوونەوەدان بۆئەوەی کە ئاراستەیەکی دیکە بدەن بە جەنگەکە. کەواتە ئێستا زۆر زووە تا بزانین ئەو شەڕە کەشتییەکەی لەکوێ لەنگەر دەگرێت و بە چ ئەنجامگەلێکەوە کۆتایی دێت.

ڕادیۆی ئازادی: *بەشێکی زۆری پەلوپۆی لایەنەکانی شەڕەکەت دیاری کرد. بەڵام قسەی من لەسەر یەك خاڵە، ئەویش ئەوەیە کە یەکێك لەو مەبەستانەی ئەمریکا هەیەتی چەسپاندن و بڵاوکردنەوەی دیموکراتییەتی لیبرالیە. ئایا ئەمەریکا دەیەوێ لە چ چوارچێوەیەکدا ئەو دیموکراسیەتە لیبرالیە لە عێراقدا بچەسپێنێ، بەتایبەتی کە بەشێك لەو وڵاتە عەرەبیانەی لەم شەڕەدا ئاسانکاری بۆ هێزەکانی ئەمەریکا دەکەن، بۆخۆیان داخراون و پێویستە هەمان سیستەمی دیموکراسیەتی لیبرالییان تێدا پیادە بکرێ. ئایا ئەوانیش دەکەونە بەر پلانی ئەمەریکا، یاخود بێدەنگەیان لێدەکرێت چونکە هەڵوێستیان لەشەڕ بە دڵی ئەمەریکایە؟*

ڕێبوار: لە ڕاستیدا کاتێ من دەڵێم یەکێك لە ئامانجەکانی یان یەکێك لەو نییەتانەی کە لە پشت ئەم شەڕەوەیە، شەڕێکە بۆ بەجیهانیکردنی سیستەمی دیمواکراسییەتی لیبرالی لە چوارچێوە ئەمەریکاییەکەیدا، ئەوەشم پێ ڕاگەیاندی کە ئەم سیستەمە سیستەمێکە بەپلەی یەکەم باس لە مافی تاکە کەس و کۆمەڵی مەدەنی و کۆمەڵێ

مەسەلەی زۆر گەورەی ئینسانی دەکا و هاتنە دی ئەم مەسەلانەش بۆ هەموو کۆمەڵگاکان هەر دروستن. بەڵام دواجار ستراتیژی ئەم دیموکراتییەتە لۆژیکێکی ئابوورییانەی هەیە و ئەویش بە بازاڕکردنی هەموو دنیایە. ئەم بازاڕەش بە پلەی یەکەم دەبێت لە ژێر کۆنترۆڵی ئەمەریکا خۆیدا بێت و خزمەت بە ستراتیژەکانی ئەمەریکا بکات. دەکرێ سیستەمێکی سیاسی داخراوی داپڵۆسێنەر هەبێت، بەڵام لەبەرئەوەی مەترسی نیە بۆ سەر بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکا، ئەوە با هەر خەڵکی وڵاتەکەی خۆی بچەوسێنێتەوە! بۆیە نابێت ئێمە بە هەڵە لە وشەی **دیموکراسییەت** لە دەستەواژەی **دیموکراسییەتی لیبرالیدا** تێبگەین. چونکە ئەمە ئەو دیموکراسییەتە نیە کە لە پشتییەوە مافی سەربەخۆ بوون و ئازادبوونی ڕەهای گەلان و بەکارهێنانی سەروەت و سامانی نەتەوەییان لەپێناوی پێشکەوتنی خۆیاندا پارێزراو بێت. بەڵکو لە دیموکراسییەتی لیبرالیدا هەمیشە ئەو تەماعە چاوچنۆکانەیەش هەیە بۆ دەستگرتن بەسەر ئابووریی ئەو گەلانەدا کە ئەم سیستەمە دەیانخاتە ژێر چاودێری خۆیەوە. بۆیە لێرەدا وشەی **دیموکراسییەت** چەترێکە یان داپۆشینێکە بۆ ئەوەی ڕەوایەتی بدات بەو تەماعانەی تر کە لە ناو سیستەمی لیبرالی ئەمریکیدا هەن. من کە دەڵێم ئەم شەڕە تەواوکەری کۆمەڵێ شەڕی دیکەیە، مەبەستم ئەوەیە کە بە جیهانیکردنی دیموکراسییەتی لیبرالی، کە ئەڵتەرناتیڤێکی ئەمەریکیە بۆ سیستەمە ئایدیۆلۆژییەکانی تری وەك کۆمۆنیزم و سۆسیالیزم و هتد، کاتێك لەلایەن گەلان و کولتوورەکانەوە پێشوازی لەم داهێنانە ناکەن، ئەمەریکا لە ڕێگەی دیکەوە بەسەریاندا دەسەپێنێ وەك: بەپەراوێزکردن و ئابلۆقەی ئابووری هەروەها لە ڕێگەی جەنگیشەوە. بۆیە من دەگەڕێمەوە بۆ ئەو لێکدانەوەیەی کە دەڵێت، واچاکە بۆ تێگەیشتن لەم شەڕە درووشمی شەڕەکە هەڵبوەشێنینەوە و بڵێین: ئەم شەڕە شەڕی ئازادکردن نییە. دیسانیش لێرەدا وشەی **ئازادکردن** پەردەیەکە دراوە بەسەر کۆمەڵێ مەبەستی تردا کە هێشتا بۆ ئێمە روون نین و نازانین بەرژەوەندی ئەمەریکا دەخوازێ دوای شەڕەکە، دەست بخاتە ناو دەستی گەلانی چەوساوەی عێراقەوە، یاخود ناو دەستی چەندین وردە دیکتاتۆری ترەوە کە بێگومان لەم ناوچەیەدا ژمارەیان زۆر زیاترە

لەوەی ئێمە دەیزانین. ئەگەر ئەم شەڕە شەڕی ئازادکردن بێت، مێژووی ئەو سی و چەند ساڵەی عێراق کە بەعس کۆنترۆڵی کردووە بەس بووە بۆ ئەوەی کە دەوڵەتێکی گەورەی وەکو ئەمەریکا بێت گەلانی عێراق ئازاد بکات. کەواتە وشەی ئازادکردن دیسانەوە دەمانخاتە بەردەم شێلوو کردن و ئاڵۆزکردنی مەسەلەکە بە گشتی. هەر بۆیەشە وەختێ پێناسەی ئەم شەڕە بەوە دەکەین، کە کەمترین مژدەی ئازادییەك بەخۆیەوە دەگرێت کە دەمانگەیەنێت بە سەربەستی و سەربەخۆیی، ئەوە ناشتوانین قسە لەسەر ئایندە ئیجابییەکانی ئەم شەڕە بکەین.

ڕادیۆی ئازادی: ***سەرکردایەتی ئەزموونی کوردستان دەبێت لە کوێی ئەم شەڕەدا بووەستێت: بێ لەلایەن بێت، لایەنگیر بێت، یان بەشدار بێت؟***

ڕێبوار: تا بڵێی پرسیارێکی قورسە! جارێ ئێمە دەربارەی (سەرکردایەتی ئەزموونی کوردستان) زانیارییەکی زۆر ناچیزەمان هەیە و جگە لەو بەکارهێنانە ڕۆژانەیەی کە لە ڕاگەیاندنی حزبەکاندا دووبارە دەکرێتەوە، شتێکی ئەوتۆ لەبارەی ئەم سەرکردایەتییەوە نازانین. ئەگەر مەبەستمان ئەوە بێ کە ئەم سەرکردایەتیە زانیاریمان سەبارەت بە ڕووداوەکان دەداتێ و سیاسەتی خۆیانمان بۆ ڕوون دەکەنەوە و بەرنامەکانیان بۆ ئێمە ئاشکران و هەروەها بە ڕاشکاوی وەڵامی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن دەدەنەوە.. بە داخەوە ئێمە سەرکردایەتییەکی لەم بابەتەمان نییە. پەیوەندیی ئێمە بەم سەرکردایەتیەوە وەك جۆرێ چاوشارکێی لێهاتووە: ئێمە دەمانەوێت بەردەوام بیاندۆزینەوە ئەوانیش هەمیشە خۆیان لە ئێمە شاردۆتەوە و ئەمەش وایکردووە هەرگیز یارییەکە دروستنەبێت و لەپاشانیشدا هەرکەسەمان بگەڕێتەوە ناو هێلانەکەی خۆی. دەتوانم بڵێم: سەرکردایەتی کوردی وەك ئەوەی لە هەردوو باڵە بەهێزەکەیدا بەرجەستە بووە، زیاتر لە دوو میرنشینی تەقلیدی دەچن نەك لە پراکتیزەکارانی سیاسەتی هاوچەرخ! با ئێمە خۆمان و خەڵکیش بەهەڵدا نەبەین: تەنانەت پێش بڕیاری ئەمەریکا بۆ لێدانی عێراق، وێڕای تکا و ڕجای هەموو دونیا ئەوان ئامادە نەبوون لەگەڵ یەکتر دابنیشن. تەنیا ئەو کاتەی ئەمەریکا داوای لێکردن، یاخود ڕاستترە بڵێین: ناچاری کردن، ئەمجا دانیشتن و پێکەوە کەوتنە

بیرکردنەوەو ئەمەش جێی دڵخۆشیی هەموومانە. لێرەوە هەندێك شت بۆ ئێمە ڕوونتر بۆتەوە: قسەکردنی ئەوان لە قسەکردنێکەوە لەسەر بەرژەوەندییە حیزبیەکان گۆڕا بۆ قسەکردنێك، نەك لەسەر ئایندەی کوردستان، بەڵکو لەسەر ئایندەی عێراق. ئەمەش موفاجەئەیەکی تری ئەوانبوو، هەروەکو چۆن دروستکردنی سەرکردایەتییەکی هاوبەشیش لە نەوەی کۆنی ئەو دوو حیزبە کە زۆربەیان عەسکەرین نەك سیاسی، بەلامانەوە موفاجەئە بوو. بۆیە لەگەڵ ڕێزی تایبەتیم بۆ ئەم سەرکردایەتیەو خەباتی دوور و درێژیان، وەلێ ئەم سەرکردایەتییە بۆ من ناسنامەیەکی ڕوونی نییە، چونکە زانیارییەکی زۆر کەممان لەسەر ماهیەتەکەی هەیە و کەناڵی بەدەستهێنانی زانیاریش لەبارەی سیاسەتی ئەم دوو حیزبەوە لەسەر ئەم بارودۆخەی ئێستا و پەیوەندی کورد پێیەوە، ڕوون نییە. چونکە ئەوان زیاتر لەوەی باسی کوردستان بکەن لەپاش جەنگ، باس لە عێراقێك دەکەن کە کۆی مێژووی ئەوان بریتی بووە لە هەوڵدان بۆ گۆشکردنی ئێمە لەسەر ئەوەی کە وڵاتی ئێمە کوردستانە نەك عێراق. ئەمە جگە لەوەی کە لەسیاسەت و مێژووی ئەواندا هەمیشە ڕەمز و سێمبوولەکان، ڕەمزی کوردیانە بوون نەك عێراقیانە. ئەم دوو فاقییە لە سیاسەتی ئێمەدا وایکردووە هەمیشە مەودایەك لە نێوان خەڵك و سەرکردایەتی سیاسیماندا هەبێت. تەنانەت ئەم مەودایە لە ئاستێکدایە کە ماوەیەك لەمەوبەر وەختێك خەڵکی شارەکان دەیانویست لە دژی هاتنە ناوەوەی لەشکری تورکیا خۆ پیشاندان بکەن، دەسەڵات حەزی بەمە نەبوو. بۆیە ناتوانم وەڵامێکی ڕوونی پرسیارەکەت بدەمەوە هێندە هەیە ئەم سەرکردایەتیەی ئێستا وەك ئەوەی کە هەیە و ناوی دەبەین لەم شەڕەی ئەمەریکادا بێلایەن نییە و لایەنگرە. چونکە پێیوایە ئەمە فرسەتێکی ترە کە لە ڕێگەی هێزی سوپایی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانییەوە ئێمەی کورد لەگەڵ گەلانی دیکەی عێراقدا ڕزگارمان دەبێت لە زوڵم و چەوسانەوەی ڕژێمێك کە لە ڕاستیدا ئێمە باش دەیناسین بەڵام تا ئێستا نەمانتوانیوە بەو کەرەستانەی هەمانە لەوە زیاتر کە ڕاپەڕینێك بکەین و لەم هەرێمە بیکەینە دەرەوە، شتێکی دیکەی بەرامبەر بکەین. بەڵام تۆ کە لایەنگری و لە دژ نیت، واتە ئامادەییت تیایە بچیتە ناو شەڕەوە بەبێ ئەوەی لایەنگرییەکەت ڕوون بێت و

سنوورەكانیت ڕوونكردبێتەوە. تا كوێ لایەنگریت؟، لە چی لایەنت گرتووە؟، ئەم لایەنگربوونەت لەسەر حیسابی چیی ئایندەی میللەتی ئێمە تەواو دەبێت؟ و بەو لایەنگیریەت میللەتەكەمان و ئەزموونی دوازدەساڵەی حكومەتی هەرێمی كوردستان دەخەیتە بەردەم كام مەترسیانە و هتد؟ وەڵامی ئەم پرسیارانە هیچیان ڕوون نین. ئێمە دەزانین كە لە كۆنگرەی بەرهەڵستكارانی عێراقیدا پرۆسەیەك ڕوویدا كە بریتی بوو لە بەعێراقیكردنەوەی كوردستان و ئەمەش دەقاودەق پێچەوانەی پرۆژەی سیاسی كورد بوو، بە تایبەتی لەو كاتەوە كە ڕژێمی بەعس لەم ناوچەیەدا بیرووڕاو شێوازە ستەمكاریەكانی خۆی پیادە دەكات. ئەم حیزبانە ئێمەیان وا گۆش كردووە كە ئەم ڕژێمە ڕژێمێكە دەبێت خۆمانی لە دەست ڕزگار بكەین و كوردستان بەشێك نییە لە عێراقی گەورە. بەڵام لە كۆنگرەی لەندەن و دواجار لە دانیشتنەكانی سەلاحەدینەوە، جارێكی دیكە كەوتینەوە ناو تێزێك كە دەڵێت كوردستان بەشێكی جیا نەكراوەیە لە عێراقی یەك پارچە. تەنانەت كورد ئیمزای دەكات كە بە هیچ شێوەیەك ویستی دروستكردنی كیانێكی سەربەخۆی بۆ نەتەوە و میللەتی كورد نیە و بەم قسەیەش كۆی شەرعیەتی ئەزموونی دوانزە ساڵەی حكومەتی هەرێمی كوردستان دەخرێتە ژێر پرسیارەوە. لایەنگیریی ئێمە ڕوون نیە، بەو مانایەی ئێمە نازانین بۆ نموونە كەركوك، كە تا دوێنێ بووك و دڵی كوردستان بوو، لە عێراقی داهاتوودا چ پێگەیەكی دەبێت. ئەوەی ئێستا دەتوانین تەئویلی بۆ بكەین ئەوەیە كە لە عێراقی داهاتوودا كورد وەك دەسەڵات، لە چاو ئەم دوانزە ساڵەی ڕابردوودا لە هەموو ئاستەكانیدا زۆر بچووك دەبێتەوە و ڕەنگە ئەو سەركردە سیاسیانەی كە چاوەڕێیان لێ دەكرا ببنە سەركردەی نەتەوەیی، ببنە كەسانێك كە هەندێك كارو باریان پێ بسپێردرێت كە زۆر نزمترە لەو پێگەیەی كە ئێستا هەیانە. دڵی خۆمان بەوە خۆش نەكەین كە لە عێراقی داهاتوو دا ئێمەی كورد خەڵكانێك دەبین ڕۆڵی گەورەمان پێ دەدرێت. من لەوە تێدەگەم بۆچی سەركردایەتی كورد بەشێكی زۆریان لایەنگیری لەم شەڕە دەكەن، چونكە دوژمنێكی گەورە لەبەر دەممانایە كە بە هێزی كورد خۆی لێی ڕزگار نابین. بەڵام هێشتا ڕوون نییە ئەو لایەنگیرییە لەسەر حسابی كام مەسەلانەیە و

تا چەند ئەوەی داهاتووش دەبێت پابەند بن بەو بەڵێنانەی کە پەیوەندییان هەیە بە سامان و ئابووری کوردستانەوە، دەبێت تا چەند ساڵی تر لە بەرامبەر ئەمەریکادا و لەبەر خاتری ئەوەی (ڕزگاری کردووین) وەفادار بین؟ بۆ نموونە: تا چەند ساڵی تر نەوتی کەرکوك لە ژێر کۆنترۆڵی کۆمپانیا ئەمەریکییەکاندا دەمێنێتەوە؟

**ڕادیۆی ئازادی:** ***بە بۆچوونی تۆ شەڕ دوا چارە بوو ... هیچ ڕێگایەکی دیکە نەبوو بۆ ڕووخانی ڕژێم؟***

**ڕێبوار :** هاوڕێی ئازیز، تازە شەڕ دەستیپێکردووە و ئێستا ئێمە لە دۆخی نا ئاسایی شەڕداین! بۆیە گەڕانەوە بۆ ئەو ڕێگایانەی دیکە کە ئەگەر بگیرانایە بەر، ڕژێم دەڕووخا یان نا؟ پێموایە کاتی بەسەر چووە. ئێمە لەشەڕداین و ئێستا باجی شەڕ دەدەین. شەڕ حاکمی نێوان ئاسمان و زەویە! ئەوەی لەسەر ئەم بارودۆخەش دەتوانین بیلێین ئەوەیە: کە بە داخەوە بۆمان دەرکەوت ئێمەی کورد دیسانەوە زۆر بە تەنیاین! بە تەنیاین لەوەی کە لایەنگیریمان لە شەڕی دژی بەعس و وێنا کردنمان بۆ ئەمەریکا وەك ڕزگارکەرێك، تا چەندە تەندروستانەیە، کە من پێموایە ئەمەی دواییان تەندروستانە نییە.. چونکە هەموو هێزی ڕەخنەیی ئێمەی لەبەرامبەر ئەمەریکا و تەماعەکانی ئەمەریکا، سڕیوەتەوە. دەبوو ئێمە وەکو میللەتی کورد هەندێ ڕابردووی خۆمان لەگەڵ ئەمەریکاو دەوڵەتەکانی تردا بیر نەچوبایەتەوە کە لە کاتی ناسکدا پشتیان تێکردوین، دەبوو مەرجمان هەبوایە بۆ دەستپێکردنەوەمان لەگەڵیاندا و یەکێك لە شەرعیترینی ئەو مەرجانەش بریتی بوو لە ئیعترافکردنی ئەمەریکاو هاوپەیمانەکان بە ئەزموونی دوانزە ساڵەی حکومەتی هەرێمی کوردستان. تەنیاییکی تری ئێمە ئەوەیە کە لە ناو دنیای ئیسلام و عەرەب و خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا، دەگمەنن ئەو میللەتانەی ئەمڕۆ هێرشی ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانیان بۆ سەر بنکەکانی ئەم ڕژێمە خوێنڕێژە پێخۆش بێت. بۆیە دەتوانم بڵێم: ڕێگاچارەیەك لە بەردەمی ئێمە دا ئەوەیە کە لەم دۆخەدا بە جیدی چارەنووسی خۆمان بخوێنینەوە و لەگەڵ یەکتردا ڕاستگۆ بین. ئێستا لە لای ئێمە ئیرادەیەکی بەرز هەیە بۆ بەرەنگار بوونەوە و پێشمەرگە دەیەوێت شەڕ بکا و میللەتی ئێمەش دەیەوێ لە تارمایی بەعس

ڕزگاری ببێت و بۆ ئەمەش قوربانییەکی زۆری داوە و ئامادەیە قوربانی دیکەش بدات. بەڵام لەگەڵ ئەم ئیرادە بەرزەشدا بە بڕوای من لاساریی دەکەین گەر گەشبین بین و سادەیی بەسەر بیرکردنەوەماندا زاڵ ببێت. ئەم ساتە وەختە مێژووییە وا دەخوازێ ئێمە ڕەشبینی بە ئیرادە بین، نەك گەشبینی بێ ئیرادە.

**ڕادیۆی ئازادی:** ***فیدرالیزم بۆتە دروشم و کاری بۆکراوە، ئێستا سەددام ڕژێمەکەی دەروخێ و دەگەینە عێراقی ئاییندە، ئەو عێراقەی چەندین ساڵە چاوەڕێی دەکەین، بەڕای تۆ چی بکەین بۆ ئەوەی ئەو فیدرالییەتە لە ئاییندەی عێراقدا هەر دروشم نەبێت؟***

**ڕێبوار :** لە ماوەی ئەم دوانزە ساڵەی ڕابردوودا هەندێ چەمك فرێدراونەتە ناو پانتایی ڕۆشنبیریی سیاسی و فیکریی و بیرکردنەوەی ئێمەوە، لەوانە چەمکی کۆمەڵی مەدەنی، دیموکراسییەت، بە نموونە بوونی کوردستان بۆ دیموکراسییەتی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و هەروەها فیدرالیزم. ئەم چەمکەی دوابیان ڕۆژانە لە لایەن سیاسەتمەدار و ڕۆشنبیرە دەزگاییەکانیانەوە لە شوێنی شیاو و نەشیاودا دووبارە و سەدبارە دەکرێتەوە. فیدرالیزم وەك ئەوەی بەڕەسمی پێناسە کراوە، بریتییە لە کۆکردنەوەی چەند یەکەیەکی جیاواز لەسەر خاکێك کە ئەمانە بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان هەیە و ئیدارەیەکی ناوەندی هەموویان پێکەوە. کێشەی ئێمە ئەوەیە ئایا لەو چەند ساڵەی ڕابردوودا چەندە کار کراوە بۆ ئەوەی تۆ لەناو ئەو یەکە فرە جیاوازییەدا بژی کە ناوی عێراقە؟ تۆ هەمیشە وا ئیشتکردووە، کە ئەتەوێت وەکو کورد جیاوازییەکانی خۆت ئاشکرا بکەیت بۆ بەرامبەر و بەرامبەریش بە جیاوازییەکانتەوە قەبووڵت بکات. ئەمڕۆ فیدراڵییەت لە تێگەیشتنە کوردییەکەیدا دەقاودەق پێچەوانەی ئەم خستنە ڕووەیە، چونکە پێتدەڵێ: من وەکو کورد هیچ جیاوازیەکم لەگەڵ ئێوە نییە و ئامادەم بۆ لەگەڵ ئێوەمانەوە واز لە هەموو جیاوازییەکانی خۆم بهێنم. هەر ئەم خستنە ڕووەیشە کە وادەکات ئەندامەکانی دیکەی بەرهەڵستکارانی عێراقی بڵێن: سەرکردە کوردەکان لە ئێمە عێراقیترن. من کێشەیەکم لەگەڵ ئەم تێگەیشتنەدا نیە ئەوە نەبێت کە نابێت عێراقیبوونم لەناو یەکەیەکی ئیداری سیاسیدا، ببێتە هۆی سڕینەوەی کۆی

هەموو ئەو شتانەی کە کوردبوونی من پێکدەهێنن. کەواتە فیدرالیزم کاتێك نابێتە درووشم، کە هیچ چەپاندنێك لە خودی کوردیانەی مندا دروستنەکات و ئەو شتانەم بەسەردا فەرز نەکات کە دوورم دەخەنەوە لە مومارەسەکردنی خودی خۆمدا وەك کوردێك. چونکە ئەگەر رێگەم پێنەدرێت وەك کوردێك خۆم پێناسە بکەم، ئەوە هەر پێناسەکردنێکی تر، دەمخاتە ناو گێژاوێکەوە کە بەر لە هەر شتێ بۆ خۆمی تێدا نغرۆ دەبم. بۆیە ئێمە ئیشکالیەتی زۆر گەورەمان هەیە لە هێنانی چەمکەکان و ئیشپێکردن و تەوزیفکردنی ئەو چەمکانە بۆ خوێندنەوەی واقیعی خۆمان. پێموایە ئەو بەشەی کە رەشبینییەکەی من پێکدەهێنێت ئەوەیە، کەلە عێراقی داهاتوودا، رۆڵی کورد لە ئاستی بریاردانی سیاسیدا زۆر بچووك تر دەبێتەوە، چونکە بمانەوێت و نەمانەوێت ئەم دوانزە ساڵەی رابردوو، وێرای هەموو ئەو ناخۆشی و قەیرانانەی کە لە لایەن هێزە ناوخۆییەکانی کوردەوە بەسەر میللەت و کۆمەڵگای کوردیدا سەپێنران، بۆنی ئەوە دەهات کە ئێمە لە پێکهاتەیەکەوە، کە چەند یەکەیەکی تەقلیدیی بە کۆمەڵبووی بچووکی وەك (خێڵ، عەشیرەت و بنەماڵە)بووین، ببینە کۆمەڵگایەکی یەکگرتوو. واتە ئەو دوانزە ساڵە پرۆسەی بە کۆمەڵگابوونی لەم ناوچەیەدا خستە سەر گەرو ئەمەش دەستکەوتێکی باش بوو.

**رادیۆی ئازادی:** ***بۆچی هەست بەتەنیایی کورد دەکەیت لەم سات‌ەوەختەدا؟***

**رێبوار** : ئێمە تا ئەم چرکە ساتە قوربانیی دەدەین و کەچی دەگمەنن ئەوانەی بەراستی دۆستایەتیمان دەکەن. زیاتریش هەستدەکەین کە لە ناو دنیای موسوڵمان و عەرەبیدا تەنیاین، کە ئێمە شتگەلێکی کەمیشمان پێشکەشی شارستانییەتی ئیسلامی و مێژووی عەرەبیش نەکردووە!. تەنانەت جاری وا هەیە بیر دەکەمەوە: کە یەك تورکیا نییە بیەوێ هەموو مافەکانت پێشێل بکات لە پێناوی ئەو شتەی کە ئەو پێی دەڵێ ئاسایشی نەتەوەیی، بەڵکو کۆی وڵاتە عەرەبییەکان لە چرکەساتێکدا دەبنە چەندین تورکیای تر بۆ ئێمە. لە وڵاتێکی وەك میسردا کە لیبرالیترین وڵاتی عەرەبە و خاوەنی کۆنترین ژیارە کە نامۆ نەبووە بە لێبووردەیی و ئێمە بنکەی دیالۆگی عەرەبی-کوردیمان تیادا دامەزراندووە، زۆرترین دەنگ دێتە پاڵ دیکتاتۆرێکی وەك

سەددام حسێن و کێشەکەی ئێمە دەکرێتەوە قوربانی و داکۆکیکردن لە سەدام دەبێتە ئەرکێکی ئایینی و بۆ ئەمەش جیهاد ڕادەگەیەنن. ئەم جیهادەش لە لایەن کەسانێکەوە ڕادەگەنرێ کە کورد باش دەناسن و هاتوونەتە کوردستان و میوانداری باش کراون.. ئەگەر بۆ داکۆکی کردن لە سەددام، جیهادکردن ئەرکێکی ئاینی بێت، ئەی باشە کاتێك ئەو هەموو خەڵکە لەم وڵاتەدا تیا دەچوون، بۆ کەسێ ئامادە نەبوو وەك مسوڵمان داکۆکی لە میلەتی ئێمە بکات. کەواتە ئاگایی دۆستەکانمان و برا دینییەکانیشمان لە ئاست تراژیدیاکانماندا، نابێتە ڕێگر بۆ ئەوەی سیمای دیکتاتۆریانەی سەدام ببێتە سیمایەکی زوڵم لێ کراو!. لەمەش ناخۆشتر ئەوەیە کە لە ماوەی ئەو دوانزەساڵەی دەسەڵاتداریی کوردیدا، ئەم هەموو دەعوەت و پەیکەر و فیستیڤاڵەمان بۆ کەسایەتییە عەرەبییەکان چێکرد و دیوانی شیعریانمان بۆ لە چاپدان، چ سوودێکمان لێ بینین بۆ ئێستامان؟ ئەم شەرمنیە سیاسیەی کە ئێمە بە خەرجمان داوە، هەمیشە لەسەر حسابی جیاوازییەکانمان بووە لەگەڵ کۆمەڵگاکانی دەوور و بەرماندا و هەر ئەوەشە وا دەکات کە ئێستا ڕای گشتی عەرەبی بە جۆرێ ڕەفتار دەکا، وەکئەوەی هیچ شتێ دەربارەی کێشەی گەلانی عیراق نازانێ لە سایەی ڕژێمی بەعسدا؟ ئایا هەموو ئەمانە بەس نین تا ترسی تەنیاییمان تێدا دروستبکەن، بەتایبەتی کاتێ ئەمەریکاش جگەلەوەی خاکەکەمان دەکاتە گۆڕەپانی جەنگ، پێناچێت هیچ مژدەیەکی بۆ ئێمە پێبێت؟!

# شار و توندوتیژی

## گفتوگۆی: بێستون نوری و شاخەوان عومەر

{پرسیاری ئەمەریکییەکان دوای ١١ی سێپتامبەر: بۆچی جیهان ڕقی لەئێمەیە؟ ئاسایش و شار، شاری بێئاسایش. هۆکارەکانی نەبوونی متمانە لە نێوان و حکومەت و هاووڵاتیاندا. تیرۆریستەکان خەڵکی دەرەوەن یان ناوەوە؟ کولتووری شار و توندوتیژی لەشاردا. ئایین و توندوتیژی و دەزگائاینییەکان. ڕۆڵی مەلاکان لە کەمکردنەوەی توندوتیژیدا و هتد.}

***شاخەوان: لەدوای ڕووداوەکەی (١١)ی سێپتەمبەر، ئەمریکیەکان لەخۆیان پرسی: بۆچی خەڵك ڕقی لەئێمەیە؟ دیارە ئەمریکا وەك دەڵێن لەڕووی سیاسی و ئابوورییەوە سەرداری جیهانە، لەبەرامبەر ئەمەشدا گەلانێك هێشتا بەمافەکانی خۆیان نەگەیشتوون،هێشتا بەشێکی زۆری خەڵکی جیهان برسیەتی تەنگی پێ هەڵچنیون.. بەڵام ئایا دەکرێ ئێمەی کوردیش، کە هێشتا کیانێکی سیاسیی دانپیانراومان نییە وەك ئەمەریکییەکان لەخۆمان بپرسین: تیرۆریستان بۆچی ڕقیان لەئێمەیە و بۆچی ئێمە بوینەتە ئامانجیان؟***

سیوەیلی: من لەوبڕوایەدام ئەو پرسیارەی ئەمریکیەکان لەدوای تێکشکانی ئەوان لە جەنگی ڤێتنامی شەستەکانی سەدەی بیستەمدا سەریهەڵدا، بەتایبەتیش لەکاتێکدا کە ئەمەریکا چاوەڕێی وەها پرسیارێك نەبوو، چونکە پێشتر ئەمەریکا پاش جەنگی دووەمی جیهانی لەڕێگەی (پلانی مارشاڵ)ەوە زۆربەی وڵاتە ئەورووپاییە خەسار لێکەوتووەکانی وەك ئەڵمانیا و نەمسا و فەرەنسا و دانمارکی بووژاندبۆوە. کەچی

ئەمە نەبووە ڕێگر لەبەردەم ئەو ڕقەی لەزۆر شوێنی جیهان و لـە ئەورووپاشـدا یەخـەی ئەمەریکییـەکانی دەگـرت. لەوکاتـەوە ڕقبوونـەوە لەئەمـەریکا و خۆشەویـستی بـۆ ئەمەریکا لەلایەن غەیرە ئەمەریکییەکانەوە، ئەو دوو جەمسەرەن کە قـەدەری مرۆڤـی ئەمەریکی دەستنیشان دەکەن و بەبیری دەهێننەوە کـە لەهـەر شـوێنێ ئەمـەریکایان خۆشویست، هەر لەهەمان شوێنیش ڕقێکی زۆر لە ئەمەریکا هەیە. ئێرانـی سـەردەمی شا باشترین نمونەی ئـەم بۆچوونەیە، چـونکە ئێرانـی ئەوسـا باوەشـی بـۆ ئەمـەریکا ئاوەڵا بوو، کەچی هەر لەوێش ساڵی (١٩٧٩) گەورەترین سزای ئەمەریکا درا.. ڕەنگـە هەر ئەمەش بێت وا بکا ئەمەریکا لە ئاستی سیاسـیدا و لـەو کاتانـەدا کـە ڕووبـەڕووی قەیران دەبێتەوە، ئەوەندە بەدوای (دروستکردن و دۆزینەوە)ی دۆست و هاوپەیمان و لایەنگرانیـدا بگـەڕێ و دنیـا بۆسـەر دوو بـەرە کورتبکاتـەوە کـەبێگومان بەرەیـەکیان ئەوەیە لەگەڵ ئەمەریکادایە و بەرەی دووەمیش لە دژیـەتی. هـیچ دوور نییـە ئەمـەش لەوەوە هاتبێ کە بەڕاستی ئەمەریکا نە خۆی دۆستی ڕاستەقینەی هـیچ میللەتێکـە و نە هیچ میللەت و نەتەوەیەکیش بە دۆست و هاوپەیمانی ڕاستەقینەی خۆی دەزانێـت. بۆیە هەروەك چۆن ئەمەریکا ناوبەناو دوژمنەکانی دروسـتدەکات، ئـاواش دۆسـتەکانی دەسازێنێ و هەندێجاریش لە دۆستە کۆنەکانی دوژمنی نـوێ دادەتاشـێ.. لەئـەنجامی ئەم مامەڵەکردنەوەیە کە ئـەو پرسـیارە بەدرێـژایی مێژوویـەکی دووردرێـژ چـۆتە نـاو کۆنەستی گەلی ئەمەریکییەوە و بەبڕوای من ئەوەش لەئـەنجامی ئـەو هەڵـە گەورانـەی کەسیاسـەتی دەرەوەی ئـەمریکی لەمامەڵـە کردنیـدا لەگـەڵ وڵاتـانی تـر، لەگـەڵ میللەتانی تر، لە هەڵوێستیدا بەرامبـەر بزووتنـەوە ئازدیخوازەکـانی تـر لـەدنیادا تێـی کەوتووە، دروستبووە. دەتوانم بڵێم ئەو پرسـیارەی ئەمریکیـەکان پرسـیارێکی لـەپڕ نـەبوو کەپەیوەنـدی هـەبێت بـەڕووداوی (١١)ی سـێپتەمبەرەوە، بـەڵکو پرسـیارێکە بەردەوام لەناخی مرۆڤی ئەمەریکیدا ئامادەیی هەیـە و هـەر ئەمەریکیـەك دەچـێت بـۆ وڵاتێکیتر، چەندە لە ناوخۆی وڵاتەکەیدا متمانە و باوەڕی بەخۆیەتی‌و لـەخۆی ڕازیـە، ئەوەندەش ترس و ڕاڕایی هەیە لە ڕووبەڕووبوونەوەی لەگـەڵ خـەڵکی وڵاتـانی تـردا و پرسیاری شـاراوەی ناونـاخی هـەر ئەمەریکییـەك ئەوەیـە: چـەندە خۆشـیان دەوێـم و

چەندەش ڕقیان لێمە؟ بێگومان ئەمەش لەو ئاگاییەوە هاتووە مرۆڤی ئەمریکی هەیەتی بەرامبەر بەو هەڵانەی کەسیاسەت لەولاتی ئەودا بەسەر ئەوەوە باری کردووە.

ئەم پرسیارە سەبارەت بەئێمەی کورد جۆرێکی ترە: جاریٚ ئێمە وەك میللەتێك هەرگیز دەوڵەتێکمان نەبووە بوبێتە هەڕەشە بەسەر نەتەوە و دەوڵەتێکی ترەوە، ئێمە لەو نەتەوە گەورانەی جیهان نین کە گەورەیی نەتەوەییمان لە هێرشبردن بۆسەر ئەوانیتر و جینۆسایدکردنیاندا دۆزاندبیٚ. کورد میللەتێکی بچکۆلەیە و هەرگیز پرۆژەیەکی سیاسی و کولتووریی وەهامان نەبووە بۆ سڕینەوەی ئەوانیتر. بۆیە ئێمەش وەك زۆربەی نەتەوە ئازادیخوازەکانی دیکەی دنیا، (گەورەیی نەتەوەیی) خۆمان بەو باجی خوێنە پاراستووە کە لەبەریان ڕشتووین، نەك خۆمان کردبێتە (نەتەوەیەکی گەورە) لەئەنجامی ڕشتنی خوێنی ئەوانیترەوە. کەواتە پرسیاری وەکئەوەی: بۆچی تیرۆریستان ڕقیان لەئێمەیە؟ پرسیارێك نیە ڕووبەڕووی چۆنێتی پەیوەندیەکانی خۆمانمان بکاتەوە لەگەڵ ئەوانیتر، بەڵکو پرسیارێکە پێماندەڵێت: ئەوانیتر چۆن ڕووبەڕووی ئێمە بوونەتەوە. بەبڕوای من هۆی کردنی ئەو پرسیارە لە ئێستادا و لەلای کورد، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پانتاییەی تیرۆر خۆی کاری تیادەکا.

تیرۆر پانتایەکی ڕەنگاو ڕەنگ، یاخود بابڵێین ڕەنگێکی تایبەتی نییە. تیرۆر لەپانتاییەکی، یان وەك (مایکڵ ئیگناتیف) گوتویەتی: لە زۆنێکی خۆڵەمێشیدا کاری خۆی دەکا. پانتایی خۆڵەمێشی، پانتاییەکە ڕەنگێکی تایبەت و دیاریکراوی خۆی نییە و ئامانجێکی دەستنیشانکراوی خۆیشی نییە. بۆیە تیرۆر ڕوو لەهەر کۆمەڵگایەك بکا، ئەوجا چ ئەو کۆمەڵگایە خۆی زەمینەسازیی کرسبیٚ بۆ بەرهەمهێنانی تیرۆر (چونکە توندوتیژیی قەبووڵدەکات و یەکێك لەدەرهاوێشتەکانی توندوتیژیش بریتییە لەتیرۆر کردن)، چ ئەو تیرۆرە لەدەرەوە هاتبیٚ و خزێنرابێتە ناو ئەوکۆمەڵگایەوە و بەسەریدا سەپێنرابیٚ، ئەوە بەهەرحاڵ ئامانجی تیرۆر ئامانجێکی تایبەت نییە. بیٚ ئامانجی، تەقاندنەوە و وێرانەجێهێشتن، دروستکردنی ئاشووب و شێواندنی ئەو دۆخەی پێی دەگوتریٚ ئاسایشی گشتی کۆمەڵایەتی و دەستدرێژی کردنە سەر گەورەیی مرۆڤەکان

وەك ئـەوەی کـە هـەن، ئەمانـە ئـەو ئامانجانـەن کـەکردەی تیرۆرستانە بەرهـەمی دەهێنن.

دەربارەی وەڵامی ئەو پرسیارەی: بۆچی تیرۆرستان کوردسـتان دەکەنـە ئامانجێك؟ بەبڕوای من ئەم جۆرە تیرۆرەی کەڕووی کردۆتە ئێمە پەیوەندی هەیە بـەم هەرێمـەوە کە ناوی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستە، پەیوەندیی هەیە بەم چەند دەوڵەتەی کوردسـتانیان بەسەرا دابەشکراوە و پەیوەندیی هەیە بەجۆری ئەو کۆمەڵگایانـەی دراوسـێی ئێمـەن. ئێمە دەبینین کۆمەڵگاکانی دراوسێی ئێمە کۆمەڵگای داخراو و تەقلیدین و باوکسالاری و نێرسـالاری لـە بنـەما پیرۆزەکانیـانن. ئەمـە چ بـۆ کۆمـەڵگای فارسـزمان، چ بـۆ کۆمەڵگای توورکزمـان و چ بـۆ عەرەبزمانـەکانیش هـەر ڕاستە. پاشـان لەهـەموو ئـەو دەوڵەتانەدا کە ئەو کۆمەڵگایانە دەبەن بەڕێوە (یان سەرکوتیان دەکەن)، جۆرێـك لـە ناسیۆنالیزم و جۆرێك لەدینسالاری دەستیان خستۆتە نـاو دەسـتی یـەکترەوە. وەلـێ هـــەم ناســـیۆنالیزمەکەیان لـــە هەڵوێـــستیدا بەرامبـــەر بـــەکورد شـــۆڤێنیانە و ڕەگەزپەرســـتانەیە، هـــەم دینـــسالارییەکەشیان بەرامبـــەر بـــە میللـــەتی ئێمـــە فەندەمەنتالیستانە و ئامرازگەرایانە بـووە. واتـە هـەم خۆشەویـستی و بـەپیرۆزکردنی ڕەگـەز و نیشتیمانی خۆیـان لەسـەر حسابی ڕقبوونـەوە و پیـسکردنی نیـشتیمان و ڕەگەزی ئێمەوە بووە و هەم ئایینەکەشیان کردۆتە ئامرازێك بۆ خزمەتکردن بـەخۆیان و بۆ ملکەچکردن و بێدەنگکردنی ئێمە. کەواتە بەدرێژایی مێژوو هەم شـوڤێنزمی ئـەم ناوچـەیە و هـەم دینـسالارییەکەی، دوو دانـە هۆکـاری زۆر سـەرەکی بـوون بـۆ کـۆنترۆڵکردنی مرۆڤـی کـورد و بـۆ سـەرکوتکردنی هـەموو ئـەو گوتـارە کوردیانـەی لەئاستی کولتووری، سیاسی و لەئاستی بزاڤە کۆمەڵایەتیەکاندا بەمەبەستی ئازادبوون لە ستەم سەریانهەڵداوە. هەر هەموو ئەو گوتارانە بەچـە کوشـێك یـان بەلێـدانێك کـە لەلایـەن شـۆڤێنزمی عـەرەبی، فارسـی، توورکییـەوە زەمینەسـازیی بـۆ کـراوە و لـە چوارچێوەی دینسالارییەکەشیاندا، واتە بەهۆی سیاسـیکردنی ئیـسلام و بـەکارهێنانی دین وەك دەسەڵاتێك، شەرعیەتیانداوە بە هەموو جۆرە تونـدڕەوی و تیرۆرێـك لـەدژی میللەتێك کە ناوی کوردە و گونـاهی ئەوەیـە لـەناو هـەمان جەنگەڵدا دەژی کـە نـاوی

خۆرهەڵاتی ناوەڕاسته.. ئائەم میکانیزمە ئایینگەرا شۆڤێنیە بەدرێژایی مێژوویەکی بەرچاو، کۆنترۆڵی هەموو ئەو پانتاییەی کردووە کەناوی پانتایی ژیانی کوردیە و بۆئەمەش زۆر لە دەوڵەت و میللەتانی تریان کردۆتە هاودەنگ و پشتیوانی خۆیان.

وەلێ ڕاستییەکی مێژوویی هەیە نابێت لەبیرمان بچێت: لەم سیانزەساڵەی دواییدا، بەتایبەتی کەجۆرێك لەخۆبەڕێوەبردن لەم پارچەیەی کوردستاندا سەری هەڵداوە، ئەم تەوژمی دینسالاری و هێشووە شۆڤێنزمەی عەرەب و فارس و تورك، هەستیان بەو مەترسیە کردووە کەخەریکن کۆنترۆڵی ئەم ناوچەیە کە کوردستانە لەدەست دەدەن و پانتایی ژیانێکی کوردیانە دروستبووە، کەمرۆڤی کورد تیایدا بەجۆرێکی تر بیر لەخۆی دەکاتەوە و جیاواز لەو ناسنامەیەی ئەوان بەسەریاندا سەپاندبوویان، خۆی پێناسە دەکاتەوە. هەروەها ئەو شوێنەی بەردێژایی مێژوو بۆخۆی کۆنترۆڵی کردبوو، خەریکە دەبێتە مەترسی و خەریکە لەدەستی دەردەچێ. بۆیە ئەم شۆڤێنزم و دینسالاریە پێویستی بەوە هەیە سەر لەنوێ خۆی پێناسە بکاتەوە، خۆی بسەلمێنێتەوە، خۆی وا لێبکات ببینرێ و بۆئەمەش پەنا بۆجۆرەکانی توندوتیژی و تیرۆر دەبات. هەروەکو چۆن پێشتریش لە تیرۆرکردن و لەسێدارەدانی کەسایەتیە کوردییەکاندا پەنای بۆ هەمان شێواز بردبوو.

هەڵبەت ڕاستییەکی تریش هەیە کە پێماندەڵێت: ئێمە بە ئەوان نامۆ نین، ئەوانیتر کۆمەڵگای ئێمە باش دەناسن و لەنزیکەوە توێژینەوەیان لەسەر کردوین. ئەویتر لە ئاست و لە دژی ئێمەدا نەزان و کوێرانە کاری نەکردووە. من بەهیچ شێوەیەك پێموانییە ئەوان کوێرانە بێن لەکۆمەڵگای ئێمەدا تیرۆر بەرهەم بهێنن ئەگەر نەزانن کۆمەڵگای ئێمە بۆ خۆی هەڵگری ئەو خەسڵەتانەیە کە تیایدا توندڕەوی ئەتوانێ قبوڵ بکرێ. ئێمە لەکۆمەڵگایەکدا دەژین کە توندڕەوی بەشێکە لە پێکهاتە و تێکەڵ بە دەمارەکانی بووە. توندڕەوی ئەوەندە بۆ ئێمە ئاساییە کەئێمە خۆمان نایبینین و خوومان پێوە گرتووە. لە ژیانی ڕۆژانەماندا توندڕەوی ئەوەندە تیاماندا ئامادەیە کە ناتوانین وەك بەشێك لەدەرەوەی خۆمان تەماشای بکەین. ئێمە لەنێوان ئەو دەستەی کە بۆ سڵاوکردن لەئاست یەکتردا بەرزی دەکەینەوە و هەمان دەست کە

دەبێتە مشتێ بۆ لێدانی یەکتر، هێڵی زێڕینی ناوەند، بەمانا ئەرستۆییەکەی ناناسین.
بۆیە ئەو دەستەخۆڵەمێشیەی کە دێتە ناو کۆمەڵگای ئێمەوە زۆر باش دەزانێ لەم کۆمەڵگایەدا، مەسەلەی خشونەت و توندڕەوی شتێکی ئاساییە و دەکرێت بۆ مەبەستەکانی خۆی بەکاری بهێنێ. ئەگەر دڵمان بەوە خۆش دەکەین کە گوایە ئەوانەی لە کوردستاندا کاری تیرۆریستی دەکەن، یان هاوکاریی تیرۆریستان دەکەن، دەماخیان سڕدراوەتەوە و چیدی مرۆڤ نین، ئەوە هەڵەیەکی گەورە دەکەین. چونکە تیرۆریستان بەسوود وەرگرتن لە زەمینەکانی توندوتیژی لە کۆمەڵگای کوردیدا و بە دۆزینەوەی مرۆڤە تۆرێنراوە، بە پەراوێزکراوەکانی ناو ئەم کۆمەڵگایە، کاری خۆیان بەهۆی مرۆڤی ژیر و ساخ و سەلیمەوە جێبەجێدەکەن، نەك مرۆڤی نەخۆش و دڕندە و بێدەماغ. کەواتە دەمەوێت جەخت لەسەر ئەوە بکەم: ئێمە بۆیە بووینەتە ئامانجی تیرۆریستانە، چونکە لەگەڵ هەموو شەرمنییەکی سیاسیشماندا خەریکین خۆمان لەو پێناسەیە قوتار دەکەین کە ئەویتر بۆ ئێمەی مەترسیدار هەیەتی. ئێمە چیدی لەچاوی ئەوەوە هەرتەنیا برای دینی نین، بەڵکو ئەو بوونەوەرە مەترسیدارەشین کەپڕۆژەی بەعس لەماوەی سی و ئەوەندەساڵدا ویستی لە زەینی هەموو عەرەب و مسوڵمانێکی ناو جەنگەڵستانی خۆرهەڵاتی ناویندا بەرجەستەی بکات. بۆیە ئەم ترسە وای لێ دەکا کە پێویستی بەخۆ پێناسەکردنەوە هەبێ لەکۆمەڵگای کوردیدا، ئەیەوێ ئەو کابوسەلای ئینسانی کورد زیندوو بکاتەوە کە: هێشتا تۆ لەژێر کۆنترۆڵی منداى، تۆ ئازاد نیت و ناتوانی سەربەخۆ بیت، تۆ ناتوانی بڕیار لەسەر چارەنووسی خۆت بدەیت و لەو قەفەسە ئاسنینە بێیتە دەرەوە کە من بۆم هەڵبەستویت.

***بێستوون: ئەم قسانە بەرەو پرسیارێکمان دەبات کە پەیوەندیی بەباروبۆخی ئەمنیی ناو کۆمەڵگاکەمانەوە هەیە: لەم چەند مانگەی دواییدا، لەلایەن دەزگاکانی ئاسایشەوە هەندێك ڕێوشوێن بۆ پاراستنی ئاسایش پەنای بۆ براوە کە بەشێوەیەکە دەرەقەتی ڕووداوەکان نایەت، یاخود پێتوانیە ئەم ڕێوشوێنانە زۆر تەقلیدی بن؟***

سیوەیلی: زۆر لەگەڵتاندام، پێموایە لەو چەند مانگەی دواییدا، لەوکاتەوە کە یەکەمین هەوڵدانە تیرۆریستەکان هاتنە ناو شاری هەولێرەوە، ڕێوڕەسمێکی زۆر تەقلیدیانەی

ئاسایش گیرایە بەر، کە لەچاو ڕووداوەکاندا زۆر لاواز و بێ بەرنامە بوون. دوای یەکەم تەقینەوە لەلایەن وەزارەتی ناوخۆ و ئاسایشەوە مژدەی ئەوەمان پێدرا کە ئەوان ئاگاداری ئەو هەوڵدانانەن و زانیاریی تەواویان هەیە. بەڵام بەبێ ئەوەی ڕوونکردنەوەی پتر بدەن و کەسەکان ئاشکرا بکەن، بیانهێننە سەر تەلەفزیۆن و گفتوگۆیان لەگەڵ بکەن و زانیاری و خۆراکێکی مەعنەوی بدەن بەخەڵك بۆ ئەوەی ئەوانیش ئامادەبکرێن تاوەکو بەشێك بن لەهێزی بەرەنگار بوونەوە. تەقلیدیەتی ئەو ڕێوشوێنانە لەوەشدا بەرجەستە بوو، کاتێ بینیمان یەکەمین هەوڵدانەکانی ئاسایش و دەزگا حیزبییەکان بریتیبوو لە قایمکردنی دەوروبەری بینایەکانی خۆیان و قوتکردنەوەی ئەو بۆڕیە لە چیمەنتۆ دروستکراوانەی لەبەردەمی بارەگاکاندا پڕیانکردوون لەگڵ و تا بڵێی دیمەنێکی ناشیرینیان هەیە. من لەوکاتەوە زۆر هەستم بەتەنیایی خۆم دەکرد و ئەو کردەوەیە وەهای لە خەڵکی ئاسایی ئێمە کرد هەست بکات: ئاسایش لە م وڵاتەدا وەك هێزێك خۆی و دەزگا ڕەسمیەکان دەپارێزێ نەك خەڵك و ژیانی مەدەنی. تۆ بەوەی بێی سنورێك دروست بکەی لەنێوان دەزگاکەی خۆت و ماڵەکانی گەڕەکدا، لە نێوان ماڵی هاووڵاتی و ماڵی دەسەڵاتدا، ئەوە گوتیشت کە ئاساییش وەك دەزگایەك پاراستنی خۆی دەخاتە پێش پاراستنی ژیانی هاوبەشەوە. بەبڕوای من ئەمە بەشێکی تەسلیم بوونیش بوو بەو لۆژیکە هەڵەیەی کە دەڵێ: تیرۆر تەنیا ڕوودەکاتە دەزگا ڕەسمییەکان، لەکاتێکدا هەر لەو سێ مانگەی دواییدا هیچ تیرۆرێك لە هەولێر ڕووینەداوە بەبێئەوەی خەڵکێکی زۆری مەدەنی نەکردبێتە قوربانی. لەلایەکی ترەوە ئەمجۆرە خۆ ئامادەکردنە و دروستکردنی بەربەستەکان بەتایبەتی لەبەردەم دائیرە ڕەسمییەکاندا بۆخۆی ئاماژەدانێك بوو بۆ تیرۆریستان و ڕێگا چۆڵکردنێکیش بوو بۆیان تا لەسنووری دەرەکیی شار بێنە ژوورەوە، چونکە ئێمە تەنیا لەناو شاردا ڕووبەڕوویان دەبینەوە.

***بێستوون: مەبەستت ئەوەیە دەبوو ئاساییش لە دەرەوەی شار بەربەستی لەبەردەمی تیرۆریستاندا دروست بکردایە؟***

سیوەیلی: بەپێی دابەشکردنێك و تێگەیشتنێکی زانستیانە لەشار، شار دوو سنووری سەرەکیی خۆی هەیە: سنووری دەرەکی، کە بریتییە لەدەروازەکانی شار، خوارەوە و سەرەوە و خۆرئاوا و خۆرهەڵاتی شار و سنووری ناوەکی شار، واتە ئەوشوێنەی کە ژیانی مەدەنی و ڕۆژانەی خەڵك تێیدا دەگوزەرێ. ئاسایشی ئێمە لەو ڕووەوە تەقلیدییە کە وازی لەسنووری دەرەکی هێنا و یەکسەر هاتە ناو ئەو پانتاییەی کە سنووری ناوەکی شار پێکدێنێ، ئەمەش لەکاتێکدا ئەرکی ئاساییش بریتیە لە پاراستنی سنووری دەرەکیی شار بۆئەوەی ئاسایش و دڵنیایی ومتمانە بگەڕێتەوە بۆناو مەرکەزی شار. هەڵبەت لەبیرمان نەچێت کە چەمکی ئاساییش وەکو چەمکی پۆلیسی هاتوچۆچەمکێکی مۆدێرنە و لەگەڵ دروستبوونی پانتایی گشتیی و ژیانی مەدەنیی هاووڵاتیاندا دروستبوون. واتە ئێمە دواجار ئاسایشمان بۆچییە ئەگەر ئاسایشێك نەبێ کە هاوڵاتیان هەست نەکەن لەسایەیدا حەواونەتەوە و سنوورەکانی ژیانی مەدەنیانەیان بۆ دەپارێزێ؟! ئەوەی جێگەی سەرسوورمانی من بوو ئەوە بوو لەوسێ مانگەی دواییدا و لەدوای یەکەمین تەقینەوەکان، هێزەکانی ئاساییش بەو ژمارە زۆرەیان ڕژانە سەر شەقامەکان، بۆ نێو جادەڕێکان، بەدروستکردنی شلووقیەکی زۆر، بەڕاگرتنی خەڵك بەبێ هیچ ڕوونکردنەوەیەك، بەبەکارهێنانی ئسلوبێکی ناشایستە و نامەدەنی و ڕەق کە بیر هێنانەوەی ئسلوبی بەعسە، خۆیان بوونە بەشێك لەنائاسایش لەنێوشاردا. واتە هێزەکانی ئاسایش لەجیاتی ئەوەی لەدەروازەکانی شاردا، تەئمینی ئاسایشی ناوشار بکەن، بەوەی کەخۆیان هاتنە ناوشارەوەو ئەم شێوازانەشیان لەگەڵ خەڵك بەکارهێنا، خۆیان بوون بەشێك لەنائاسایشی ناوشار و جۆرێك لەپشێویو جۆرێك لە نائەمنیان دروستکرد و ئەو هەستەیان خەملاند، کە ئاساییش بەدوای تاوانبارێکی دیاریکراودا ناگەڕێت، هێندەی ئەوەی هەموو هاووڵاتیان وەك تاوانبار تەماشا دەکات. ئەمە جگە لەوەی بە چۆڵکردنی سنووری دەرەکیی شار، دەروازەکانیان بۆتیرۆرستان خستە سەر پشت تاکو بەئاسانی بێنە ژوورەوە و بە گرتنی شەقامەکانی دەوروبەری بینایەی پارێزگاریی

(محافەزە) و گواستنەوەی دەوامی وەزیری ناوخۆ بۆ ئەوێ، کارەکە تەواو شێوا و شار بەجارێك لە خەڵك سەندرایەوە.

***بێستوون: ئایا ئەم شێوازی ئیشکردنە چ کاریگەرییەك جێدەهێڵێت؟***

سیوەیلی: دڵنیابە لە ڕووی دەروونییەوە کاریگەریی زۆر جێدەهێڵێت. لەبیرمان نەچێت نەوەی ئێستا نەوەیەکە لەماڵ وەك ناوەندێکی ژیان وەڕزە و زیاتر حەز بە ژیانێك دەکات لەناو پانتاییە گشتییەکاندا، لە مەیدانەکانی شاردا، لە سەر شەقامە پیادەڕۆکان، لەناو قەیسەری و بازاڕەکاندا. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ماڵ وەك ناوەندێك بۆ حەوانەوە، پێگەی خۆی لای نەوەی نوێ لەدەستداوە. نەوەی نوێ ئینسانێکی گەڕۆکە و حەز بەتاقیکردنەوەی شوێنەکان دەکا، حەز دەکا بەلای کەمەوە دوای دەوامکردن، دوای نانخواردن، دوای بەجێهێنانی ئەرکە کۆمەڵایەتیەکانی لەناوخێزاندا، ڕۆژی جارێك یان دووجار بەناو شاردا بڕوا و پیاسە بکا، خۆی بنوێنێ، وزەی خۆی بەتاڵکاتەوە و بخولێتەوە و خۆی سەرقاڵ بکات. بەڵام تۆ وەختێك دێی شوێنە گشتیەکان، ئەوانەی خەڵکی زۆر ڕووی تێ دەکەن و شوێنە تەرفیهیەکانی شار هەرهەمووی بەبەربەست (حاجز)ی کۆنکرێتی دەگریت و ژمارەیەکی زۆری پۆلیس و ئاسایش دەنێریتە سەرشەقامەکان، بەجۆرێ کەخەڵك نەتوانێ پیاسەی پێدا بکەن، ئەمە بۆخۆی دەبێتە هۆی دروستکردنی گوشارێکی دەروونی لای هاووڵاتیان. ئەمە بۆخۆی سەندنەوەی شارە لە خاوەنە سەرەکییەکەی شار کە بەهۆی پیاسە و خۆ نواندنەکانییەوە بەسەر شەقامەکاندا، دەیەوێت بڵێت: منیش هەم، ئەم شارە هی منە. تۆ سێ مانگە ئەم مافەت لە خەڵك سەندۆتەوە کە ئەم شارە بەهی خۆی بزانێت و کردوتە بە شارێك کە ئامادەیە بۆ جەنگ، بەبێ ئەوەی لە جێگەیدا تاوانبار و تیرۆریستێکت پێ ناساندبێت. بەبێ ئەوەی بە زانیاریی ورد قەناعەتت پێکردبێت. بەبڕوای من ئەمەش کاریگەریەکی زۆری کردەسەر دەروونی خەڵکەکە لەوەی کەبەشێك نەبن لەوهێزەی کەئەشێ ئاسایشی شار بپارێزن و یارمەتیدەری هێزەکانی ئاسایش بن لە چاودێریکردنی ژینگەی ژیانی خۆیاندا.

لەلایەکی تـرەوە ئێمـە نـازانین پێوەرەکـانی دەزگـای ئاسـاییش چییە بـۆ وەرگـرتنی ئەندامـەکانی و ئـەو خەسـڵەتانە چـین کـە بـۆ وەرگـرتنی کارمەنـدەکانیان ڕەچـاویان دەکەن؟ ئایا ئەو پێوەرانـە خوێنـدەواری و شـارەزایی کۆمەڵایەتییـە؟ یـان پێوەریـان بریتییە لە غەیبزانی و ڕووخساری خـەڵك خوێندنـەوە و بـە تەماشـاکردنێك حوکمـدان بەسەر ئەوەی ئەم ڕێبوارانە کامەیان باشـە و کامـەیان خراپـە؟ ئایـا ئـەوان کۆرسـیان وەرگرتووە لەوەدا کە هـەر ڕێبوارێـك ڕیشی هـەبوو بەگومانـەوە سـەیری بکـەن، یـان پـسپۆڕن لـە خوێندنـەوەی بـەری دەسـتی خـەڵك و قاوەگرتنـەوەدا؟ مـن نـازانم پێوەرەکانی ئاسایش بۆ وەرگرتنی ئەندامەکانی خۆی چییە، وەلێ دەزانم بۆ نموونـە: لەماوەی یەك مانگدا ئاسایش ناونووسی (١٥٠٠) کەس دەکا و ئەمانـەش ئەوکەسـانەن دێنـە سـەرجادە و داوای شـوناسو پێنـاس لـەمن و تـۆ دەکـەن و بـچوکترین هەڵـە و سیماگۆڕی و چاوگێڕان بەوە لێکدەدەنەوە گوایە ئێمە تاوانبارەکەین. ئەها! هەنگمان لەدارا دۆزییەوە و کاکی تیرۆریست بەپێی خۆی هاتە بەردەممان! من ئاساییشم دیوە لەگەڵ لێخوڕێکی ناسیاویدا حەکایەتی کردووە و ڕیزێکی زۆری ئۆتۆمبێلی ڕاگرتووە تا قسەکانی تەواو کـردوون، دیـومن لەگـەڵ شـۆفێرێکدا قـسەیانکردووە و کـە زانیویانـە سەیارەی تر وەستاون، بەدەستێکی لەپشت سەریەوە ئامـاژەی بـۆ ئـەوانیتر کـردووە کە بڕۆن! دیومن هەڕەشەیان لە گەنجێك کردووە کـە لەگـەڵ باوکیـدا هاتۆتـە دەرەوە بۆئـــەوەی فێـــری لێخـــوڕین ببێـــت، لەســـەر ئـــەوەی لەبەردەمیانـــدا ســـتۆپەکەی خشاندویەتی.

ئەتوانم بڵێم ئاسایش لەوەرگرتنی ئەندامەکانی خۆیشیدا تەقلیـدی بـووە، بـەڵکو هـیچ پێـوەرێکی ئەوتۆشـی نـەبووەو بڕواناکـەم تازەکارێـك لـە بـواری ئاساییـشدا هـیچ کۆرسێکی تێپەڕاندبێت و لەوێدا فێرکرابێت پێویستە چۆن لەگەڵ خەڵکدا هەڵسوکەوت بکات. ئەتوانم بڵێم ئەوەی کە بۆ ئاسـایش گـرنگ نـەبووە بریتـی بـووە لـەوەی خـەڵك هەست بکا ئەم ئاسایشە بۆ پاراستنی ئاساییشی ئەوانە. ئـەوان بۆیـان گـرنگ نـەبووە خەڵك تێبگەیەنن: وەستانی ئاسایشێك لەسەر شەقامێك لە خزمەتی ئەودایە. پێموایـە ئەوە تێنەگەیشتنە لەئەرکی ئاسایش کە نەتوانێت وەکو دەزگایـەك لەخـەڵك بگەیـەنێ

کەوەستانی کارمەندەکانت، شەونخونیان، سەرماو گەرما چەشتنیان لەسەر ئەو شەقامانە، بەجێهێشتنی ماڵ و منداڵیان، هەمووی لە پێناوی خەڵك و ئاسایشی گشتی و ژیانی هاوبەشدایە. لەجیاتی ئەوە وێنەی ئەوە دروستبکەیت کە تۆ بۆخۆت بەشێکی لە نائاسایش و دروستکەری نائارامی، پێموایە ئەمە فەشەلێکی زۆر گەورەیە کە دەزگای ئاسایش خۆی لەبەردەمدا دەبینێتەوە، ئەگەرچی یەکێکە لەو دەزگایانەی بودجە و مەسرەفێکی زۆریشی خراوەتە بەردەست.

***شاخەوان: لەو بڕوایەدایت ڕێگای دەرچوون لەم فەشەلە چییە؟***

سیوەیلی: یەکەم شت ئەوەیە خۆت ددان بە کەموکوڕیەکانتدا بهێنیت و هەموو ئەو وزەیە بگێڕیتەوە بۆ خۆت کە بۆی هەیە لەکاتی بەرگریکردنی ڕۆتینیانە لە هەڵەکانتدا سەرفی بکەیت. ئەگەر دانت بە کەموکوڕیەکانتدا نەهێنا و ڕەخنەت لێگیرا، خەڵك لەخۆت دوور نەخەیتەوە و داوای ڕاوێژ و ڕێگاچارە و تەگبیر بکەیت، واتە مەسئولیان بکەیت لەئاست قسە و پێشنیارەکانیاندا نەك بیانخەیتە قەفەسی تاوانبارانەوە و دەعوایان لەسەر تۆمار بکەیت و وەك ئەوەی زانایانی ئایینی و وەزارەتی تەندروستی دەیکەن: بێیت فەتوایان لەسەر دەر بکەیت! دەزگایەکی ڕەسمی کە بەپارەی میللەت بەڕێوە دەچێت، پێویستە قەبووڵی نارەزایی و ڕەخنەی ئەندامانی میللەتیش بکات.. لەمە بترازێ، بەبڕوای من پێویستە ئاسایش لەسەر سێ تەوەر ئیش بکات، یەکەم: پێناسەکردنەوەی ڕۆڵی ئاسایش لەم کۆمەڵگایەدا و دوورخستنەوەی ئەو پێناسەیە لەهەموو ئەو وێنایانەی کولتووری بەعس بۆ دەزگای ئەمن و ئاسایش لە زەین و یادوەریی خەڵکیدا دروستیکردبوون. دووەم: بە ئینسانیکردنەوەی پەیوەندیی نێوان ئاسایش و هاووڵاتیان و خۆ ڕزگارکردن لە هەموو حوکمێکی پێشینە لەسەر چین و توێژەکانی کۆمەڵگا، لەسەر گەڕەکە هەژار نشینەکان و هاووڵاتیانی پەراوێزی شار و ئەوانەی ڕەفتاری کۆمەڵایەتی و ئایینی جیاوازیان هەیە. سێهەم و لەهەموویشی گرنگتر: پشتبەستن و پەنابردن بۆ توێژینەوەی مەیدانی و تیۆری لەسەر کۆمەڵگا و بڕواهێنان بە لێکۆڵینەوەی زانستی لەسەر دیاردەکان نەك ئیجتیهاداتی تایبەتی و گوزارش لێدان و هتد.

***شاخەوان: هەروەها ئاسایش ئامێری پێشکەوتووی نییە بۆ ئاشکراکردنی تاوانباران و مامەڵەکردن لەگەڵ مادەکانی تەقینەوەدا..؟***

سیوەیلی: لەو ڕووەوە دەزگای ئاسایش دەزگایەکی هەژارە و نەیشیتوانی پێشبینی ڕووداوەکان بکا لەم وڵاتەدا. ئێمە ماوەیەکی زۆر لەکەناڵە عەرەبیەکانەوە تەماشاکەری تەقینەوەکانی شارەکانی باشوور و ناوەڕاستی عێراق و موسڵی تەنیشت خۆمان بووین (بەداخەوە کەناڵە کوردییەکان بۆ کڕینەوەی ڕووخساری هاوپەیمانان و لەبەر ئادابی میوانداریی کوردیانە، لەو هەواڵانە بێبەشیان کردین!). بۆیە وەك تەماشاکەر نەمانتوانی خۆمان بۆ ڕووبەڕووبوونەوە ئامادە بکەین، بەبێ ئەوەی داوا لەهاوپەیمانامان بکەین کەدەوڵەمەندمان بکەن بەئامێرە پێشکەوتووەکانی کۆنترۆڵکردن، ئاشکراکردن، تۆمارکردن، وێنەگرتن و خونساکردنەوەی مەوادی تەقەمەنی. دەبوو لایەنە ڕەسمییەکانی ئێمە هەر لەسەر ئەوە ئیشیان نەکردبا کە کوردستان شوێنێکی ئاساییشە، بەڵکو بیریشیان کردباوە لەوەی ئێرەش ئامانجێکی سەرەکیی تیرۆریستان دەبێت و بۆئەمەش لەقاییمکردنی سنوورەکانەوە دەستیان پێکردبا. دەبوو دەزگاکانی ئاساییشی ئێمە پێشبینی ڕووداو بکەن، نەك ڕووداو یەخەیان بگرێ و ناچار بەتراژیدیا و تەقاندنەوەیان بکات. پێموایە کێشەی هەرەگەورەی ئاسایش بۆ داهاتووشی ئەوەیە، پێویستە جیاوازی بکا لەنێوان (سنووری دەرەکی شار)، کە ئەرکی پاراستنی لەئەستۆی خۆیەتی، بۆئەوەی (سنوری ناوەکی شار) ئاسایشی بۆ بگەڕێتەوە، کە پێویستە ئەرکی پاراستنی ئەو ئاساییشە لە ئەستۆی پۆلیسی فریاکەوتن و هێزە مەدەنیەکان بێت. هەتا ئاساییش لەناو سنوری ناوەکی شاردابێ، ئەوا مەترسیی تەقینەوەو پشێوی لەناوخەڵکی مەدەنیدا زیاد دەکا و متمانەی خەڵکیش بەئاسایش کەمدەبێتەوە. بەڵام هەتا ئاسایش بچێتە دەرەوەی شار و دەروازەکانی شار و ماوەی نێوانیان بپارێزێ، ئەوەندە ناوەوەی شار خاوێن دەبێتەوەو دەبێتەوە ژیانێکی مەدەنیانە و ئەمنیەتی بۆ دەگەڕێتەوە.

***شاخەوان: متمانە، یان دوروستکردنەوەی سەر لەنوێ پەیوەندی لەنێوان دەسەڵات وخەڵکدا بەتوندی هەستی پێدەکرێت، هۆکارەکانی نەبوونی ئەو متمانەیە چین و چۆن دەکرێت ئیش لەسەر تازەکردنەوەی بکرێ؟***

سیوەیلی: متمانە لەبواری سۆسیۆلۆژیادا چەمکێکی نوێیە، بەپێی تێگەیشتن لەم چەمکە، پەیوەندیی هەر دەزگایەك، هەر فەرمانگەیەك یان هەر شوێنێکی ڕەسمی بە خەڵکەوە و تەنانەت لە پەیوەندیی نێوان دوو مرۆڤیشدا، ئەگەر متمانەی لێ دەربکەین نابێتە پەیوەندی. متمانە ئەو دۆخەیە کە لە مەترسی و ریسك دوورمان دەخاتەوە و تەنیا ئەو کاتەش دەتوانین لە پەیوەندیدا بین کە لە مەترسییەوە دوورین. بۆیە دەتوانین بڵێین بۆ پێناسەکردنی هەر جۆرە پەیوەندییەك پێویستیمان بەگەڕانەوە بۆ چەمکی متمانە هەیە. متمانە ئەو ساتە وەختەیە کەتیایدا من و تۆ بەبێ بەڵگە هێنانەوە لەسەر ئەوەی من چەندە دڵسۆزی تۆم و تۆ چەندە دڵسۆزی منیت، بتوانین هاوکاری یەکتر بکەین و هاوکاریەکەمان ببێتە هۆی بەرزکردنەوەی متمانەمان بەیەکتر. کەواتە مەسەلەی متمانە هەرتەنها دروشمێك نییە، بەڵکو سەرمایەیەکی ڕەمزیشە پێویستە بەدەست بهێنرێت. ئەم چەمکە هەر دەستنیشانکەری پەیوەندی لەنێوان دەزگا ڕەسمیەکان و جەماوەردا نیە، بەڵکو لەپەیوەندیە سۆزگەرایەکانی تاکە مرۆڤەکانیشدا دەستنیشانکەرە. تۆ لەپەیوەندی خۆشەویستیدا متمانەی لێ دەرکەیت شتێك نامێنێتەوە بەناوی پەیوەندی خۆشەویستی. کەواتە متمانە زاراوەیەکە ئەمڕۆ دەتوانین پێناسەی پەیوەندی مرۆڤی بەدەوروبەری خۆیەوە پێبکەین و پێناسەی پەیوەندیی دەزگاکانیشی پێ بکەین لەگەڵ خەڵکدا.

ئەوەی کێشەیەکی زۆر گەورەیە لەوڵاتی ئێمەدا، ئەوەیە تۆ هیچ دەزگایەکت نییە چاوێکی زیادی هەبێ بۆ چاودێریکردنەوەی پەیوەندیی خۆی بە هاووڵاتیانەوە، هیچ دەزگایەکمان نییە لیژنەیەکی دامەزراندبێ لەخەڵکانی شارەزا، لە ڕاوێژکارانی تایبەت، کە بۆنموونە مانگی جارێك یان (مەمنوونین گەر ساڵی جارێك) ڕەفتاری ئەم دەزگایە لەگەڵ خەڵکدا بخەنە ژێر پرسیارەوە و بتوانن وەکو چاوێکی زیادە شتی نوێ بۆ ئەو دەزگایە ببینن، پێێ بڵێن ڕەفتاری هەتا ئێستای ئێوە لەگەڵ خەڵکدا ئەمە

ئەنجامەکەی بووە و گرفتی ئێوە ئالێرەدایە و دەتوانن گرفتەکەتان بەم شێوەیە چارەسەر بکەن. متمانە ئالەوێدا سەر هەڵدەدا کەتۆ چاوێکی زیادە دروست بکەی، تا خۆتی پێ ببینیتەوە، خۆتی پێهەڵسەنگێنی و بزانی لەکوێدا بۆ شاییت دروستکردووە لەنێوان خۆت و خەڵکێکدا کەتۆ ئیشیان بۆدەکەیت. بۆیە لەدەزگا رەسمیەکانی ئێمە و بەتایبەتی لەئاسایش داوای زانیاری و ڕوونکردنەوەکردن، نەشیاوە. تۆ ئێستا بچۆ لەسەر ئەو جادەیە کە مەفرەزەی ئاسایش وەستاوە لێی بپرسە: بۆ دەم پشکنی؟ پێت نالێ و ڕەنگبێ لێشت توڕەبێ. لەکاتێکدا زۆر پێویستە و مافێکی مەدەنیانەیە خەڵکی زانیارییان هەبێت و ئاسایش متمانە دروست بکات لای تۆو پێت بڵێ: هۆی ئەم پشکنین و سەیارە ڕاگرتنانە لەچیەوە هاتووە. چونکە گەر ئەمەت پێ نەڵێ، پەرچەکردارت لەلا دروست دەکات و کەئەمەشی کرد، تۆ بەشێوەیەك لەشێوەکان متمانەی خۆت لەگەڵ ئەو دەزگایە لەدەست دەدەی. نەبوونی تێگەیشتن و دەرکێکی تایبەت لە چەمکی متمانە لەناو دەزگا رەسمیەکانی ئێمەدا، بەبڕوای من زەربەیەکی زۆر گەورەی لەو دەزگایانە داوە.

ئەگەر وەزیری ناوخۆ لەجیاتی خۆ شاردنەوە و تەسلیمبوون بە لۆژیکی تیرۆریستان (کە بەڕاستی دەیانەوێ ئەو خۆی بشارێتەوە!)، بهاتبا و چەند جارێ لەسەر جادەکان و لەگەڵ ئاسایشەکاندا دەرکەوتبا و بەرپەرچی هەڕەشەچییەکانی داباوە، بڕوانە ئێستا چ متمانەیەکی لەلای خەڵکی دروستدەکرد! بەڵام ئەگەر ڕەمزی کێشەکە نەیتوانی ڕووبەڕووی کێشەکە ببێتەوە، ئەوە خۆی دەتوانێ بەشێك بێ لەدروستکەری بێ متمانەیی لەنێوان دەزگاکەی و خەڵکدا و سەرمایەی ڕەمزیی بۆ دەسەلات دروست نەکات. بۆیە پێموایە وەزیری ناوخۆ وەك شەخسی خۆی و پاشان ئەو داخراوەییەی لەدەوری ئەو وەزارەتە و دەزگاکانی هەیە، ڕۆڵیان کەم نەبووە لە تەشەنەسەندنی ڕووداوەکان و دابەزاندنی متمانەی ئاسایش لەپەیوەندیی بە خەڵکەوە. ئەوان نەیانتوانی خەڵك بکەنە بەشێك لە پرۆژەی بەرەنگاربوونەوەی تیرۆریزم لەشارێکی وەکو هەولێردا و مەترسییەکە وەك مەترسیی بۆسەر ژیانی مەدەنی پێناسە بکەن، نەك وەك مەترسیی بۆسەر ژیانی تاکەکەسێك و دەزگا ڕەسمییەکان. هەڵبەت من لەو

بڕوایەدا نیم دەزگاکانی ئاسایش بتوانن بەتەنیا هەموو ئاسایشی شار بپارێزن، بەڵام لەوبڕوایەدام ئەگەر دەزگاکانی ئاسایش بتوانن متمانە لەلای خەڵك دروست بکەن، دەتوانن ئاسایشی شار بەرێژەیەکی زۆر بەرزتر بپارێزن. بۆیە ڕوودانی تراژیدیای واگەورە وەکو ڕووداوی ڕۆژی ١/ ٢ هەر ڕووداوێك نییە بۆ ئیدانەکردنی ئەو بوونەوەرانەی لە ڕاگەیاندنی کوردیدا بە (شەمشەمەکوێرەکانی شەو) ناو بران، بەقەدەر ئەوەی ڕووداوێکیشە دەبێ ناچار بەخۆدا چوونەوەمان بکا لەهەموو ئاستەکاندا. تەنانەت لەئاستی وەزارەتدا، لەئاستی ئاسایشدا کە خۆیان قوربانیان داوە، شەهید و بریندارییان داوە و بوونەتە ئامانجی تیرۆرستان لەشاری هەولێر، بەڵام نابێ ئەم برینداری و ئەم ترژایدیایە وامان لێبکا چاو لەو هەڵە گەورانەی وەزارەتی ناوخۆ و لەو هەڵە گەورانەی دەزگای ئاسایش بپۆشین و ناچاریان نەکەین بۆ ئەوەی بەخۆیاندا بچینەوە. ئەم ڕووداوە لەهەر وڵاتێکی تردا، کە نیوئەوەندەی وڵاتی ئێمەش ئیدیعایەی دیموکراسیەتی تێدا ناکرێت، ڕوویدابا، ئێستا لەمێژ بوو وەزیری ناوخۆ داوای لێبوردنی لەکابینەکەی خۆی دەکرد و داوای لێبوردنی لەمیللەت دەکرد و ماڵئاوایی لەو کورسیە دەکرد کە لەسەری دانیشتووە.

بێستوون: ***زۆر جار لەراگەیاندنەکان وادەگوترێ کە خەڵکانێك لەدەرەوەرا دێن تیرۆر دەکەن، ئایا ئەمە بازدانێك نیە بەسەر ڕاستییەکدا کە پێماندەڵێت: لەناوەوەش دەستێك هەیە بۆ هاوکاریکردنیان؟***

سیوەیلی: لەوەڵامی پرسیاری یەکەمدا هاتمە سەر ئەوە و گوتم: کۆمەڵگای ئێمە بۆخۆی پانتاییەکە بۆ بەرهەمهێنانی توندوتیژی و توندڕەوی. بێمانایە ئێمە بەردەوام ئیش لەسەر ئەو تیۆریە بکەین کەدەڵێت هەمیشە دەستانێکی چەپەڵ لەدەرەوەی کوردستان، ناحەزان بەدیموکراتی و ئازادی و کرانەوەی کۆمەڵگای ئێمە، دەیانەوێ بێنە ناو کۆمەڵگای ئێمەوە و گەرەکیانە ئەو ئاسایشو ئازادیو دیموکراسیەتەی کەگوتاری سیاسی پێناسەی دەکا، لە ئێمە بشێوێنن. من پێموایە کۆمەڵگای کوردییش بۆ خۆشی ئەو سەرانە، ئەو چاو و دەستانەی پەروەردە کردوون کە لێرە دەبنە تەگبیرکەر و ڕێپیشاندەر و تەوقەلەگەڵکەری ئەو جەستەیەی لە یەمەن و

سعودیه و هەر وڵاتێکی تری عەرەبی و مسوڵمانەوە دێت خۆی بتەقێنێتەوە. بەهیچ شێوەیەك من لەگەڵ ئەو تیۆرییەدا نیم کە بە (تیۆریی پلانگێری) بەناوبانگە و لەسەر ئەوە کار دەکا هەمیشە سەرچاوەی قەیرانەکانی ناوخۆ بگێڕێتەوە بۆ دەستێکی بێگانە کە بەردەوام پلان بۆ تێکدانی دۆخی ئێمە دادەنێ. ئێمە بۆخۆمان هەر لەماوەی ئەو سیانزە ساڵەی دواییدا جۆرێ لەمرۆڤمان پەروەردە کردووە، کە ئامادە بووە لەسەر گرتنەوەی کەپك و تەپۆڵکەیەك و بندارێك، خۆی بەکوشت بدات و چەندانیشت بۆ بکوژێ. ئێمە لەناو مرۆڤگەلێکدا دەژین کە لە نێوان چوونە دەرەوەو هاتنە ژوورەوەیەکدا خوشکەکەی خۆی دەکوژێت و ئەمەش ناودەنێت قەتڵی نامووس و کەسیش گوێی ناگرێت! ئێمە لەماوەی ئەو ساڵانەدا، شەڕی ناوخۆی خۆکوژیمان کردووە، شەڕی ئیسلامی سیاسییمان کردووە، شەڕی گێریلامانکردووە، لەئاشتبوونەوەدا ئەوپەڕی سەختگیریمان پیشانداوە و مرۆڤی کوردمان لەڕاڕایی و چاوەڕوانیەکی زۆر غەریبدا ڕاگرتووە.. هاوڕێی ئازیز: تۆ ئەگەر ئێستا سەیری تەلەفزیۆنەکان بکەی، یان گوێ لەڕادیۆکان بگری و ئەگەر ڕۆژنامەکان بخوێنییەوە، دەبیستی و دەبینی مرۆڤی کورد چەندە داوای یەگرتنەوەی ئیدارەکان دەکا و چۆن دەنگی خۆی کردووە بە یەك دەنگ. وەلێ ئەوە بەتەنیا تەعبیرکردن لە خواستێك نیە کە هەستی نەتەوەیی دروستیکردبێت، بەڵکو تەعبیرکردنیشە لە زەلیلبوونێکی نەتەوەیی بەدەست دوو حیزبەوە کە وایانکردووە یەك میللەت لەوە زیاتر کە تکا و ڕجا لەوان بکات، هیچ قسەیەکی تری بۆ گوتن نەمابێت. هیچ خەونێکی نەمابێت و هیچ وزەیەکی داهێنانی نەمابێت تا بیر لە خۆشکردنی ژیانی خۆی بکاتەوە. میللەتی یەکدەنگی ئێمە لەبەردەم دوو خواوەندی نامۆتەعالیدا زەلیلانە دەپاڕێتەوە و دوعای گیرا نابێت. سەیر لەوەدایە هەردوو ئەم حیزبە دەسەڵاتدارەی کوردستان هەناسە بڕکەیانە لەسەر چڕینەوەی ئەو گۆرانیانەی باس لە دیموکراسی و مافی مرۆڤ دەکەن. بەڵام بیریان دەچێت دیموکراتیانەترین کردار ئەوەیە گوێ لە داخوازیی خەڵك بگریت و جوانترین ڕەچاوکردنی مافی مرۆڤیش ئەوەیە خەڵکی ئەوەندە لە عینادیەکانی خۆتدا زیندانی نەکەی، کە هەست بە زەلیلبوونی خۆیان بکەن.

***شاخەوان: لەنێو شاردا بەمانا هاو چەرخەکەی کولتوورێك بەرهەم دێت لەفۆرمێکی مۆدێرنانەدا و ئەم کولتوورەش ئاستێکی نوێتر لەپەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان دەهێنێتەئاراوە. ئەگەر ئەمە بکەینە پێوانەیەك بۆ هەڵسەنگاندنی شارەکانی لای ئێمە و بەتایبەتیش شاری هەولێر، تۆ ڕەوشەکە چۆن دەبینی: ئاخۆ هەست ناکەیت شارەکانمان بەهەموو پێکهاتەکانیانەوە درێژکراوەی گوندبن، لەگەڵ ئەوەشدا کە دەزانین کولتووری گوند خێڵەکیە و زەمیەنەی فراوانبوونی توندڕەوی زیاتر تێدایە؟***

سیوەیلی: ئەوەندەی من ئاگادار بم، لە زانستی شارناسیدا، مێژوونووسان و کۆمەڵناسانی شار باس لەچەندین جۆری شار دەکەن بەبێئەوەی بوونی شار ببەستنەوە تەنیا بە کولتووری مۆدێرنەوە، چونکە شار مێژوویەکی پێش مۆدێرنیشی هەیە. ئەوە ڕاستە شار خاوەنی کولتوورێکی تایبەت بەخۆیەتی، کە ئەمەش لە ڕەفتاری هاوشارییەکاندا ڕەنگدەداتەوە و بێکاریگەر نییە لەسەر زەینیەت و تێڕوانینیان بۆ دنیا. هەروەها ڕاستە لەڕووی فۆرم و پێکهاتەوە شاری ئێمە، پێکهاتەیەکە جیاوازە لە گوند، ئێمە لەشاردا گەڕەکی دووورودرێژ، شەقامی پان و پۆڕ، سەنتەری شار، بازاڕ، دائیرەکان، نەخۆشخانەکان و باخچەکان، پەراوێز و دەوروبەری شارمان هەیە کە هەموو ئەمانە شار لەشوێنێکی دی جیادەکەنەوە کەناوی نا– شارە، یا دەشێ ناوی گوند بێ (ئەگەرچی هەمیشە جیاوازیی نێوان گوند و شار نابێتە فاکتەرێکی جیاکەرەوە، بەتایبەتی لە کۆمەڵگا پیشەسازیەکاندا کە سنوورە تەقلیدیەکانی نێوان شار و گوند لەناو چوون و کاڵبوونەتەوە)، بەڵام لەلای ئێمە هەتا ئێستاش شیاوە شار بەو پانتاییە پێناسە بکەین کە لەدەرەوەی شار خۆیەتی، واتە گوند، یان ناشار. شاری کوردستان هەمیشە شارە بەبەراورد لەگەڵ گوند و ناشاردا، نەك بەبەراورد لەگەڵ شاری وڵاتانی دراوسێ، یان شاری خۆرئاوا. بێگومان کاتێ شار بەبەراورد بە گوند پێناسە دەکەین، ئەوە هەڵبەت لەڕووی کولتووریشەوە ئەو دوو شوێنەمان لەیەکتر جیا کردوونەتەوە. دەکرێ بگوترێ: ئێمە لەئاستی فۆرمدا شارمان هەیە، شێوەی شارمان هەیە« بەڵام ئێمە شاری بەگوندبووشمان هەیە و سرووشتی گوند لەشاردا، ڕەنگدانەوەی زۆر تایبەتی خۆی هەیە. وەلێ ئەوە بەو

مانایە نییە کە توندڕەوی شار، توندڕەوییەکە لەگوندەوە هاتووە. گوند بەوە تاوانبار نەکەین کە تەنیا توندوتیژی بەرهەم دەهێنێ، چونکە میکانیزمی کۆنترۆڵکردنی توندوتیژیش بەرهەم دەهێنێ. هەروەها ئەوەشمان بیر نەچێت کە شار بۆ خۆشی دەتوانێ توندڕەوی بەرهەم بهێنێ، هەروەکو چۆن دەشتوانێ تەنیایی بەرهەم بهێنێ، هەروەکو چۆن دەشتوانێ بێدەرەوەستی و بێموبالاتی و مالیخولیا و سەرگەردانی و دڵەڕاوکێ و چێژ و هەموو ئەو خەسڵەتانە بەرهەم بهێنێ کە لەکەسایەتی مرۆڤی هاوچەرخدا بە شێوەی جیاواز ڕەنگدەدەنەوە. بەدیوێکی تردا: هەروەکو چۆن شار دەتوانێ تاکگەرایی و عەقڵانیەت و سەربەخۆیی و جوانیناسی بەرهەم بهێنێ، ئاواش توند وتیژی و ئاڵۆزی و ساردی و بیرۆکراتیەت و توندڕەویش بەرهەمی شارن. ڕاستتر وایە بگوترێ، بەپێی جیاوازیی شارەکان کولتووری شاریانەی جیاوازیشمان هەیە. ئەم قسەیە ئەگەر بۆ هەموو شارەکانی جیهانی سێیەمیش ڕاست نەبێ، ئەوە سەبارەت بە شارەکانی ئێمە هێندە لە واقیعەوە دوور نیە.

دەربارەی شارێکی وەکو شاری هەولێر دەتوانین چی بڵێین؟ فرنان برودل، مێژووکاری فەرەنسی و ئەندامی قوتابخانەی مێژوویی (ئانال) سێ جۆر شار لەیەکتر جیادەکاتەوە. یەکەم: شاری کراوەی وەك شارەکانی یۆنان و ڕۆم. دووەم: شاری پیشەسازی و گووشارهێنەر، وەك شارەکانی سەدەی نۆزدەیەم و سێهەم: شاری بەسەرخۆدا داخراوی وەك شاری سەدەکانی ناوەڕاست لە ئەورووپا. من لەو بڕوایەدام شاری هەولێر نزیکە لەجۆری سێهەم و خەسڵەتەکانی ئەو جۆرە شارەی بەسەردا دەگونجێ. هەولێر لەسەرەتاوە شارێکە لەناو قەڵایەکدا (شارقەڵایە) و پاشان دەبێتە شارێك بەدەوری قەڵاوە، بەڵام هەرگیز خەسڵەتی بازنەیی خۆی لەدەست نەداوە، کە داخراوبوونیەتی. هەولێر شارێکی بازنەییە، لەڕووی مێژووییەوە کۆنە و دەسەڵاتی ڕەمزیی خۆی لەمێژووە دووردرێژەکەیەوە بەدەست دەهێنێ و ئەمەش لەزۆر باردا ڕێگرە لەبەردەم مۆدێرنیزەبوونی ئەم شارەدا. چونکە زۆرجار مێژوو، یان ڕابردوو نەك هەر دەبێتە ئەو زەخیرەیەی کە خۆراك دەدات بە هەنوکە، بەڵکو دەشبێتە بارێکی گران و ڕێگر لەبەردەم گەشە و داهاتوودا. یەکێك لە تایبەتمەندییە باشەکانی هەولێر

ئەوەیە، کەس ناکات بەهەولێری و خەسڵەتێکمان نیە پێی بگوترێ خەسڵەتی شاری هەولێر. واتە لەم شارەدا کولتوورێکی ستانداردی باڵادەستمان نیە کە هەموو ئەوانەی دێنە ناو ئەمشارەوە، ناچار بکا ببنە هەڵگری ئەو کولتـووره و لێکچوون لەنێوان هاوشارییەکاندا دروستبکات. تۆ لە هەولێر دەتوانیت بەردەوامی بدەیت بە کولتـووری خۆت بەڵام ناتوانیت کاریگەریت هەبێت بۆسەر ئەوانیتر. لەناو بازنەی شاردا وەکئەوەی کە هەیت جێگەت دەبێتەوە، وەلێ زەحمەتە بتوانیت بچیتە ناو بازنەی ئەوانیترەوە. هەولێر لەهەمان کاتدا شارێکیشە لەڕووی پێکهاتەوە، پێناسەی شارێکی نامناوەندی بەسەرا دەسەپێت، کە تەواو جیای دەکاتەوە لە گوند، یان تەنانەت لە پێشینەی مێژوویی خۆی. کێشەی هەولێر ئەوەیە بەردەوام لەبەردەم مەترسی بەگوندبووندایەو ئەمەش هەڕەشەیەکە لە بەشاربوونی هەولێر بەمانا هاوچەرخەکەی. لەم شارەدا چەندین گەرەکی تایبەتی هەیە کەناوەکانیان بەیادهێنەرەوەی ناوی خێڵ و عەشیرەت و توێـژی کۆمەڵایەتین و لەو بەشانەی شاردا، کولتـووری خێڵ و عەشیرەت و توێژێکی تایبەتی کۆمەڵایەتی باڵادەستە، نەك کولتـووری ستانداردی شار. ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی ئەو کولتوورەی تۆ دەفەرموی کولتوورێکە تایبەتە بەشار، لەهەولێر دروستنەبێت. گرنگترین خەسڵەتەکانی ئەو کولتـووره شاریەش ئەوەیە کە پەیوەندیی مرۆڤەکان بەیەکترەوە پەیوەندییەکن لەسەر ئاستی تاکەکەسەکان، نەك لەبەر ئەوەی ئەندامی هەمان عەشیرەتو خێڵ و بنەماڵەن. واتە بۆنمونە: ڕێزی من بۆ تۆ لەناوشاردا جیاوازە لە ڕێزی من بۆ تۆ لەناو گونددا. لەناو گوندا لەو روانگەیەوە پەیوەندی لەگەڵ یەکتر دەگرین کە ئێمە بەرژەوەندییەکی هاوبەش لەنێوانماندایە، یا بەرەچەڵەك دەچینەوە سەر یەك خێڵ، یان پەیوەندییەکی خوێنی لەبەینماندا هەیە، ئەرکێکی کۆمەڵایەتی جێبەجێ دەکەین، یاخود مەترسیەکی هاوبەش کۆماندەکاتەوە. ئەوانە دەبنە بنەماکانی پەیوەندی مرۆڤەکان بەیەکترەوە لەناو گونددا، بەڵام لەشاردا ئێمە دانپیانان و ڕێزگرتن و پەیوەندیمان بەیەکترەوە لەو ئاستەوەیە کە تاکایەتی یەکتر قەبوڵ دەکەین. تۆ کەسێکی بە رەفتارەکانت، بە شێوەی بیرکردنەوەت پێناسەی خۆت لەبەرامبەر مندا دەکەیت، کە بە ڕەفتارەکانم و

بەشێوەی بیرکردنەوەم پێناسەی خۆم لەبەردەم تۆدا دەکەم. واتە لەشاردا کولتورێك هەیە بۆ قەبوڵکردنی جیاوازی بەبێ ئەوەی ئەوقەبوڵکردنە لەترسێکەوە یان لە بەرژەوەندییەکی هاوبەشەوە یاخود لەئینتمایەکی هاوبەشەوە دروست بووبێ.

بێگومان لەدروستکردنی ئەو کولتوورە مۆدێرنەی شاردا، کۆمەڵێك دامەزراوە و یەکەی ئیداری رۆڵی تایبەتیان هەیە و پەرە بەو کولتوورە دەدەن، بۆ نموونە: دەوڵەت و سیستەمی پەروەردە و خوێندن. ئەمانە ئەو دەزگایانەن کەوا دەکەن مرۆڤ لە کائینێکی پابەند بەخێزانەوە ببێتە مرۆڤێکی پابەند بە کۆمەڵگاوە، دیارە ئەمەش لەسەر بنەمای رێزگرتن لە سەربەخۆی و تاکایەتی مرۆڤ. کێشەکە لە وڵاتی ئێمەدا لەوەدایە کە زۆربەی ئەم دەزگا و سیستەمانە ماهیەتی بنەڕەتیی خۆیان دۆڕاندوە و ئەو پێناسانەیان بەسەردا ناچەسپێ کە بۆخۆیانی دەکەن. ئەتوانم بڵێم ئێمە سیستەمێکی پەروەردەییمان نیە کە بەو ئاراستەیە تەماشای مرۆڤ بکات کە بوونەوەرێکی سەربەخۆیە و خاوەنی گەورەیی خۆیەتی و پێویستە ئازادانە بیربکاتەوە و ئینتیمای بۆ نیشتیمان و دەوڵەت و دەوروبەر لەسەر بنەمای هووشیارییەوە بێت، نەك ئینتیمایەکی سەپێنراو لەسەر بنەمای ئایدیۆلۆژییەوە. سیستەمی پەروەردەیی ئێمە، تەنانەت لە قۆناغی زانکۆشدا بەوجۆرە بیر لە مرۆڤ ناکاتەوە، کە وزەیەکە بۆ داهاتوویەکی هاوبەش و پێویستە ئەم وزەیە بەفیڕۆ نەدرێت. بۆیە دەبینین ئەوەندەی زانکۆ وەك دامەزراوەیەکی عەقڵانی قوتابیەکان لە کۆمەڵگا دەتۆرێنێ و دووریان دەخاتەوە لە بیرکردنەوە لە شتی هاوبەش، ئەوەندە دامەزراوەیەکی تەقلیدیی وەك خێزان، کە لەسەر بنەمای پاراستنی نەریتەکانەوە دامەزراوە، لە کۆمەڵگا نایانتۆرێنێ! بۆیە لاوازی و کەمتەرخەمی ئەو دەزگا و سیستەمانە دەبێتە هۆی لاوازبوون و سەرهەڵنەدانی کولتووری ستانداردی شار و لەئەنجامی ئەمەیشەوە جۆرەکانی پەیوەندی خێڵ و پەیوەندیە تەقلیدیەکان دزە دەکەنە شارەوە و دەبنە بەشێك لە سیمای شار. بێگومان ئەمەش رێگرێکی سەرەکیە لەبەردەم دروستبوونی پەیوەندیە کولتووریە مۆدێرنەکانی شاردا. هەربۆیەشە لە غیابی ئەم کولتوورەدا کە تایبەتە بەشار، کولتوورێکی دیکە سەرهەڵدەدات و دزە دەکاتە ناوشارەوە، کە

ڕەگوڕیشەی لە شاردا نییە، بەڵام بەتەواویش لە گوندا نیە و دەکرێ بڵێین: کولتوورێکی شێوێنراوە لە هەردووکیان. نە بەتەواوی مانا شارییە و نە پڕاوپڕ گوندی و ناشاریشە، بەڵام توندوتیژی تایبەتمەندییەکی هەرە سەرەکییەتی.

***بێستوون: ئایا دەکرێ بەچەند نمونەیەك ئەمە ڕوونبکەیتەوە؟***

نمونەکان زۆر و بەرچاون. ئەوەندەی لەم سیانزەساڵەی دواییدا لەشارێکی وەك هەولێر و شارەکانی تریش دیاردەی ئافرەت کوشتن، تۆڵە کردنەوە، تێزابرێژی و خۆسووتاندن و سوڵحی عەشایری بۆ ڕێگیریکردن لە خوێن و دووژمنایەتی برەوی سەندووە، ئەتوانم بڵێم بەدرێژایی مێژووی گوندەکانی ئێمە ئەوەندە کێشە و ئەوەندە ژمارەی ئافرەت کوشتن ڕوینەداوە و کولتووری گوند لەگەڵ ئەوەشدا کە توندوتیژی تایبەت بەخۆی هەیە، بەڵام هەمان ئەو ڕێژەی توندوتیژیەی بەخۆیەوە نەبینیوە کە ئێمە لەشاردا ئەزموونمان کرد. هەموو ئەم نمونانە و زۆری تریش پێماندەڵێن: ئێمە لەبەردەم کێشە و پرسیارێکداین: بۆچی لەگەڵ ئەوەشدا کە شاری ئێمە نە بەتەواوی مانا شارێکی جیهانی سێیەمیە و نە گەورەشاری ئەورووپا و ئەمەریکایە، کەچی ئەو هەموو توندوتیژیە بەرهەمدەهێنێ؟ ئایا شاری ئێمە جگە لەوەی لەڕووی فۆرمەوە بۆتە شار، لەڕووی ناوەڕۆکی پەیوەندیەکانیشیەوە بووە بەشار یان نەء ؟

***بێستوون: باشە بۆکەمکردنەوەی ئەو توندوتیژیە چی بکرێت باشە و چۆن خۆمان لەو کولتوورە شێوێنراوە ڕزگار بکەین کە هەڕەشەیە لەسەر کولتووری شار؟***

سیوەیلی: کوردە ناسیۆنالیستە ڕۆمانتیکیەکان، لە ناوەوە و دەرەوەی کوردستان و بەتایبەتیش لە ئەورووپا، وابیر دەکەنەوە ئەگەر ساڵێ ملیۆنێك بۆسەر چل ملیۆنەکەی تر زیاد بکرێ، ئەوە کورد دەبێتە نەتەوە. بەهەمان شێوەش کەسانێك هەن وا سەیری شار دەکەن کە ئەگەر شارەکە قەرەباڵغ بوو، گەورە بوو، لەبەر ئۆتۆمبێل ڕێگا نەبوو بڕۆیت، پارکێکت کردەوە، یەك دوو هوتێل چوون بەئاسمانا و هتد. ئەوە ئیتر بۆتە شار. لەڕاستیدا دەکرێ شار بەهۆی سیاسەتێکی تایبەت بەشارەوە کۆنترۆڵ بکرێ و ڕێکبخرێ، پێویستە لەڕێگەی پلاندانانی بەردەوامەوە شار ڕێکبخرێتەوە و بکرێتە ئەو فەزایەی کە پێش هەموو شتێك فەزای ژیانە بۆ مرۆڤ. بەبێ پلاندانان و سیاسەتێك بۆ

شار کە بزانێت چۆن شار کۆنترۆڵ بکات و چۆن شار بکات بەشار بەبێ ئەوەی مەترسی بەگوندبوون، یان ناشاربوونی بێتە سەر، شار دەبێتە بەرهەمهێنەری توندوتیژی. نەبوونی پێناسەیەك و پلانێك بۆ ئەوەی ئێمە چیمان لە شار دەوێ و دەمانەوێت شار چۆن بێت، دەمانخاتە بەردەم تەقینەوەی شار بەهەموو ماناکانی.

بۆنمونە: فەرمانگەکان بەشێکی گرنگی پێکهێنەری شارن، شاری بێ فەرمانگە جەستەیەکی بێ دڵ وایە، بەڵام لە نەبوونی پێناسەیەکدا بۆشار، فەرمانگەکان دەتوانن بیرۆکراتیەتێکی زۆر بەمانا خراپەکەی بەرهەم بهێنن: دواخستنی ئیشی هاووڵاتیان، دروستکردنی قەڵەباڵغی و ژووراوژوور پێکردن و نەبوونی شێوازێکی ڕووبەڕووبوونەوەی مەدەنیانە لەگەڵ هاووڵاتیاندا، هەموو ئەمانە بۆی هەیە سەرچاوەی توندڕەوی بن. بەبڕوای من گەورەترین هەڵە لە ئەزموونی ئەم سیانزە ساڵەی ڕابردوودا کە پەیوەندی بە شارەوە هەبێت، ئەوەبوو فەرمانگەکان لە ڕەگەز و پاشماوەکانی بەعس پاك نەکرانەوە. هەموو بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی کورد پێناسەی بۆ دووژمن ئەوە بووە کە هێزێکە لە(دەرەوە) و بێگانە بە کۆمەڵگای کوردی. دووژمن لەو ڕوانگەیەوە کەسێ بوو لەدەرەوە هرووژمی دەهێنایە سەرمان و ئێمەش لەناوەوە ڕووبەڕووی دەبووینەوە. بەڵام لەماوەی ئەم سیانزە ساڵەی دواییدا، ئیدارەی حکومەتی هەرێم بەسوود وەرگرتنی لەڕەگەزەکانی پاشماوەی بەعس لە ئیدارەکاندا و پلەو پایە بەخشینەوە بەسەریاندا، وردە وردە ئەو دوژمنانەی خزاندە ناو کۆمەڵگەی کوردیەوە. واتە ئێمە ئێستا ئەوەندەی کە لەدەرەوە مەترسییەکان ڕووبەڕوومان دەبنەوە، ئەوەندەش زیاتر لەناوەوە دەستە خۆڵە مێشییەکان هەڕەشەمان لێدەکەن. بوونی کەسانێکی زۆر لە ڕیشوەخۆر و لە ناپاك و لەگەندەڵکاران لەناو دەزگا و فەرمانگەکاندا، کە خەڵك ڕازیکردن و متمانە دروستکردن بەلایانەوە شتێکی بێ مانایە، لە دوژمنایەتی کردنیاندا بۆ کۆمەڵگەی کورد هیچیان کەمتر نیە لەو دووژمنەی کەلەدەرەوە پلانت بۆ دائەنێت و ئەتوانێت دەست درێژی بکاتە سەر کۆمەڵگا. بیرۆکراتیەتێکی زۆر باڵی بەسەر فەرمانگەکاندا کێشاوە، کە دەتوانین بڵێین: یەکێکە لە دووژمنە ناوخۆییە تازەکانمان. بەداخەوە ئەزمونی سیانزە

ساڵ خۆبەڕێوەبردنی ئێمە، کە توانیمان لە بەشێکی دوژمنە دەرەکیەکان ڕزگارمان بێت، بەڵام نەمانتوانی دەستنیشانی دوژمنە ناوەکیەکان بکەین. بگرە ستایشێکی زۆری خەڵکانێکی خراپمان کرد کە لەرژێمی پێشوودا دەستیان هەبوو ستایشیانمان کرد و پێمان گوتن: ئێوە بەئەزموونن و ئێمە بەبێ ئێوە هیچمان پێناکرێ. ئەمانە هەر ئەو کەس و گرووپانەن کە سیستەمی فەرمانگەیی ئێمەیان بەرەو فەسادێکی گشتگرەوە برد و نهێنیەکانی ئێمەیان کەوتەوە دەست و توانیان لە غیابی دەسەڵاتی بەعسیشدا، پرۆژەکانی بەعس بەجۆری دیکە تەواو بکەن.

بەگشتی ئێمە سیاسەتی شاربەڕێوەبردن‌و پلانی شارو ئیدارەکردنی قەیرانەکانی شارمان نییە. پێویست ناکات ئەندازیار و ئۆربانیستیش بین، تا تێبگەین پارێزگاریەت و شارەوانی و لایەنە بەرپرسەکانی دیکەی شار چەندە لەمرووەوە هەژار و بێ فەنتازیان.

**شاخەوان: با بێینە سەر باسێکی تر کە پەیوەندی بە ئایین و توندوتیژییەوە هەیە. پێتوانییە کۆمەڵگای کوردی ئەوەندەی پێ لەسەر ئیسلامبوون دادەگرێت، ئەوەندە پێ لەسەر کوردبوون داناگرێت؟ هەڵبەتە کاتێك وەلائی ئایینی پێش وەلائی نەتەوەیی دەکەوێت ئەوسا هەلی ئاسانتر دەرەخسێ بۆ سەرهەڵدانی توندوتیژی، چونکە ئەوسا باوەڕی ئایینی پاڵنەرێکی بەهێز دەبێت.**

سیوەیلی: من لەم بارەیەوە خوێندنەوەی قووڵم نییەو مەسەلەی توندوتیژی و ئایین و شەڕانییەت لەباسە گرنگەکانی فەلسەفەی ئایین و یەزدانناسیی مەسیحین لەبیری خۆرئاوادا.

لەڕاستیدا لەهەموو ئایینەکاندا، بەتایبەتی ئایینە تاکخودابیەکاندا، جۆرێك ستایشکردنی توندوتیژی هەیە کە ئەوەشمان لەوێناکردنی مرۆڤی خاوەن بڕوا بۆ ئەو ئایینەی باوەڕی پێیەتی، بۆ دەردەکەوێت. لەزۆربەی ئایینەکاندا بەشێك لە وێناکردنەکان بۆ یەزدان، وێناکردنێکی ڕەها و شەڕانگێزانە و سزادەرانەن، کە دەتوانێت لە ئانێکدا هەموو شتێ بکات. بێگومان ئەمەش لەگەڵ ئەو پێناسەیەدا بۆ

یەزدان وەك (چاكەی ڕەها) وێكنایەتەوە، چونكە ئەگەر یەزدان چاكەی ڕەها بێت ئەوە بوونی توندوتیژی و ئیرهابی ئایینی مانای چی؟ ئەم ناكۆكییە هەر پەیوەندی بە ئایینەوە نییە و هەر تەنیا ئایینیش سەرچاوەی توندوتیژی نییە لەناو كۆمەڵگادا. زۆرن ئەو ئایدیۆلۆژیانەی لەبەرهەمهێنانی توندوتیژی و تیرۆردا گرەویان لە ئایین بردۆتەوە.

ئایین وەك باوەڕهێنانی مرۆڤ بە هێزێكی میتافیزیكی لە كۆمەڵگای كوردیدا وەك ئەوەی كە هەیە، سەرچاوەیەكی ڕاستەوخۆی بەرهەمهێنەری توندڕەوی نییە، بەڵكو سەرچاوەی بەرهەمهێنانی چەپاندنە.. دەمەوێت بڵێم: مرۆڤی كورد مرۆڤێكی ئیماندارە لەئاستی ئیمانێكی پەتیدا، لەئاستی ئیمانهێنانێكی گشتیدا و لەئاستی خوو پێوەگرتنیدا. ئیمان بۆ مرۆڤی كورد ئەو سلوكەیە كە دەیبەستێت بە هێزێكی دەسەلآتدار لە سەرووی خۆیەوە. پابەندبوونی ئەم مرۆڤەیە بە پانتایی (پیرۆز)ەوە و ئیمانێكە بۆ دروستكردنی هاوسەنگی و خۆ جلەوكردن. بەم مانایە مرۆڤی كورد ئیمانێكی عامیانە و بێ زەرەروزیانی هەیە و ناكرێت ئەم مرۆڤە لەبەر تاریكایی ئەو كردارانەدا موحاسەبە بكەین كە بەناوی دینەوە خوێنڕێژی و تیرۆر و جۆرەكانی سەركوتكردن ئەنجام دەدەن. تەنانەت ناشكرێت هەموو مێژووی پڕ توندوتیژیی ئایینی ئیسلام لەسەر مرۆڤی ئیمانداری كورد و ئەم كۆمەڵگایە حساب بكرێ. پێویستە ئێمە دوو شت لەیەكتر جیابكەینەوە، ئەویش یەكەم: ئیسلام و مێژووەكەیەتی وەك دینێك و دووەم: شێوە و نیەتی مرۆڤی كوردە لە ئیمانهێنانیدا بەم ئایینە. ئیمانی مرۆڤی كورد وەك پەیوەندییەك لەگەڵ پیرۆزدا، ئیمانێكی پراكتیكیانەیە بە كۆمەڵێ بنەما كە مرۆڤ پێویستی پێیانە بۆ خۆ جلەوكردن. بۆیە ڕەخنەگرتنمان لەئایینی ئیسلام و مێژووەكەی جیا بكەینەوە لە شێوازی باوەڕهێنانی خەڵك بە دین. ئێمە زۆر پێویستیمان بە خوێندنەوەیەكی كوردیانەی ئایین هەیە كە پشتی بەستبێت بە بنەما زانستییەكانی توێژینەوە، هەروەكو چۆن پێویستیشمان بەڕیوایەتكردنێكی ڕەخنەییانەی مێژووی ئیسلام هەیە بۆ خاوێنكردنەوەی ئەو مێژووە لە هەموو ئەو شتانەی عەرەبەكان لەڕێگەیانەوە هەوڵیانداوە بۆ بەعەرەبیكردنی

ئیسلام و دواجار لەپرۆسەی فۆرمەلەبوونی دەسەڵاتی عەرەبیدا بۆ سەرکوتکردنی ئەوانیتر سوودیان لێوەرگرتووە. بۆیە بەکارێکی ژیرانەی نازانم لەدوای کارەساتێکی وەك ئەوەی هەولێرەوە، ڕەخنەگرتنمان بنەما زانستییەکانی خۆی لەبیر بکات و لە ڕەخنەگرتنێکەوە لە ئایین و مێژووەکەی ببێتە ڕەخنەگرتن و توانجدان لە شێوازی ئیمانهێنانی خەڵکی ئاسایی بەدین. وەختێك ڕەخنە لە ئایین دەگرین و بەتایبەتی لە ئیسلام دەگرین، پێویستە ئەوە جیا بکەینەوە کە ڕەخنە لە چ ئیسلامێك دەگرین، یان ڕەخنە لەچ گرووپێك دەگرین کە ئیسلام بەئاراستەیەکی تردا دەبات و بردوویەتی. دەنا ئەو مقاوەمەتە زۆرەی کە خەڵك ئەمڕۆ هەیەتی، لەئاست تیرۆردا، ئەو هاودەردیەی کە هەیانە لەگەڵ ئەو تراژیدا گەورەیەدا دەگۆڕێت بۆ مقاوەمەی لەبەرامبەر ڕەخنەگراندا و دەگۆڕێت بۆ بەرگریکردن لەئایین خۆی و ئەمەش توندوتیژییەکی زۆر بەرهەم دەهێنێ و خزمەتێکی زۆریش بە توندڕەوان و میانەڕەوان و نەرمڕەوانی ئایین دەکات و خەڵك بەئاراستەی توندوتیژیی ئایینیدا مۆبێلیزە دەکات.

ئەمە چرکەساتێکی زۆر هەستیارانەیە لە ژیانی کۆمەڵگاکەماندا و من لەو بڕوایەدام گوتاری سیاسی ئێمە زۆر لێی بێئاگایە. واتە بێ ئاگایە بەو مانایەی کە ئەمڕۆ لەدەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە ڕەخنە لەئایین دەگیرێت بە بێ ئەوەی کە ئەو جیاکارە وردە لەبەرچاو بگیرێت کە عەرزم کردیت. بۆیە خەڵك وا هەست دەکات تۆ قسە بەبیروڕای ئەوان دەڵێیت و ئەمەش هەر ئەو خەڵکەیە کە هەتا دوێنێ لەگەڵتا شەهید دەبوو، دەهاتە ناو تەعزیەکانتەوە و ماتەمیەکی گشتی دایگرتبوو بۆ کارەساتەکان وەك ئەوەی بەسەر کورد هاتبوون نەك بەسەر مسوڵمانان. ئەگەر ئەمڕۆ قسە بە بیروڕاکەی بڵێیت، ئا لەوێدایە ئەو خەڵکە مەسەلەی کوردبوونی خۆی دەخاتە دواوە و پێ لەسەر بڕواکەی دادەگرێت و لەپێناویشیدا توندوتیژی دەنوێنێ. بۆیە من لەو بڕوایەدام مەسەلەی کوردبوونی خەڵك و مەسەلەی ئیمانی خەڵك بە ئایین دووشتی لەیەك جیاواز نین و دژ بەیەك و ناکۆك نین لەگەڵ یەکتردا. پێویستە ئەوەمان بیر نەچێت مەسەلەی ئیمان ئەگەر مەسەلەیەکی جەوهەریانەی پێکهاتەی مرۆڤیش

نەبێت، شتێکە دروست دەبێت و ئاستی گەرموگوڕیەکەشی پەیوەستە بەو کولتوورەوە کە لە کۆمەڵگادا بەهاکان دادەڕێژێ. لەزاتی مرۆڤدا زۆر پانتایی هەن کە پارمەتیدەرن بۆ پەرەپێدانی ئیمانو بەهێزبوونی تا ئاستی توندڕەوی، کە ئەوانەش ئەو پانتاییانەن کۆمەڵگا نرخیان بۆ دادەنێت. بۆنموونە: شەرمکردن، چاوەڕوانی، ترس و هەستکردن بە گوناه. ئەگەر کۆمەڵگایەکت هەبوو نرخی بۆ ئەم پانتاییانە داناو مرۆڤی شەمن و ترسەنۆك و چاوەڕوانکردووی قەبووڵ بوو، ئەوە ئەو مرۆڤە ئیمان بەهێزێك دەهێنێ و ئامادە دەبێت بۆ گەڕان بەدوای دڵنیایی و ئەو دەستەدا کە لە شەرم و چاوەڕوانی و ترس ڕزگاری بکات. ترسو شەرم و چەپاندن و مرۆڤ لەچاوەڕوانی و بۆشایی هێشتنەوەدا، لە خەسڵەتە دیارەکانی کۆمەڵگای ئێمەن و لە منداڵی هەرکامێکمانەوە تاوەکو گەورەییمان ئێمە وەك مرۆڤ فێری شەرمکردن، خۆچەپاندن و ترس دەکرێین و هەموو خواست و ئارەزووە هەنووکەییەکانمان بەهۆی بەها زاڵەکانی ناو کولتوورەکەمانەوە، دوا دەخرێن بۆ داهاتوویەکی نادیار. دواجار ئیمان لەناو ئەم ترس و شەرم و جۆرە چاوەڕوانیەدا کە کۆمەڵگا نایهێنێتە دی، لەدایك دەبێت و ئاراستەیەکی توندڕەوانە وەردەگرێت و دەبێتە تۆڵەکردنەوە لە کۆمەڵگا و کەسانێك پەیدا دەبن ئاین بەو جۆرە تەفسیر دەکەن کە چەکێکی سزادانی مرۆڤە لە دنیادا. کەواتە پێویستە جیاکارە بکرێت لەنێوان شتێك کە ناوی ئیسلامی سیاسیە یان بەکارهێنانی سیاسیانەی ئیسلامە، لەگەڵ شتێك کە ئیمانهێنانێکی عامیانەیە بەئاین. چونکە ئەگەر ئەوە نەکەین، ئەوکاتە ئەکرێ شەڕێکی ناوخۆیی نوێ دروست ببێ، کە شەڕی نێوان ئیمانداران و ڕەخنەگرانە لە ئیمانی عامیانەی خەڵك. ئێمە پێویستمان بەوە هەیە نەك هەر مرۆڤی ئیمانداری پەتی بکەینە بەشێك لەو هێزە کۆمەڵایەتییەی دژی تیرۆر و توندڕەوی لە کوردستاندا پێویستە، بەڵکو پێویستت بەوە هەیە حزبە ئیسلامییەکانیش بهێنینە ناو ئەو بەرەیەوەو ناچاریان بکەی بەو بەرنامانەیاندا بچنەوە کە بۆی هەیە بەرهەمهێنەری توندڕەوی بێت. بەکورتی ئەمڕۆ گوتاری سیاسی کوردی هیچ پێویستی بەوە نییە نە خەڵکی عامەی ئیمانداری کورد لەخۆی زویر بکا، نە ئەو حیزبە ئیسلامیانەش کە لەناو گۆڕەپانی

کوردیدا بە ڕەسمی ڕێگە پێدراون‌و کاری خۆیان دەکەن، بخاتە بەرەی دوژمنەوە. ئەمڕۆ پێویستمان بەوە هەیە هێزە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگای کوردی یەك بخەین بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو تراژیدیا گەورانەی کە ئەشێ چاوەڕێ بکرێن.

**شاخەوان: ئەی دەزگا ئایینیەکان چی؟ دیارە کەمتەرخەمییەکەی بۆ دەزگا ئایینییەکانی ئێمەش دەگەڕێتەوە کە نەیانتوانیوە ئایین وەکو خۆی بناسێنن و پەرە بەو ئیمانە پەتیە بدەن کە ئێوە باستان کرد؟ ئەگەر وانییە، بۆچی ئەو کەمینەیە کە تەفسیرێکی توندڕەویانە بۆ ئایین دەکەن، دەتوانن شارو وڵات- کۆمەڵگە بهەژێنن و کەچی دەزگا ئایینییەکان بەو پشتیوانە زۆرەی خەڵك ناتوانن دەنگی خۆیان بەسەریاندا زاڵ بکەن؟**

سیوەیلی: پرسیارێکە لەجێی خۆیدا. هەروەکو چۆن پێویستە ئەم ڕووداوە بەکاربهێنین بۆ بەخۆدا چوونەوەی دەزگاکانی ئاسایش و بۆ گۆڕان لەسیاسەتی ناوخۆدا، بۆ بەخۆداچوونەوەی تاك بەتاکی خۆمان، بەبڕوای من دەبێ بەکاریشی بهێنین بۆ ڕەخنەگرتن لە دەزگا ئایینییەکانی ئەم وڵاتە. هەر لە مەلای مزگەوتەکانەوە هەتا دەگاتە وەزارەتی ئەوقاف لەبەردەم ڕووداوێکی وادا پێویستە بەخۆیاندا بچنەوە، چونکە دەرکەوت ئەو متمانەیەی کە پێویستە دەزگا ئایینییەکان لەنێوان خەڵك و خۆیاندا دروستی بکەن، دروست نەبووە و پانتاییەکیان بەبەتاڵی بەجێهێشتووە بۆئەوەی خەڵکانی توندڕەو، کە هەڵگری تەفسیری توندڕەوانەن بۆ ئایین، بێن و تراژیدیا بەرپا بکەن.

بێگومان دەزگا ئایینییەکان بەرپرسی یەکەمن لە تەفسیرکردنێکی ئاشتیخوازانە و ژیاندۆستانە لە ئایین، لەبەرامبەر ئەو تەفسیرە شەڕانیەدا کە تیرۆریستان دەیکەن. بەڵام بۆ دەزگا ئایینییەکان ئەم کارەیان نەکردووە؟ بۆ ڕۆشنبیرییەکی ئایینیان بەرهەم نەهێناوە بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو وێنە شەڕانیە لە دین؟ بەبڕوای من هۆکاری ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ تێڕوانینی سیاسیانەی دەزگا ئایینییەکان بۆ دین‌و بۆ کارمەندانی بواری ئایین و بۆ مەلاکان وەك بکەری ئایینی لەم کۆمەڵگایەدا. ئێمە دەزانین ڕۆڵی مەلاکان لە پێش ڕاپەڕیندا چەندە ڕۆڵی ئایینی بوو، ئەوەندەش ڕۆڵێکی

کۆمەڵایەتی بوو بۆ چاکسازی و ڕێکخستنی کۆمەڵگای لۆکاڵیی ئێمە. مەلا و کۆمەڵگا دوو یەکەی تەواوکەربوون و کۆمەڵگا مەلای دەژیاند و مەلاش کۆمەڵگای دەژیاندەوە! لەسەردەمی بەعسدا مەلاکان ئەو توێژەبوون کە گوشاریان بۆ دەهێنرا و ئازار دەدران و زیندانی دەکران. لە کۆمەڵگای لادێ نشینی ئێمەدا و بەدرێژایی ئەو مێژووەی لەسەر مەلاکان دەتوانین بۆی بگەڕێینەوە، دەبینین مەلا ڕۆڵێکی ڕۆشنگەرانەی هەیە لە کۆمەڵگای کوردیدا، ڕۆڵێکی چاکسازیانەی هەیە و زیاتریش ئیش لەسەر دروستکردنی کەش و هەوایەکی کۆمەڵایەتیانە دەکات بەهۆی ئایینەوە و زۆرجاریش بە تەفسیرکردنێکی بەرژەوەندخوازانەی بەندە شەرعیەکان. پیاوی توندڕەوی کورد بە هەزاران تەڵاقی وای خواردووە کە تەنیا مەلا خۆشمەشرەبەکانی ئێمە توانیویانە چاکیان بکەنەوە و دەعوەتی چەوریشی لەسەر بخۆن. دەیان فیتنە و دوژمنایەتی گەورەیان کوژاندۆتەوە و کۆمەڵگایان لە ناکۆکییەکان و مەترسییە ناوخۆییەکانی پاراستووە. ئەم مەلایانە ئێستا لەکوێن و لەدوای ڕاپەڕینەوە چییان بەسەرهات؟ بێگومان بەشێکیان، لە بەئەزموونەکانیان کۆچی دواییان کرد و لەگەڵ خۆشیاندا کولتوورێکی خۆشمەشرەبانەی جوانیان بردە ژێر گڵەوە. هەندێکیشیان بۆ لەدەستنەدانی عیزەتی نەفسی خۆیان گۆشەگیرییان هەڵبژارد و بەبرسێتی پیربوون و دڵنیام لەداهاتوو داو لەسیپارە و کەشکۆڵەکانیاندا هۆی ئەم عوزلەتەیان دەخوێننەوە. بەشێکی زۆریشیان لەدوای ڕاپەڕینەوە و بەدووڵەتبوونی هەردوو ئیدارەکە، ئەوانیش دووڵەت بوون و زیاتر لەوەی خەریکی ئایین بن، بەشوێن حیزب و پارەو پێگە کەوتن. لەدوای ڕاپەڕینەوە مەلا دەبێتە ئەو کائینەی هەموو شتێك دەکا تا لەبەردەمی وەزارەتی ئەوقافدا حیزبی حاکم لەخۆی ڕازیی بکات. دەبێ بەکائینێك کە دەستی گرتۆتەوە لە دەسەڵات نەك لە ئاسمان، تا مووچەکەی نەبڕن، تا لەم شوێنەوە نەقڵی نەکەن ئەو شوێن و هتد. ئەوان دەبنە دەستی درێژکراوەی سانسۆر و فەتوا لەسەر نووسەران و هونەرمەندان دەردەکەن و دەکەونە کێبەرکێ لەگەڵ حیزبە ئیسلامییە توندڕەوەکان و ئیتر کاراکتەری چاکسازانە و ڕۆشنگەرانەی خۆیان لەدەست دەدەن و لەبەردەم فلان مەلای ساختەی بریکاری وەزارەتی ئەوقافی ئەملاو

ئەولادا قەبووڵی هەموو زەلالەتێك دەكەن و نقەیان لێوە نایەت. بۆیە ناشتوانن تەفسیرێكی ژیاندۆستانەو مرۆڤدۆستانە بۆ ئایین بكەن و لەجیاتی ئەوە دەبنە پسپۆڕ لە ڕاپۆرت نووسیندا بۆ حیزب و لەفەتوا دەركردندا بۆ قەڵەمی ئازاد. بەبڕوای من ئەم توێژە كۆمەڵایەتییە لەدامەزراوەی ئایینییەوە خۆیان نەقل كردووە بۆ دامەزراوە حیزبییەكانو ئەمەش ڕێگەیان لێدەگرێت نەتوانن لەسەر بەجەژنكردنی یەك ڕۆژ بۆ جەژنو بۆ دەستپێكردنی ڕەمەزان یەك بكەون، ئیتر چۆن دەتوانن لەسەر تەفسیركردنی لێبووردەیانە و ئاساییشخوازانەی دین ڕێك بكەون. حاڵی كۆلیژی شەریعەش باشتر نییە، وانەزانیت لەوێ باس باسی ئیبن ڕوشد و غەزالی و ئیبن عەرەبی و سوهرەوەردی و مەولەوی و مەحوی بێت. لەوێش میزاجی شەخسی و بیانووگرتن بە قوتابیان و پۆلێنكردنیان لەپێش هەموو شتێكی سەرەكییەوەیە. نەك هەر بێدەنگە لەئاست كێشەكانی كۆمەڵگادا، بەڵكو بێئاگاییش لە گفتوگۆ هاوچەرخەكانی فەلسەفەی ئایین و میتۆدە زانستییە هاوچەرخەكانی توێژنەوەی ئایین، پەیوەندی ئایین و ئەفسانە، ئایین و زانست، ئایین و مێژوو، ئایین و كۆمەڵگا و تەكنەلۆژی و هتد. خەسڵەتی هەرە سەرەكی ئەو دامەزراوە پەروەردەییەیە كە حكومەتی هەرێم، پێش ئەوەی یەك بەشی فەلسەفە لەم وڵاتەدا بكاتەوە، سێ كۆلیژی لەو بابەتەی كردۆتەوە.

# قوماری بەکۆمەڵ

## گفتوگۆی: زیرەك عەبدوڵا

{قومار وەك یاری. یاساکانی قومار. *بردنەوە* وەك ئامانجی قومار. قومار لە چ کۆمەڵگایەکدا دەبێتە دیاردەیەکی ڕەفتارپشێو؟ قومار و ئایین، قومار و مژدەبەخشین و یۆتۆپیا. ئەخلاقی بردنەوە. لە قوماری بەکۆمەڵەوە بۆ کۆمەڵگای قومارچی}.

زیرەك: ***سەرەتا با لەوێوە دەست پێبکەین: چەمکی قومار لەدیدە سۆسیۆلۆژیەکەیدا چی دەگەیەنێت؟***

ڕێبوار: حەزدەکەم لەسەرەتاوە وەك چالاکیەك تەماشای قومار بکەین کە مرۆڤەکان بەگرووپ پێی هەڵدەستن، دەشێت لەقۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکیتر بازنەی ئەم گرووپە گۆڕانی بەسەردا بێتو بچووکتر، یان گەورەتر بێت، بەڵام یەکەم خەسڵەتی قومار ئەوەیە کە مەرجی بەکۆمەڵبوون و پێکەوەبوونمان لەبەردەمدا قوتدەکاتەوە! واتە بۆ ئەوەی ئەو چالاکییە بێتە ئەنجام، پێویستە چەند بکەرێك لەسەر یاساکانی ڕێکبکەون. وەلێ بەرلەوەی ئێمە ناو لەم چالاکیە مرۆییە بنێین قومار با وەك جۆرێ لەیاریکردن تەماشای بکەین. بەتێگەیشتنی من زۆربەی ئەو دیاردانەی ئێستا چوارچێوەیەکی نێگەتیڤو نەرێتیان بەخۆوە گرتووە، لەسەرەتای دروستبوونیانەوە وەك جۆرێ لە یاریکردن هاتوونەتە ئاراوە. لەبیرمان نەچێت یەکێك لەو تێڕوانینە ئەنترۆپۆلۆژیو سۆسیۆلۆژیانەی کە هەیە مرۆڤ وەك بوونێکی (یاریکەر) پێناسە

دەکات. ئەمە ناوی کتێبەکەی نووسەری هۆڵەندی (هۆزینگە)یە (*Humo Ludens*) کە قومار یەکێکە لەو جۆرە یارییانەی لە هەموو کۆمەڵگاکاندا بەدیار کەوتووە. کاتێك مرۆڤ وەك کائینێکی یاریزان تەماشا دەکەین، واتە باس لە توانایییەکی جەوهەری دەکەین لە مرۆڤدا کە هانیدەدات بۆ یاریکردن و ئەمەش بەر لەهەر شتێ بەشێکی سرووشتی مرۆڤمان پێدەناسێنێ. ئایا بەڕاست مرۆڤ هەمیشە هەر بەوجۆرەی ئێستا لەگەڵ ژیاندا لە ململانێدا بووە، یان ڕۆژگاریێ ژیان بۆ مرۆڤ جۆریێ بووە لە یاریکردن؟ ڕەنگە زۆر بەهەڵەدا نەچین ئەگەر گوتمان زۆربەی ئەو دیاردانەی ئێستا بەپێی ئەو نۆرمانەی لەکۆمەڵگادا ڕەواجیان هەیە و بەخراپ تەماشا دەکرێن، لەبنەڕەتدا دەشێت جۆرێك لەسەرگەرمی و یاریکردن بووبن. ئەوە تەنیا لەپرۆسەی بەمێژوویی بوونیاندایە کە هەندێك لەو دیاردانە سیمایەکی خراپ بەخۆیانەوە دەگرن و دیدی مرۆڤ لەبارەی خۆیانەوە دەگۆڕن. بۆیە من پێمخۆشە بەرلەوەی ئێمە تێڕوانینمان بۆ ئەو دیاردەیە کە بە قومار ناوی دەبەین تێڕوانینێکی نێگەتیڤانە بێ، واچاکە لە پەیوەندیی بە سرووشتی مرۆڤ خۆیەوە تەماشای بکەین. ئەگەر وەهامانکرد، ئەوکات دەتوانین بڵێین قومار وەك جۆریێ لە یاریکردن، کە لەهەموو کۆمەڵگاکاندا بینراوە و یاسای خۆی هەیە، بریتیە لە هەوڵدانی مرۆیەکان بۆئەوەی لەتەنیایی و پەستی و دەستبەتاڵی خۆیان ڕزگار بکەن. لێرەشەوە هەوڵدانە بۆ بەگرووپەبوون، بۆ دۆزینەوەی هاودەم و کەسانێك کە ئامادەن یاریمان لەگەڵ بکەن و ڕازیشن بەو مەرجانەی پێویستە لەیاریکردنەکەدا ڕەچاو بکرێن. بۆیە دەشێت ڕەگو ڕیشەی ئەو شتەی کە ئێستا پێیدەڵێین قومار، پەیوەندی هەبێت بەجۆرێك لەکێبڕکێ و پێشبڕکێوە، چونکە لەسروشتی ئێنساندا بەردەوام حەزی بردنەوە، حەزی سەرکەوتن، حەزی زاڵبوون و خۆسەلماندن لەبەردەم ئەویتردا هەیە. ئەم دیاردەیە بۆخۆی هەموو ئەمانەی تێدا بەرجەستە بووە، کاتێك تۆ جۆرێك لەیاری دەکەیت کەناوی نراوە (قومار) یا جۆرێك لەقومار دەکەیت، لەڕاستیشدا تۆ کەسێکی ئەتەویێ ببەیتەوە، چونکە کەسمان یاریی قومار بۆئەوە ناکەین تا بیدۆڕێنین، یان خەسارەتێکی مادی و مەعنەویمان لێبکەوێت و لەڕووی دەروونیەوە ماندومان بکات. کەواتە لە قوماردا جۆرێك لەخواست، جۆرێك

لەحەز، جۆرێك لەمەیلی بردنەوەو سەركەوتنو پیشاندانی شارەزایی لەیاساكانی یارییەكە خۆی بەیاندەكات.

خاڵێكی دیكە ئەوەیە، دەكرێت ئەم قوماركردنە وەكو ئەوە تەماشابكەین كە گرووپێك یاچینێك یان توێژێكی كۆمەڵگا پێویستی پێیەتی تاكو بەهۆیەوە خۆی لە چینو توێژ و گرووپەكانیتر جیا بكاتەوە. ئێمە لەبیرمان نەچێت هەر لەمێژووی ياركردندا یەكەمجار یارییەكان تایبەت بوون بە چینو توێژێكی تایبەت كە مافی خاوەندارێتی كەرەستەكانی یاریكردنیان لەبەر دەستدا بووە. تا ئەودواییانەش بۆ نمونە یاریەكی وەك ئەسپسواری تایبەت بووە بەمیر و پاشا و ئەوانەی كەدەسەڵاتی ڕاگرتنی ئەسپ و مەیتەر و كەرەستەكانی سوارچاكییان هەبووە. ئەمە بۆ ڕاوەتاژی و ڕاوە باز و گەلێ یاریتریش هەر ڕاستە. یاخود یارییەكی وەكو (گۆڵف) كە لە ئەورووپا تا سەردەمانێكی زۆر، یارییەكی تایبەت بووە بە كوڕانی پاشاو دەستو پێوەندە نزیكەكانی، نەك یارییەك كە هەموو كەس بۆی هەبووبێت ئەنجامی بدات. بەم شێوەیە تەماشا دەكەین مێژووی یارییەكان و مێژووی خۆسەرگەرمكردنەكان لەسەرەتاوە جۆرێ بوون یا هەوڵدانێك بوون بۆئەوەی چینێك یا توێژێك یان گرووپێك بەهۆیانەوە خۆیان لەئەوانیتر جیا بكەنەوە. كەواتە دەتوانین بڵێین: لە جۆرێك لەجۆرەكانی قوماردا وەك یارییەك ئەو هەستی خۆ جیاكردنەوەیە لە ئەوانیتر، باڵا دەستە. فیلمێكی وەكو(كازینۆ) كە (ڕۆبەرت دینیرۆ) ڕۆڵی تیا دەبینێت زۆر جەخت لەسەر ئەو لایەنە دەكات، كە قوماركردن هەم خووگرتنە بە جۆرێكی یاریكردنەوە و هەم شێوازێكی ژیانیشە كە بەهۆیەوە دەستە و توێژەكان خۆیان لەیەكتر جیا دەكەنەوە و بەوجۆرەش لەڕێگەی یاریكردنەوە شوناسێك بۆ خۆیان بەدەست دەهێنن. كۆی قسەكانم ئەوەیە دەكرێت قومار وەك یارییەك تەماشا بكەین كە لە قۆناغی جیاجیادا مانای جیاوازیش هەڵدەگرێت..

زیرەك: ***لە قسەكانی تۆدا ئەو جۆرە قوماركردنەی تایبەتە بەگروپێكی دیاریكراو و لەشوێنێكی دیاریكراویش بەئەنجام دەگەیەنرێت، خەسڵەتو یاساو تایبەتمەندی خۆی هەیە، بەڵام ئەو قومارەی ئێستا ئێمە باسی دەكەین تایبەت نییە بە گروپێك یا***

*چینێك یان توێژێكی دیاریكراوی نێو كۆمەڵگا، بەڵكو ئەو جۆرە قوماركردنە سەرجەم چین و توێژەكانی كۆمەڵگای لەخۆ گرتووە، یان بەمانایەكیتر: تاكەكانی سەرجەم چین و توێژەكان بەشداری تێیدا دەكەن. پرسیارەكە ئەوەیە لە تێڕوانینی تۆدا خەسڵەت و یاسا و تایبەتمەندی ئەم جۆرە قوماركردنە چییە؟ هەروەها جیاوازیشی چییە لەگەڵ ئەو جۆرە قوماركردنەی تایبەتە بەگرووپێكی دیاریكراو؟*

ڕێبوار: با بگەڕێینەوە بۆ یەك دوو لەو سەرنجانەی كە پێشتر بەخێرایی دەرم بڕین. ئەرستۆ مرۆڤ بەكائینێكی قسەكەر و لێرەشەوە بەكائینێكی عەقڵانی پێناسە دەكات، بەڵام كارڵ ماركس مرۆڤ بەكائینێكی زەحمەتكێش بەرهەمهێن تەماشا دەكات. هەشمانە وەك ئەدگار مۆرن مرۆڤ بە بوونێكی ئاڵۆز و خوێندنەوەشمان هەیە كە مرۆڤ وەك كائینێكی یاریكەر دەناسێنێ. ئەمەش بەمانای ئەوەیە هیچ پێناسەیەكی ستانداردمان بۆ مرۆڤ نییە و دەكرێ بە چەمكی جیاواز و لە ڕوانگەی جۆربەجۆرەوە ئەو كائینە بخوێنینەوە كە بابەتێكی ڕەها و دۆگمای خوێندنەوە نیە و هەمیشە لە گۆڕاندایە. بۆ نمونە دەكرێت وەك یاری تەماشای هەر یەكێك لەو چالاكیانە بكەین كە مرۆڤ لە زەمینە كۆمەڵایەتیە جیاوازەكاندا پێیان هەستاوە. مرۆڤ لەسەرەتادا یاری لەگەڵ سروشت دەكات، یاری لەگەڵ درەخت دەكات، یاری لەگەڵ ئاژەڵ و زیندەوەرەكاندا دەكات، ئێنجا وردە وردە ئەم یاریانە شێوەی كۆمەڵایەتیانەی خۆیان وەردەگرن و لەلایەن مرۆڤەوە دەبنە جۆرێك لە ئەنجامدانی ئەرك بۆ دوورخستنەوەی مەترسیەكان لەسەر خۆی. ئێمە هەموومان دەزانین ئامانجی ڕاوكردن بۆ مرۆڤی سەرەتایی بریتیە لە بەدەستهێنانی بژێوی ژیان، بەڵام ماهییەتی ڕاوكردن چییە ئەگەر لە شێوەی سەرەتاییانەی خۆیدا حەزی بردنەوە و زاڵبوونمان لای مرۆڤ بەسەر ئاژەڵدا بۆ ئاشكرا نەكات و ئەمەش تەنیا لە چوارچێوەی شێوازێكی یاریكردندا مەیسەر بووە. بۆ خەڵك قومار دەكات؟ بۆ قوماركردن سەرهەڵدەدات ئەگەر حەز و خواستێكی سەرەتایی مرۆڤ نەبوبێت بۆ یاریكردن و بردنەوە و باڵادەستی و خۆسەلماندن. خاڵێكیتر ئەوەیە مرۆڤ بوونەوەرێكە بڕوای بە داهاتوو هەیە، بڕوای بەیۆتۆپیا هەیە، بڕوای بەوەدیهێنانی شتێك هەیە كە ئێستا لەواقیعدا بۆی نایەتەدی. ئەمە ڕەنگە

یەکێك لەو هاندەرە سەرەکییانە بێ کە هانمان دەدات بۆ قومار کردن. لە قومارکردندا، تۆ قومار لەسەر نادیارێك، لەسەر شتێك دەکەی، یان سەرمایە لەپێناوی شتێکدا دادەنێیت کە لە هەنووکەدا نازانیت بۆت دەردەچێت، یان دەرناچێت. تۆ نازانیت لەو هەزاران کەسانەی کە هەمان جۆری قومار یاخود هەمان یارییانکردووە و سەرمایەیان بۆ داناوە، بردنەوە بە نسیبی کامیان و پاداشت بۆ کامیان دەردەچێت. کەواتە خۆدانە دەست یۆتۆپیایەك و داهاتوویەکی نادیار خەسڵەتێکی قومارکردنە.

بێگومان ئەگەر قومارکردن لە وڵاتی ئێمەدا بووبێتە دیاردەیەکی ئاوا سەراپاگیر کە تۆ باسی دەکەیت، ئەوە پەیوەندیەکی ڕیشەیشی هەیە بەنائومێدبوونی مرۆڤ لەو واقیعەی کە ئێستا ناتوانێت خەونەکانی ئێمە بهێنێتە دی. چونکە عەودالبوون بەرەو یۆتۆپیا و گەڕان بەدوای بەدیهێنانی نادیاردا خەسڵەتێکی ئەو کۆمەڵگایەیە کە واقیعێکی تێکشکاوی هەیە.

لێرەدا من نامەوێت چوارچێوەیەکی ڕەوا بە قومار ببەخشم، بەڵام من پێموایە مرۆڤی ئێمە لە واقیعی ئێمەدا مرۆڤێکە هەمیشە خەونەکانی بۆ داهاتوو هەڵدەگرێت، هەمیشە موخاتەرە دەکات بەئایندەی خۆی، لەو ڕێگەیەشەوە هەمیشە جۆرێك لە نائومێدبوونی تێدایە بەرامبەر بە واقیع. وەك گوتم بنەمای قومار بردنەوەیە و یەکێك لەو مژدانەی قومار دەیبەخشێت بریتیە لە گۆڕانێکی بنەبڕ لە ژیانی ئابووریماندا: ***بەگیرفانی بەتاڵەوە دەبیتە ملیۆنێر***. ئەم مژدەیە مرۆڤ دەهێنێتە سەر ئەو بڕوایەی پێی وابێت ئایندەی ئابووری ئەو لەڕێگای قومارکردنەوە بەدەست دێت، نەك لەڕێگای ترەوە. ئەوەندە نائومێد دەبێت لەوەی ناتوانێت لە ڕێگایەکی شیاوەوە ئایندەیەکی ئابووری بەدەست بێنێت، ئەوەندە نائومێد دەبێت لەو واقیعەی تیایدا دەژی، ئەوەندە خۆی بە بێتوانا دەزانێت لەئاست هەلومەرجەکاندا بۆ بەدەستهێنانی ئابوورییەکی شیاو بۆ ژیانی خۆی، دێت خۆی دەداتە دەست ڕیسکێك کە ڕیسکی قومارکردنە و ئەوەش ڕیسکێکە ئاشکرا نییە بۆت دەردەچێت یا دەرناچێت. ئەوەی لەم نێوانەدا بەدڵنیاییەوە دەیباتەوە قومار ڕێکخەر و قومار فرۆشەکانن، نەك قومارچییەکان! قومار ڕێکخەرەکان گرووپێکی تایبەتن کە دەسەڵاتی خۆیان لەو

هەموو شێوەی قومارانەوە بەدەست دەهێنن کە دەیانخەنە بازاڕەوە و خەیاڵ و زەینی ئێمەی پێ کۆنترۆڵ و چاوبەستمان دەکەن تا ئەو سنوورەی کە تووشی ئیدمان ببین. گوتاری ئەوان و مژدەکانیان بۆ بردنەوە ئەوەندە کاریگەرن کە تاکەکان نەتوانن لەبەرامبەریاندا بەرگریی لەخۆیان بکەن. لێرەوەیە کە ئیتر قومار خەسڵەتی یارییەك لەدەستدەدات و دەبێتە دیاردەیەکی نەیار و مەترسیی بۆسەر ژیانی تاکەکان دروستدەکات.

خاڵێکیتر کە بەلامەوە لەهەموویان گرنگترە ئەوەیە، ئێمە لەسەردەمێکی ژیانی کۆمەڵایەتیدا دەژین کە نە بەها سیاسیەکان، نە بەها کۆمەڵایەتیەکان، نە بەها کولتورییەکان ناتوانن خەڵکی لەدەوری خۆیان و یەکتر کۆبکەنەوە. ناتوانن پێناسەی ڕوون و ستاندارد بۆ ڕەفتار و نۆرمەکان بکەن، ئەمەش وادەکات مرۆڤ تووشی ***نۆرم پشێوی*** و ***ڕەفتارئاڵۆزی*** ببێت و سەرچاوەیەکی نەبێت بۆی بگەڕێتەوە. کەواتە ئەگەر قومار توانیویەتی گرووپێکی زۆر گەورە لەکۆمەڵگای ئێمە لەخۆی کۆبکاتەوە، بەمانای ئەوەیە قومار وەك ئایینێکی نوێ دەرکەوتووە! ئەوە خاڵێکە حەزدەکەم بیری لێبکەینەوە: قومار جۆرێکە لەئایینی نوێ، جۆرێکە لەبەرنامەیەکی نوێ کە زۆربەمان بڕوامان پێیەتی، چونکە هەمیشە لەنێوان ئایین و قوماردا خاڵێکی زۆر نزیك هەیە، کە ئەویش فاکتەری کاتە. لە ئاییندا شتەکان هەمیشە هەڵدەگیرێن بۆ ئایندە، ئەمەش وادەکات بە زەرورەت مرۆڤی بڕوادار مرۆڤێکی یۆتۆپیاخواز بێت. بەهەشت لەو مەسەلەیەدا ڕۆڵێکی تایبەتی هەیە و بەرجەستەکەری ئەو یۆتۆپیایەیە کە وەك مژدەیەك دراوە بە کەسی بڕوادار. ئەو مژدەیەی قوماریش بەمرۆڤی دەدات دۆخی بەهەشتیانەی بردنەوەیە بەڵام بەدەستکەوتێکی ئابوورییەوە. لێرەدا نامەوێت بڵێم بونیادی زەینییەتی ئایینی بوار دەڕەخسێنێ بۆ قومارکردن، بەڵام دەکرێ هۆی ئەو بەپیرەوەچوونە زۆرەی خەڵك لەئاست جۆرەکانی قوماردا، بگێڕینەوە بۆ ئەو لێکچوونەی لە نێوان ئەو دوو جۆرە لە مژدە بەخشیندا هەیە. بەتایبەتیش کە قومار توانایەکی زۆری هەیە بۆ کۆکردنەوەی کۆمەڵانێکی زۆری خەڵك، بەجیاوازی تەمەن و جیاوازی ڕەگوڕیشەی کۆمەڵایەتیو تەنانەت بەجیاوازیی ئینتیمای چینایەتیشیانەوە،

لەدەوروبەری خۆی. ئەم خاڵە لێکچوونێکی سەیر لە نێوان ئایین و قوماردا دروستدەکات، چونکە ئایینیش قودرەتێکی سەرسووڕهێنی هەیە بۆ کۆکردنەوەی خەڵکانی جیاواز، لەچین و توێژی جیاواز، بەئینتیمای جیاوازەوە لە چوارچێوەی هەمان بەرنامەدا. لەکاتێکدا زۆربەی ئایدیۆلۆژیا سیاسیەکان بەرنامەیەکن ئاراستەی چین و توێژێکی تایبەت کراون، نەك بەرەو هەموو کۆمەڵانی خەڵك. بۆنمونە ڤلادیمێر لینین دروشمی (کرێکارانی جیهان یەکگرن)ی بەرزکردەوە و گوتاری ئەم دروشمەش گوتارێکە ئاراستەی کرێکارانی جیهان کراوە. بەڵام گوتاری ئایین ئەم سنوورە تێکدەشکێنێ و وەرگرەکانی چین و توێژ و ڕەگەزێکی تایبەت نین. بۆیە ئەگەر وەك تۆ دەفەرمووی، ئەو قومارەی ئێستا ئێمە باسی دەکەین تایبەت نییە بەگروپێك یا چینێك یا توێژێکی دیاریکراوی نێو کۆمەڵگا، بەڵکو تاکەکانی سەرجەم چین و توێژەکان بەشداری تێدا دەکەن، ئەوە بەمانای ئەوەیە قوماریش بۆتە جۆرێك لە ئاییینی نوێ، یان جۆرێکی تری چالاکیە بەڵام لەچوارچێوەی بونیادێکی ئاییینیدا..

زیرەك: ***ئەی پێتوانیە جیاوازییش لەنێوان ئایین و قوماركردندا هەیە؟ ئەمەش لەوێوە کە قوماركردن گەمەیەکە تەمەنی دیاریکراوە، چونکە کەسی بەشداربوو پاش ماوەیەکی کەم دەرەنجامی گەمەکە دەزانێت، لێرەوە ئەو فانتازیا و ئەو خەونەی کەهەڵگریەتی (خەونی بردنەوە) لەو زەمەنە دیاریکراوەدا و لەگەڵ ڕاکێشانی بلیتەکان ئاشکرا دەبێت. واتە کەسی بەشداربوو کۆتاییەکە بەچاوی خۆی دەبینێت، بەڵام لەئاییندا پرسەکە بەم جۆرە نییە، چونکە کۆتاییەکەی دیاریکراو نییە. کەسی بەشداربوو کۆتایی بەچاوی خۆی نابینێت، ئەوە نازانێت ئایا لەولا بەهەشت دەباتەوە یا نا. هەروەها لە ئاییندا شتەکان دووبارە نابنەوە وەکو ئەوەی لەم جۆرە یاریکردنەدا هەیە..***

ڕێبوار: ئەمە جیاوازییەکی گرنگە، بەڵام لەبیریشت نەچێت مرۆڤ کاتێ بەشداری لە بوارێکدا دەکات و کاتی خۆی تێدا سەرف دەکات، ئەو کاراکتەرەش بەخۆیەوە دەگرێت کە ئەو بوارە بەسەریدا دەیسەپێنێ. بۆنمونە کەسێك کە ئامادەیە بەشداری لەم جۆرە قومارانەدا بکات، با بۆیشی دەرنەچێت بەڵام خەونی بۆدەرچوون و

بردنەوەی لەسەردا دەمێنێ. ئەمجارە نا، جارێکیتر. بەم یارییە نا بەویتریان. هەر لەبەر ئەوەشە تادێت جۆری یارییەکان، جۆری قومارەکان، جۆری لۆتۆکان زیاد دەبن، نەك کەم دەبنەوە. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەگەر مرۆڤی ئێمە بەو مانایە بەشداری لەم گەمەیەدا بکردایە کە گەمەیەکە یەکجار دەیکاتو ئیتر وازی لێدەهێنێت، ئەوکاتە جۆری یارییەکانیش کۆتاییان پێدەهات و بەسەر دەچوون. ئەمڕۆ مرۆڤ هەرتەنیا قومار لەسەر پارە ناکات، بەڵکو لەسەر هەموو ئەو شتانەش دەیکات کە بەپارەیەکی کەم یان زۆر دەکڕدرێن. ئەو کاتەی یاریکردن ناوەڕۆکی کۆمەلآیەتیانەی خۆی دەدۆڕێنێ، دەبێتە قومار و ئەمەشیان بۆی هەیە لەسەر چایەك بێ، لەسەر مریشکێ بێ یاخود لەسەر هەر شتێکیتر. گرنگ ئەوەیە پرنسیپی (بردنەوە) بخرێتە کار. کەواتە ئەم جۆرە قومارکردنە یان ئەم جۆری گەمەکردنە لەهەمان کاتدا ڕاهێنانی مرۆڤە بۆ دووبارەکردنەوەی. ئەوەی تۆ وەکو جیاوازیی نێوان ئایین و قومار دەستنیشانت کرد، ڕاستە. وەلێ ئەوەش خاڵێکی سەرنجراکێشی ئایینە کە بەردەوام لەدوای بەفر و بارانەکان، لەدوای ڕەهێڵەکان، لەدوای مردن و کۆستکەوتنەکان پێماندەڵێت: دەبێت بەسەبر و شوکرانەبژێر بین چونکە پاداشتی ئاخیرەت بەڕێوەیە. واتە بنەمای مژدەکە و ئەساسی پەیمانەکەی پێتدراوە لەشوێنی خۆی دەمێنێت. لەقوماریشدا بەهەمان شێوە، ئەم جارە دەیدۆڕێنی و کۆستی ئابووریت دەکەوێ، بەلآم شێوەی قومارکردنەکە وایە کە تۆ ڕادەهێنێت و سەبووریت پێدەبەخشێت تا لە هەلێکی تردا ئەمکارە بکەیتەوە، چونکە بردنەوە مژدەیەکی نەگۆڕە. ڕەنگە بتوانین بڵێین چ لە ئاییندا و چ لەمجۆرە قومارکردنەدا شێوەیەك لە خوو پێوەگرتن و ڕاهاتن ئامادەیی هەیە. سلووکی ئایینی و سلووکی یاریکردن دەبن بە بەشێك لە میکانیزمی جەستەی مرۆڤ، بەجۆرێ هەرکات کەسی بڕوادار لە مزگەوت نزیك کەوتەوە، میکانیزمی لەشی پاڵی پێوەدەنێت بچێتە ناویەوە و سلووکێکی ئایینی بنوێنێ، نوێژێ بکات، یان هیچ نەبێت سەرخەوێ بشکێنێ و دەستبەئاو بگەیەنێت و هتد. ئەوکەسەی لەسەر جۆرێ لە یاریکردنیش ڕادێت و خووی پێوە دەگرێ، ناتوانێ ئەو سەیارەیە نەبینێت و لێی نزیك نەبێتەوە کە بەو شێوە ڕەنگاوڕەنگە ئیدیعایەکانی

پێوە هەڵواسراوە و ئەو هەموو بلیتە بەدەوریدا شۆڕبۆتەوەو کەسێك لەوێ هاوار دەکات و نرخی خەڵاتەکان ئاشکرا دەکات. ناتوانێت نەبێتە بینەری ئەو کەناڵە تەلەفزیۆنیەی بەرنامە لەسەر ئەو بابەتانە پەخشدەکات و هتد.

زیرەك: *با قسە لەسەر ئەوەبکەین ئەو جۆرە دیاردەیە (کە پێموایە دەشێت ناوی قومارکردنی بەکۆمەڵ)ی لێبنێین، لە چ جۆرە ئەتمۆسفێرێك و لە چ واقیعێکی ژیانکردن، یا لە چ جۆرێکی کۆمەڵگا ئەگەری هاتنە ئارا و سەرهەڵدانی هەیە، بەتایبەتی کە سەراپاگیریانە تاکەکانی نێو زۆربەی چین و توێژەکانی کۆمەڵگا لەخۆی کۆدەکاتەوەو دەیانکاتە بەشداربوویەکی نێو خۆی؟*

ڕێبوار: من پێموایە ئەمە لە کۆمەڵگایەکدا سەرهەڵدەدات و دەبێتە دیاردەیەکی ئاوا سەراپاگیر، کە تیایدا هەموو بەها فیکری، سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئەخلاقی و ئایینیەکانیش لەقەیراندان و ناتوانن پێناسەی نۆرمە کۆمەڵایەتیەکان بکەن. بەمانایەکی دی، کاتێك بەهاکان دەکەونە قەیرانەوە و ئیتر ناتوانن پێناسەیەکی ستاندارد بۆ چۆنایەتی چالاکییە مرۆییەکان بکەن و ڕێککەوتنێکی هەمەلایەنی لەسەر نۆرمەکان لەئارادا نییە، ئەوا دیاردەی لەمجۆرە سەرهەڵدەدات. لەکۆمەڵگای ئێمەدا بەتایبەتی لەماوەی ئەم (١٣) ساڵەی دواییدا، کۆمەڵێك دیاردە و چالاکی سەریانهەڵداوە کە بەرلەوەی ئێمە هیچ پێناسەیەکیان بۆ بکەین، خۆیان بەڵگەن لەسەر هەبوونی قەیرانێکی فیکری، سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئەخلاقی و ئایینیش لەم کۆمەڵگایەدا.

زیرەك: *چۆن ئەمە ڕووندەکەیتەوە؟*

ڕێبوار: زۆربەی ئەوانەی قومار دەکەن یان گەمە دەکەن، دواجار ئینتیمایان هەیە بۆ ئایینێکی تایبەت و بەم پێیەش بۆی هەیە لە نوێژی ڕۆژی هەینیدا بەشداری بکەن، ڕەمەزانیش بە ڕۆژوو بن، ئەگەر لێی بپرسی ئەرکە ئایینیەکان جێبەجێ دەکات یان نا، بۆی هەیە هەمووی جێبەجێ بکات و لەمەشدا ڕاست بکا.. بەڵام دواجار ئایین نەیتوانیوە پێناسەی ئەو بەهایانە بکات کە پێویستە ئەو مرۆڤە لە ژیانی خۆیدا ڕەچاویان بکات. کەواتە ئەوە بڕوا نەهێنانی مرۆڤە بەو بەهاو نرخانەی کە ئایین بۆی

دادەنێت و ئەمەش وادەکات بڕوات بەشداری لەقوماركردندا بكات، لەگەڵ ئەوەشدا كە ئایین ئەم دیاردەیەی حەرامكردووە. دەكرێت هەمان كەس لەنێو گروپێكی سیاسیشدا بێت و بەرپرسیارێتی هەبێت لەئاست ئەو ئامانجانەدا كە ڕەوتە سیاسیەكەی بۆی دەستنیشانكردووە. بەڵام دیسان سیاسەتیش نەیتوانیبێت ئەو بەهایانەی بۆ پێناسە بكات كەپێویستە ئەو مرۆڤە هەڵگریان بێت و لەگەڵ ئامانجەكەدا ناكۆك نەبن. دەشێت هەمان مرۆڤ كە قومار دەكات ئینتیمایەكی كۆمەڵایەتیشی هەبێت. لانیكەم سەر بەخێزانێكە و ئێمە دەشزانین لە خێزاندا وەك یەكەیەكی مرۆیی كە تیایدا تاكەكەس ئامادە دەكرێت بۆ ژیانێكی كۆمەڵایەتیانەی گەورەتر، قومار شتێكە وەك دزی و دەستدرێژیكردن ڕەتدەكرێتەوە. بەهەرحاڵ، ئەوانەی قومار دەكەن مرۆڤی ناو ئەم كۆمەڵگایەن و بەهەمان سیستەمی پەروەردەیی و كۆمەڵایەتیدا ڕەتبوون كە بڕیارە تاكی كولتووریزەبوومان بۆ بەرهەم بهێنێ. بەڵام لەبەر ئەوەی سیستەمی پەروەردەیی ئێمەش وەك سیستەمی ئایینی، سیاسی و كۆمەڵایەتیمان لەقەیراندایە، ئەوە ناشتوانێت ئەو بەهایانە بخولقێنێ كە پێویستە ببنە بەهای ستاندارد و لە سلووكی كەسەكاندا ڕەنگ بدەنەوە. كەواتە دەتوانین ئەوە بڵێین: ئەم دیاردەیە دیاردەی ئەو كۆمەڵگایانەیە، كە تیایدا سیستەمە كۆمەڵایەتیەكان بەشێوەیەكی گشتی لەقەیراندان و ناتوانن سنووری چالاكیەكانی مرۆڤ بەپێی كۆمەڵێ نۆرم و بەهای پەسەند دەستنیشان بكەن. دیارە ئەمەش دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی دۆخێك كە تیایدا ڕەفتارەكان ئاڵۆز بوون و نۆرمەكانیش شێواون..

زیرەك: ***واتێدەگەم تۆزێك بەخێرایی بەسەر ڕەهەندە سیاسەكەی ئەم دیاردەیەدا تێپەڕیت، یا باشتر بڵێم سەرپێیانە ئەم بوارەت بەسەركردەوە. من حەزدەكەم لەم بوارەدا بمێنینەوە و هەندێك قسە لەسەر ئەوە بكەین، ئەم قومارە بەكۆمەڵە، یان ئەو یارییە بەكۆمەڵییە (وەكئەوەی تۆ ناوت لێنا) تاچەند پەیوەندی بەگەمەی سیاسیەكانەوە هەیە بۆ ئەوەی بەجۆرێك لەجۆرەكان تاكەكانی نێو كۆكەڵگای ئێمە بخافڵێنن پێیانەوە. وایان لێبكەن بیر لەوە بكەنەوە لەڕێگای ئەم یارییانەوە دەتوانن بكەنە ژیانێك و پاشەڕۆژێكی باشتر بۆخۆیان، نەوەكو بیر لەوە بكەنەوە كە***

***سیاسەکان دەستیان بەسەر سەروەت و سامانی ئەو وڵاتەدا گرتووە و بۆخۆیان پاوانیان کردووە کەبەشێکی ماف ئەوانە. مەبەستم ئەوەیە سیاسییەکان لەپشت ئەم گەمەیەوە بیانەوێت خەڵک سەرقاڵ بکەن تاوەکو بیر لەمافە زەوتکراوەکانیان نەکەنەوە؟***

ڕێبوار: کاتێك دەڵێین ئەمجۆرە یاریکردن یان قومارکردنانە لەوجۆرە کۆمەڵگایانەدا سەرهەڵدەدەن کەسیستەمەکانی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا لەقەیراندان، سیاسەتیش یەکێکە لەو سیستەمانە. ڕەنگە ئەمەش پێمان بڵێت کە سیاسەت (بەو مانایەی ڕێکخەری کۆمەڵگاو بەڕێوەبەری کۆمەڵگایە) لەوڵاتی ئێمەدا نەیتوانیوە سەرهەڵبدات، چونکە ئەگەر سیاسەت بەو مانایە تەماشا بکەین کە ڕێکخەر و بەڕێوەبەری کۆمەڵگایە، ئەوا یەکێك لەو دیاردانەی نابێت سەرهەڵبدات ئەمجۆرە خۆسەرگەرمکردنەیە. کاتێك لەوڵاتی ئێمەدا جۆرێك لە سیاسەت پەیڕەو دەکرێت کە ناتوانێت مژدەی واقیعی بدات بەخەڵك، ناتوانێت خەڵك بەشداری پێبکات لەدروستکردنی گۆڕانە کۆمەڵایەتیەکاندا، ناتوانێت ئیعتراف بەتوانای تاکە کەسەکان بکات وەك کەسانێك کە دەشێت ڕۆڵیان هەبێت لەبوارە جیاوازەکاندا، بێگومان دەکرێت لەو فەزا سیاسیە قەیراناویەدا ئەم دیاردەیە و چەندین دیاردەی لادەرانە و شێوێنەری دی سەرهەڵبدەن و خودی ئەم دیاردانەش هەمدیسان خزمەت بەو سیاسەتە بکەنەوە. لەبیرمان نەچێت نمونەیەکی بەرجەستەی نزیك لەوڵاتی خۆمانەوە وڵاتی ئێرانە لەسەردەمی پاشایەتیدا. لەو سەردەمەدا سیستەمی سیاسی لە ئێراندا ئیشێکی زۆری بۆ ئەوە دەکرد لەهەموو شارو شارۆچکەکان تەنانەت قەزا و ناحیەکانیشدا هەموو ئەو ئیمکانیەتە سەرگەرمکەرانەی تیا دروست بکرێت، کە ڕەواج دەدەن بە شێواندن و لادان نەك پێگەیاندن و گەشەپێدان. تورکیاش نمونەیەکی دیکەیە. کەواتە ئێمە هەر لەبەردەم لادان و گەندەڵی و شێواندنی سیاسیانەدا نین، بەڵکو لەبەردەم سیاسەتی لادان و سیاسەتی گەندەڵی و سیاسەتی شێواندنیشداین. ئەمە ئەو سیاسەتەیە کە دەتوانێت لەڕێگای چاوبەستکردنی خەڵکەوە دۆخێك بهێنێتە ئاراوە تا نەتوانن بیر لەکێشە واقیعیەکانی خۆیان بکەنەوە. ئەم سیاسەتە ئیشدەکات لەسەر دروستکردنی

واقیعێکی درۆزن کە تیایدا مرۆڤ دەبێت هەمیشە خۆشبەخت بێت، هەمیشە سەرگەرم بێت، هەمیشەش ئومێدەوار و بێ کێشە. هەر ئەو دیاردەیە بۆ خۆی ئێستا لەنێو تەلەڤزیۆن و کەناڵەکانی ئێمەدا ڕەواجی پەیداکردووە. ئێستا تەلەڤزیۆن یەکێکە لەو ئامرازانەی بەدەست سیاسیەوە ئەو کارەی پێدەکات. تەلەڤزیۆن مۆدێلێك لەکچ و کوڕی کوردمان پێشان دەدات کە لەگەڵ کوڕو کچی کوردی نێو واقیعی کۆمەڵایەتی کوردستان زۆر جیاوازن. ئەم دەزگایە ڕۆڵێکی زۆر سەیر دەگێڕێ لە کۆنتڕۆڵ و ئاراستەکردنی زەوقی گەنجی ئێمەدا. هەندێك لە دیمەنەکانی، بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەندییان بە لاوانەوە هەیە، گەنجەکانی ئێمە بە کچ و کوڕەوە توشی نامۆبوونێك دەکەن لەبەردەمی تەلەڤزیۆندا، چونکە ئەوان هەرگیز ناتوانن بەوجۆرە بن. ئەوان هەرگیز ناتوانن گەنجێك بن کە کۆمەڵێ کچ بەدەوریاندا سەما بکەن. ئەگەر ئەم کەناڵانە و ئەمجۆرە (باریانە) دواجار لەلایەن سیاسەت خۆشیەوە بەرنامەیان بۆ دانەڕێژرا بێت، بەڵام لەوەدا خزمەت بەسیاسەتێکی قەیراناوی دەکەن کە مرۆڤەکان چەواشە دەکەن و دووریان دەخەنەوە لەوەی بەچاوێکی واقیعیانە ژیانی خۆیان ببینن. چونکە مرۆڤ لەم ڕێگایەوە بەردەوام لەواقیع دوور دەخرێتەوە، بەردەوام بێتوانا دەکرێت لەوەی کە ڕووبەڕووی کێشە واقیعیەکانی خۆی بێتەوە، بەردەوام ڕادەهێنرێت لەسەر ئەوەی خەون ببینێت بەواقیعێکی نادیارەوە کە دەبێت موخاتەرەی بۆ بکات، دەبێت ریسکی بۆ بکات، بەبێ ئەوەی بۆ زۆر لە کەسە بەشداربووەکانی ناو ئەم گەمەیە ئەو واقیعە و ئەو موژدەیە بێتەدی.

بەودیوی تردا ماوەی ئەو سیازدە ساڵەی وڵاتی ئێمە، سیاسیەکان بەردەوام جەختیان لەسەر ڕەفتارێك کردووە و نواندوویانە کە ڕەفتاری براوەیە. ئەوان هەر گەمەیەکیان کردبێت لە بردنەوە دڵنیابوون، تەنانەت ئەگەر شەڕکردنیش بووبێت. ئەوان مۆدێلێکیان لە خۆیان پیشاندا کە مرۆڤگەلێکن بەردەوام قومار دەکەن و بەردەوامیش دەیبەنەوە. ئەوان لە پێشمەرگایەتییەوە بوون بە ملیۆنێر، لە نانەڕەقخواردنەوە بوونە خاوەنی هوتێل و ڕیستۆرانەکان، لە کەسێکەوە کە بستێ زەوییان نەبوو، بوون بە خاوەنی شارەکان و سەیرانگا و دەشتاییەکان. ئەوان قومارێکی تازەیان داهێنا کە

ڕێساکەی بەدڵنیاییەوە بردنەوەیە. ئەمەش غەریزەی بردنەوەی لە مرۆڤی ئێمەدا هێندەی تر بێدار کردەوە. بردنەوە بەهەر پاساوێك و بەهەر نرخێك و لە هەر بارودۆخێکدا. بەڵام ڕەفتاری براوە لەهەموو کاتێکدا ڕەفتارێکی ئەخلاقیانە نیە، هەر بۆیەشە ئەوەی وەك ئەنجامی ئەو ڕەفتارە دەرکەوتووە بریتیە لە گەندەڵییەکی سەراپاگیر لەهەموو بوارەکاندا. ئەمە جگە لە گۆڕینی ئەخلاقیاتی ئەم مرۆڤە لەبواری کارکردن و پێکەوەژیانی کۆمەڵایەتیدا.

زیرەك: ***تۆ لەیەکێك لەپرسیارەکانی پێشەوە بەکورتی ئاماژەت بەوەدا، ئەو کەسانەی بەشداری دەکەن لەم گەمەیە یان لەم قومارەدا ڕەنگە هەڵگری دینێك بن، بەڵام دواجار ئەم قومارەش دەکەن. پێم باشە لێرەدا هەڵوەستەیەك بکەین و کەمێك لەبواری ئایینیدا قسە بکەین. ئاشکرایە تاکەکانی کۆمەڵگای ئێمە بارگاویکراون بەفکری ئایینی، بەردەوام پەیڕەوی لەسروت و چالاکیە ئایینیەکان دەکەن، بۆنمونە جێبەجێکردنی نوێژو فەرزەکانیتر، خوتبەکردنی ڕۆژانی هەینی، بەڕێوەبوونی ڕەمەزانان و.. بەدەر لەمانەش لەنێو کۆمەڵگای ئێمەدا چەندین کەناڵ و ئامرازی ڕاگەیاندنی لەشێوەی ( تی.ڤی، رادیۆ، ڕۆژنامە..) هەیە، کە بەردەوام ئامۆژگاری تاکەکان دەکات و دونیایەك بکەو مەکەیان لەبەردەمدا قیت دەکاتەوە. لێرەوە لەگەڵ ئەوەی ئەو هەموو چالاکیە ئایینیانە دەکرێت، ئەو هەموو خوتبانەی ڕۆژانی هەینی و ئەو هەموو ئامۆژگاریانەی لەنێو کەناڵە ڕاگەیاندنەکان دەکرێت، کەچی دەبینین خەڵکەکە بەکۆ هاوڕان لەسەر ئەوەی بەشداری لەپرۆسەیەکی لەم چەشنە بکەن کە قومار کردنە. کۆمیدیاکەش ئەوەیە ئەم پرۆسەیە بەپێی ئەخلاق و پێوەری باوی ئەم ئایینەی خەڵك ئینتیمای بۆ دەکەن، پرۆسەیەکی حەرامە و نزیك بوونەوە لێی قەدەغەیە. لێرەوە تاکی کۆمەڵگای ئێمە لەلایەکدا زۆر جەخت لەسەر مەسەلەی حەڵاڵی و حەرامی دەکات و بەرەو ڕووی پرسە ئایینیەکان دەچێت، لەلایەکیتردا بە کۆ بەشداری لەپرۆسەیەکی حەرامدا دەکەن. پرسیار ئەوەیە ئەو دووفاقییەی لەکەسایەتی ئینسانی ئێمەدا هەیە چییە؟ تۆ لەکوێدا دەیدۆزیتەوە یا بۆچی دەیگێڕیتەوە؟ بەمانایەکیتر: چ شتێك هەیە وادەکات لەیەك کاتدا تۆ هەڵگری ئایدیای***

***ئایینێك بیت و شتێکیش بکەیت جیاواز لەو ئایدیایە بێ کە لەنێو ئایینەکەدا هەیە؟ یا شتێك بکەیت دژی ئایدیای ئایینەکە بێت؟***

ڕێبوار: جاریێ دەبێت بڵێین ئەوەی کە لە مەراسیمی ئایینیدا بەشداری دەکەیت جیاوازە لەوەی کە هەڵگری بیروڕای ئایینێك بیت. مرۆڤە ئیماندارەکان مرۆڤی بەتەقیبەن، کەمتر دەکەونە ژێر کاریگەریی تەماعەکانی خۆیان. بەبڕوای من زۆرینەی ئەوەی لەکۆمەڵگای ئێمەدا هەیە سلووك و خووی ئایینیە، نەك ئیمانی ڕاستەقینە. واتە ئێمە هەڵدەستین بەئەنجامدانی کۆمەڵێك جوڵەی میکانیکی کە پێویستە لە مەراسیمە ئایینیەکاندا ئەنجام بدرێن، نەك ڕەفتارگەلێك کە ئیمان بەرجەستە دەکەن. تۆ ئەرکە ئایینیەکانی خۆت جێبەجێ دەکەیت، بەڵام دوای ئەوە تۆ دەبیتەوە بەخۆت، واتە تۆ سلووکی ئایینی جێبەجێ دەکەیت، نەك ئەوەی هەڵگری باوەڕی ئایینی بە مانا ڕۆحیو مەعنەویەی کە دەشێت بۆ ئایین هەمان بێت. ئەمە خاڵێك.. خاڵێکیتر ئەوەیە کە ئایین بەم شێوەیەی لە وڵاتی ئێمەدا هەیە بۆتە ئایینێکی بەدەزگا بوو، بەئایینێکی دامەزراوەیی و کارمەند و خەڵکانی بەدەسەڵاتی خۆی هەیە. ئەم دامەزراوەیەش لەقەیرانێکی زۆر گەورەدایە وەکو هەموو دامەزراوەکانیتر. مانای ئەوەیە نابێت هەرگیز وا تێبگەین مادام خەڵکانێکی زۆر بەشداری لەمەراسیمە ئایینیەکاندا دەکەن، ئەوا ئێمە ئیمانداری زۆریشمان هەیە، چونکە دواجار هەر ئەو خەڵکانەن کە بەرماڵەکانیان بەلوولکراوی لەسەر شان و ژێر باڵدایە، دێنەوە دوکانەکانیان نرخی شتەکان گران دەکەن، غەدر لە کڕیارەکانیان دەکەن، خواردنو کەلوپەلی کۆنیان پێدەفرۆشن و هتد. کەواتە پێویستە یەکەمجار سلووکی ئایینی لەئایین خۆی جیابکەینەوە. دووهەمین شت بەبڕوای من ئایین خۆی لەقەیراندایە. هەروەکو ئاماژەم پێدا ئایین لەگەڵ ئەوەشدا گرووپێکی گەورەی خەڵکی کۆمەڵگای ئێمەی لەخۆی کۆکردۆتەوە، بەڵام ناتوانێت ئەو بەها کۆمەڵایەتیانە دەستنیشان بکات کە پێویستە مرۆڤەکان لە ژیانی ڕۆژانەیاندا پەیڕەوی لێبکەن. قەیرانی ئایین لەوێدایە، کە دەتوانێت مرۆڤەکانی ئێمە بگێڕێتەوە بۆ هەندێك حاڵەتی حەماسی، کەفوکووڵ و خرۆشان، توندوتیژی و کۆکردنەوەیان لەدەوری دۆخێکی غەریزی، زیاتر لەوەی کە بۆ

دۆخێکی عەقڵانی ئامادەیان بکا. بەهەمان شێوە سیستەمی سیاسی ئێمەش لە قەیراندایە و ناتوانێت ئەو بەهایانە دەستنیشان بکات کە ببنە بەهای کۆمەڵگای ئێمە. هەروەکو چۆن خێزان لەقەیراندایە ناتوانێت چیدی بەهاکان دەستنیشان بکات، ئاواش ئاین لەقەیراندایە وەك دامەزراوەیەك لەوڵاتی ئێمەدا. من ئەو دژایەتی ناکۆکیو دووفاقیە ئالەوێدا دەبینمەوە، کەخەڵکی ئێمە ڕادێن لەسەر ئەوەی سلووکی ئایینی جێبەجێ بکەن، خوو بە ئایینەوە بگرن، بەڵام ناتوانن ئیمانداری ڕاستەقینە بن. بۆ نمونە منداڵێك کەهیچ لە ئاین تێناگات، کەچی بەجۆرێ ڕەفتاری پێدەکرێت و فێر دەکرێت و ڕادەهێنرێت بە زمانێك بئاخڤێ کە زمانی منداڵ نیە و ئەو زمانەش دەربڕی جیهانێکی منداڵانە نیە. بەڵام ئێمە دەزانین بەشێکی تێگەیشتن لە ئاین پەیوەندی بەئاستی کولتوریزەبوونی تاکەمرۆڤەکانەوە هەیە، واتە تۆ دەبێت بەسیستەمێکی رۆشنبیریدا تێپەڕیت تاببیت بەمرۆڤێکی ئیماندار. هیچ یەکێك لەپێغەمبەرەکان مرۆڤی گێل نەبوون، مرۆڤی ئیماندار بەشێوەیەکی گشتی ئەو مرۆڤەیە کە بۆخۆشی لەدروستکردنی ئەو ئیمانەدا، لەپرۆسەی ئیمانهێناندا ڕۆڵێکی گەورەی هەیە، بەوەی کە لەدنیا ڕادەمێنێ، لە بوون ڕادەمێنێ، لە ژیان و لەمردن ڕادەمێنێ، لە چێژە ڕاگوزەر و چێژە ئەبەدییەکان ڕادەمێنێ..، تا ئەم تێڕامانە بۆخۆی ئاستێکی کولتوری و ڕۆشنبیری پێویستە کە لەگەڵ تەمەندا کەڵەکە دەکرێت نەك لە منداڵییەوە و لە زگماکەوە. کەچی لە وڵاتی ئێمەدا لە منداڵیەوە ئێمە سلووکی ئایینی جێبەجێ دەکەین بەس نابینە مرۆڤی ئیماندار، هەموو قورئانمان پێ لەبەر دەکەن و لەوسەرەوە بکووژ و درۆزنمان لێدەردەچێت. قەیرانی دامەزراوە ئایینیەکان لەوەدایە کە خەڵکێکی زۆریان لەخۆیان کۆکردۆتەوە، بەڵام تەنیا سلووکە ئایینیەکانیان پێ جێبەجێ دەکەن و توانایان نییە بیانکەنە مرۆڤی ئیماندار. واتە توانایان نییە ئەو خۆراکە مەعنەوی و ڕۆشنبیرییەیان بدەنێ کە بۆ دروستبوونی ئیمان پێویستە. ئەوەش بەمانای ئەوەیە لەنێوان ئاین وەك کۆمەڵێك پرنسیپ و ئەوانەی دەزگا ئایینیەکانیان بەدەستەوەن و نوێنەرایەتی ئاین دەکەن، دابڕانێك هەیە. واتا ئەوانەی نوێنەرایەتی ئاین دەکەن لەوڵاتی ئێمەدا ناتوانن یان شکستیان هێناوە لەوەی بتوانن

تەعبیرێکی ئیماندارانە لەئایین بکەن، زیاتر لەوە خەڵك کۆدەکەنەوە بۆ جێبەجێکردنی سلووکی ئایینی و ڕایاندەهێنن خوو بەهەندێ ڕەفتارەوە بگرن کە لە مەراسیمە ئایینیەکاندا پێویستن. دیارە ئەمەش مرۆیەکی دووفاقت بۆ بەرهەمدەهێنێ نەك هاولاتییەك کە ڕێز لە بنەما هاوبەشەکانی ژیانی کۆمەلایەتی بگرێت و لەهەمان کاتیشدا مومارەسەی باوەڕداری خۆی بکا.

زیرەك: ***بێگومان هەر دیاردەیەك کە لەنێو واقیعی کۆمەلایەتی کۆمەڵگایەکدا ئامادەیی هەبێت خاڵی نییە لەلایەنی پۆزەتیڤی و لایەنی نێگەتیڤی، بەبۆچوونی تۆ پۆزەتیڤی و نێگەتیڤی ئەم دیاردەیە کە قومارە، لەکوێدایە؟***

ڕێبوار: وەکو ئاماژەم پێکرد من لەسەرەتاوە حەزم نەدەکرد ناو لەمە بنێین قومار، پێمخۆش بوو بەو شێوەیە لێکیبدەینەوە کە جۆرێکە لەحەزی مرۆڤ بۆ بەدیهاتنی خەونەکانی لەداهاتوودا. جۆرێك لە یاریکردن، جۆرێك لەبەگروپبوونی نوێ.. بەولایتردا، کۆمەڵگای ئێمە لە گۆڕانێکدایە، لە دووڕیانێکدایە و دەیەوێ لە کۆمەڵگایەکی نەریتخوازەوە بگوازێتەوە بۆ کۆمەڵگایەك، کە خەریکە هەندێ پرۆسەی مۆدێرنیزەبوون تیایدا سەرهەڵدەدا. ئەم دۆخی ژیانە لە دووڕیاندا بۆخۆی هەندێك چالاکی و پێویستی نوێش دەهێنێتە نێو کۆمەڵگاوە. زۆربوونی ئامرازەکان، بۆنمونە ئامرازەکانی ڕاگەیاندن زیاتر جێی دەستیان دیار دەبێت لەو کۆمەڵگا داهاتووەی ئێمەدا، زۆربوونی ڕێگاوبانەکان، زۆربوونی دامەزراوەکان، هەموویان جێ دەستیان بەو گۆڕانکاریانەوە دیار دەبێت کە دەشێت لەداهاتووی کۆمەڵگای ئێمەدا ڕوو‌بدەن. لەگەڵ ئەمانەشدا شێوەکانی کات بەسەربردن دەگۆڕێن و شێوەی نوێ دێنە ئاراوە. کەواتە دەکرێ ئەم قومارە بەکۆمەڵییە، یان ئەم گەمە بەکۆمەڵیە جۆرێکیتر بێت لە خۆسەرگەرمکردن و کات بەسەربردن. بەبڕوای من لایەنە نێگەتیڤەکەی لەوەدایە ئێمە نەتوانین کۆنترۆڵی ئەم دیاردانە بکەین، بەومانایەی نەتوانین لەڕووی یاساییەوە سنورێك بۆ زۆربوونی ئەم جۆرە دیاردانە، ئەو قومارە بەکۆمەڵیانە دەستنیشان بکەین. مەترسیی ئەمە لەوەدایە کە نەتوانین ئەو نرخ و بەهایانە ڕەواج پێبدەین کە خەڵك دوور دەخەنەوە لەو قومارە بەکۆمەڵیانە و ببنە خوویەکی میللی و نەتەوەیی.

مەترسی لەوەدایە هەمووشتێك ببێتە مادەیەك بۆ قومار لەسەرکردن و هەموو یارییەکان ماهییەتی کۆمەڵایەتیانەی خۆیان بدۆڕێنن و ئیتر نەتوانین بەشێوەیەکی خاوێن پێکەوە گەمە بکەین. هەڵبەت لەگەڵ ئەوەدا نیم قەدەغە بکرێن، چونکە دواجار ئەوەش کێشەی دیکەی بەدواوە دێت، بەڵام بەبڕوای من دەکرێ لەڕێگای دروستکردنی ئەڵتەرناتیڤو شێوازی دیکەی کات بەسەربردنی بەسوودەوە خەبات لەدژی ئەم نەخۆشییە بەکۆمەڵیە بکرێ. دەکرێ مرۆڤی ئەم کۆمەڵگایە ئاشنا بکرێ بە شێوازی دیکەی یاریکردن و کات بەسەر بردن و هانبدرێ بیر لەوە بکاتەوە کە ئەم گەمە بەکۆمەڵییە گەمەیەکی بێزلێکراوە. دەشێت مرۆڤ لەساڵێکدا جارێك بیکات، نەك هەموو ڕۆژێك، نەك ئاوا بەکۆمەڵ.. دەکرێت زۆر کار و پڕۆژەی دی بخرێنە ڕوو تاکو خەڵکی ئەوەیان لێنەبێتە ئایینێکی نوێ. لەمەشدا بێگومان سیستەمی ئیداری، سیستەمی سیاسی، سیستەمی کۆمەڵایەتی ئێمە بەرپرسیارە لەوەی ئەو ئەڵتەرناتیڤانە بخاتە بەردەست کە بۆ پڕکردنەوەی کاتی دەستبەتاڵی و سەرگەرمی پێویستن، بۆئەوەی مرۆڤی ئێمە بەرەو خۆپەروەردەکردنێکی ڕاستەقینە ببەن و بیکەنە هاوڵاتی، نەك بەهۆی لۆژیکێکی ئابووریانەوە هانیبدەن بەرەو قومارێکی بەکۆمەڵی.

زیرەك: *من بەرلەوەی ئەم گفتوگۆیە ساز بکەم، لەگەڵ چەند کەسێکدا قسەمکردووە و بەشێکی ئەوان هۆکاری بەشداریکردنیان لەم قومارەدا دەگێڕنەوە بۆ نەبوونی یەکسانی کۆمەڵایەتیو خراپی باری گوزەرانو نەمانی بەها کۆمەڵایەتیەکان، هەروەها بەشێکی زۆریش هۆکاری بەشداربوونیان دەگێڕنەوە بۆ هەژاریو کەم دەرامەتی. بەپشت بەستنمان بەم قسانەی سەرەوە دەگەینە ئەو خاڵەی بڵێین: ئەم دیاردەیە بۆیە هەیە چونکە هەژاریو کەم دەرامەتی باڵی بەسەر کۆمەڵگادا کێشاوە، تاکەکانی کۆمەڵگا لەبارێکی سەختدا ژیان دەگوزەرێنن، جگە لەمە فەسادێکی زۆر باڵی بەسەر کۆی سیستەمەکانی نێو کۆمەڵگا داکێشاوە، هەر بۆیەش تاك (بەکڕینی پلیتێك یا زیاتر) بەشداری لەم قومارە دەکات تاوەکو لەم میحنەتیەو لەم ژیانە ناخۆشە ڕزگاری بێت کەتێی کەوتووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا (وەکو ئەوەی لەنێو مێدیاکان و لەکاتی*

*مەراسیمی راکێشانی پلیتەکان)دا دەبینرێت، بەشداربوو هەیە زیاتر لەچەند سەد پلیتێکی کڕیوەو بڕێکی زۆر پارەی بۆ ئەم مەسەلەیە سەرف کردووە. ئەگەر بەشداریکردنی کەسانی هەژار و کەم دەرامەت هۆکارەکەی هەژاریو نەبوونی بێت بەمەبەستی چاك بوونی باری گوزەرانی، ئەی هۆکاری بەشداریکردنی کەسانی لەجۆری دووەم، چییە؟ لەکاتێکدا ئاماژەکانیش ئەوە دەخوێننەوە کە ئەو نەمێندە هەژار و نەبوو و کەم دەرامەتە، نە پێویستیشی بەو خەڵاتە هەیە کە لە قومارەکەدا مژدەی پێدەدرێت، لێرەوە ئەم جۆرە بەشداریکردنە چۆن لێکدەدەیتەوە؟*

ڕێبوار: دیسانەوە من ئەو مەسەلەیە دەبەستمەوە بەوەی کاتێك کۆی سیستەمەکانی کۆمەڵگایەك لە قەیراندانو ناتوانن ئەو بەهاو نرخانە رەواج پێبدەن کەمرۆڤی ئەم وڵاتە پێویستی پێیانەو پێویستە لەدەوریان کۆبێتەوە، کاتێك ئەم قەیرانە هەبێت ئەوا ئەو قەیرانە بۆ هەمووانە، هەم بۆ دەوڵەمەندەکان و هەم بۆ هەژارەکانیش. واتا قەیرانەکان قەیرانن بۆ مرۆڤ بەشێوەیەکی گشتی لەم کۆمەڵگایەدا، نەك بۆ چینێکی تایبەت یا تەنیا بۆ هەژارەکان. بەبڕوای من ڕێژەی کڕینەکان ئەوەمان پێناڵێن کە هەژارەکان یان دەوڵەمەندەکان چەند دەیکڕن، ئەوەمان پێناڵێت مادام دەوڵەمەندەکان زیاتر دەیکڕن کەواتە ئەوان زیاتر ڕواج بەم قومارە دەدەن وەك لەوەی هەژارەکان دەیدەن، چونکە خۆی لەخۆیدا ڕێژەکە ماهیەتی قومارەکە دیاری ناکات، بەڵکو ئەوە دیاری دەکات کە ئەم گەمەیە هەیە. ئەم گەمەیە گەمەیەکە بۆ هەموومان، لە ژیانی هەمووماندا.. ئەمە لەلایەك، لەلایەکیتریشەوە پرۆسەی دەوڵەمەندبوون لەوڵاتی ئێمەدا بەتایبەتی لەم (١٣) ساڵەی دواییدا بە بارودۆخێکی تەندروستانەی خۆیدا نەڕۆشتووە. تۆ دەوڵەمەندبووی تازەپێگەیشتوت هەیە، ئەوەی کە پێی دەوترێت (تازە پیاکەوتوو)، ئەمانە لە دەرەنجامی پرۆسەیەکی دووردرێژی پلانداناني ئابووریەوە بەئاستێکی دەوڵەمەندی نەگەیشتوون. بەڵکو ئێمە لەکۆمەڵگایەکدا ژیاوین کە ئینتیما بۆ حیزبێکی سیاسی، بواری ئەوەی بۆ ڕەخساندوین تا بەزووترین کات دەوڵەمەند ببین. بەشداربوونمان لە ناکۆکی و شەڕە ناوخۆییەکاندا هەلێکی دیکەی ڕەخساندووە بۆ دەوڵەمەندبوون. ئەو جۆرە

دەوڵەمەندبوونەش پاڵپشتێکی کولتوری و ڕۆشنبیریی ئەو تۆی نییە، تا ڕێبگریَ لەوەی مرۆڤ ئەمجۆرە قوماره نەکات. ئێمە خەڵکێکی دەوڵەمەندی بێ کولتوور و بێ ئەتەکیەتمان هەیە، واتە بەهەمان کولتوری تەقلیدیانەوە دەوڵەمەندبووە و سەرمایەی بۆخۆی پچڕیوە، بەڵام ئاستە کولتورییەکەی هەر لەشوێنی خۆیدا ماوە.

زیرەك: *دەتوانین بڵێین لەڕووخسارردا، لەبوونی ماتریاڵ و کەلوپەلی تەکنۆلۆژیدا گۆرانکاری بەسەردا هاتووەو دەوڵەمەندبووە، بەلام لە جەوهەردا، لە عەقڵدا، لەئاستی تێفکرین و بیرکردنەوەدا هەروەکو خۆیەتیو دەوڵەمەند نەبووە؟*

ڕێبوار: بەڵێ دەتوانین بڵێین لەماوەی ١٢ساڵی ڕابردوودا دەستەبژێرێك بەهۆی پێگەکەیانەوە توانیویانە سەرمایەیەکی بەرچاو بۆخۆیان کەڵەکە بکەن، بەلام نەیانتوانیوە لەڕووی کولتوورییەوە یەك هەنگاو بگۆڕێن. ئەو کەسانە لە دەستبەسەراگرتنی تەکنەلۆژیا و ئامێرەکانی ڕاگەیاندن و هاتووچۆدا دەوڵەمەندبوون، بەڵام لەئاستی کولتوریدا زۆر هەژارن و هەر هەمان مرۆڤە توندڕەوە باوکسالار و تەقلیدیەکانی جارانن کە بۆی هەیە لەهەر ساتەوەختێکدا، هەر قاتێکیان لەبەردا بێت و هەر سەیارەیەکیان لەژێردا بێت، بینەوە بەخۆیان و بەهەمان ئەخلاقی هەرەمەکیانەوە ڕەفتار بنوێنن. واتا ئەوان سەرمایەیەکیان لەبەردەستدایە هەروەکو چۆن دەتوانێت سەیارەی تازەی پێبکڕێت، ڤیدیۆی تازەی پێبکڕێت، ئاواش دەتوانێت بڕی پارەی زۆر بەو پلیتو لۆتۆیانە بدات کە جۆرێکن لە گەمەکردنو قومارکردن. واتە میکانیزمی بەشداربوونەکە هەمان میکانیزمە ونەو کولتورەی لەپشتیەوەیەتی هەمان کولتوری هەژارە. ئەوەشمان لەبیر نەچێت کە مرۆڤ حەزی تاقیکردنەوەی شتی نوێشی هەیە، ئێمەش لە کۆمەڵگایەکداین هەنوکە تەماعێکی زۆر دەخرێتە بەر دەممان بۆ تاقیکردنەوەی شتی تازە. ئەم لۆتۆ کردنە، ئەم قومارە بەکۆمەڵیەش دیسان شتێکی تازەیە. ڕەنگە ئێستا ئێمە نەتوانین بەشێوەیەکی بنەبڕ قسەی لێبکەین، بەڵکو ئەمە بەتێپەڕینی کات بۆی هەیە دامرکێتەوە و لەئاستێکدا بوەستێتو ڕەنگە ببێتە کولتووری دەستە و توێژێکی تایبەت، نەك هەموو کۆمەڵگا.

بەلأم ئێستا لەبەر ئەوەی تازەیە بڕوا دەکەم هەموومان حەزی ئەوەمان هەیە ڕۆژگارێك لۆتۆیەك بکرین.

زیرەك: *لەم دیالۆگەی پێشەوە تاڕادەیەك قسەمان لەدیاردەی قوماری بەکۆمەڵ کرد، هەوڵماندا ڕەهەندو لایەنە جیاوازەکانی بەسەر بکەینەوەو تیشکی بخەینەسەر. سەرەتا باسی چەمکی قومارمان کرد، ئینجا ئەو فەزاو ئەتمۆسفێرە، لەگەڵ جۆری ئەو کۆمەڵگایەی قوماری بەکۆمەڵی تیا سەرهەڵدەدات، جگە لەمە هۆکارو فاکتەرە ڕێخۆشکارەکان و لایەنە پۆزەتیڤ و نێگەتیڤیەکانی ئەم دیاردەمان ئاشکرا کرد، دوای ئەمانەش باسی ئیزدواجیەتی کەسایەتی ئینسانی کوردیمان کرد، ئێستا بەبۆچوونی تۆ چ پرسیارێك باش بوو بمانکردبا و نەمان کردووە؟، یان بەوێنەیەکیتر: چ پرسێك گرنگ بوو بمان وروژاندبا و نەمان وروژاندووە؟*

ڕێبوار: لەدوای ساڵی(٩١)ەوە کۆمەڵگای ئێمە کۆمەڵگایەك بووە جۆرەها شێوە پێناسە هەڵدەگرێت. یەکێك لەو پێناسانە ئەوەیە کۆمەڵگای ئێمە کۆمەڵگای پرسەیە وەك ئەوەی بەختیار عەلی ناوی دەنێت. کۆمەڵگایەکی شەڕخواز بووە، کولتوری تەوری بەرهەمهێناوە، کولتورێکی بەدگومانیی بەرهەمهێناوە کەبرا گومانی لەبرا کردووە، برا بۆتە دوژمنی برا، باوك بۆتە دوژمنی کوڕ، خوشك ئیخباری لەبرای کردووە. ئایین بەهەمان شێوە ڕۆڵی بینیوە بۆ ئاراستەکردنی کۆمەڵگای ئێمە بەرەو شوێنێکیتر کە بەدەگمەن ئینسانی بووە. سیاسەت بەهەمان شێوە ڕۆڵی خۆی بینیوە لە دروستکردنی لادان و توندڕەوی کۆمەلأیەتیدا. ئەم کۆمەڵگایەی ئێمە لەو (١٣) ساڵەی دواییدا بەردەوام خەسڵەتەکانی کۆمەڵگای مرۆیی لەدەستداوە، دەگمەن بوون ئەو هێزانەی ئیشیان کردووە بۆ بەئینسانیکردنەوەی ئەم کۆمەڵگایە. دەکرێت ئەو پرسیارە بکەین: ئایا ئێمە بۆچی لە مرۆڤگەلێکی شۆڕشگێڕەوە بووین بە مرۆڤگەلێکی قومارچی؟ ئایا دەشێت وەك کۆمەڵگایەکی قومارچی سەیری خۆمان بکەین؟ بێگومان لێرەدا وشەی قومار بەمانایەکی فراوانتر بەکار دەهێنم، چونکە بەبڕوای من وەختێك تۆ دەتوانی ئەو هەموو شەڕە بکەیت، ئەو هەموو پیلانە دابنێی بۆ تێوەپێچانی خەڵك، ئەو هەموو حەزی تۆڵە کردنەوەیەت تیابێت، ئەو هەموو بەدگومانیە دروست بووبێت

لەکۆمەڵگادا، ئەو هەموو توندڕەوییە بەناوی سیاسەتو ئایینەوە، ئەو هەموو یاساشکێنیە.. هەموو ئەمانە دەکرێت ببنە هاندەرێکیش بۆ ئەوەی دواجار مرۆڤێکی قومارچی دەربهاوێژن. مرۆڤێك کە هەموو شتێك و هەموو پەیوەندییەك وەك مادەیەك بۆ قومارکردن تەماشا بکات. مرۆڤێك بەردەوام لەسەر حسابی ئەوانیتر بیەوێت براوە بێت و بۆ ئەمەش سڵ نەکاتەوە لە هیچ شتێ. ئەخلاقی بردنەوە، مەترسیدارە چونکە کار بۆ بەرژەوەندی تایبەتی بکەرەکەی دەکات و مرۆڤ فێر دەکات پەیوەندیی خۆی و هاوسەرەکەی، پەیوەندی خۆی و وەزیفەکەی و تەنانەت پەیوەندیی خۆی و حیزبەکەیشی وەك جۆرێ لە قومارکردن تەماشا بکات. بێگومان هەمووی ئەمانەش گوزارشت لەئاڵۆزبوونو قەیراناویبوونی ئەو کۆمەڵگایە دەکەن کە ئێمەی تیا دەژین.

زیرەك: ***باشە بامەر لەو بابەتەی ورووژاندت بمێنینەوە، تۆ پێت وانییە لەو شوێنەی کە من دەڵێم قوماری بەکۆمەڵ، ڕێك ئەو قسەیە ڕاست بێت کە کۆمەڵگایەکی قومارچیمان هەیە، چونکە کاتێك ئێمە دەبینین لە هەموو چین و توێژەکان، لە منداڵ، لە کچو کوڕی هەرزەکار، لە ئافرەت، لە پیاو، لە فەرمانبەر، لە کرێکار، لە هەموو دەستەو تاقمەکانی نێو کۆمەڵگا بەکۆ بەشداری لەم قومارە بکەن، ئایا پێتوانیە ئەم قسەیە ڕاست دەردەچێت کە کۆمەڵگایەکی قومارچیمان هەیە؟***

ڕێبوار: سەیرکە، کاتێك کۆمەڵە مرۆڤێك کۆ دەبنەوەو ڕێکدەکەون لەسەر ئەوەی جۆرێك لەچالاکی بنوێنن، ئەم مرۆڤانە لەهەمان کاتیشدا سروشتێکی تایبەتی بەم کۆمەڵگایە دەبەخشن و نۆرمەکانی خۆیان زاڵ دەکەن. واتە شێوازی ئیشکردنی کۆمەڵە مرۆییەکان لەکۆمەڵگایەکدا، سیفەتێکی تایبەتیش بەو کۆمەڵگایە دەبەخشێت. هەر لەم ڕوانگەیەوە با نمونەیەکت بۆ بهێنمەوە: ئەگەر تاکەکانی کۆمەڵگای سویدی، یا دانمارکی یاخود نەرویجی نەبوبنە مرۆڤی دیموکراسی، ئێمە ناتوانین بەکۆمەڵگای سویدی یا دانمارکی یان نەرویجی بڵێین کۆمەڵگایەکە لەکۆمەڵگا دیموکراسیەکانی جیهان. بەبڕوای من دەتوانین بەشێوەیەکی میتۆدیانەتر بڵێین: هێزی بەشداربووی هاووڵاتیان لە دروستکردنی ئەو بەها مرۆییانەی کە پێویستە لە کۆمەڵگایەکدا هەبن، دەستنیشانی سرووشتی ئەو کۆمەڵگایە دەکات. ئەگەر هەموو مرۆڤەکان یا

گروپگەلێکی زۆر لەکۆمەڵگادا سەرگەرم و سەرقاڵی ئەو بەهایانە بن کە کۆمەڵگا بەرەو دۆڕانو تێکشکان دەبەن، ئەم کۆمەڵگایە کۆمەڵگایەکی تێکشکاوی لێدەردەچێت. بەهەمان شێوە، ئەگەر هێز و گرووپەکانی نێو کۆمەڵگا خەریکی دروستکردنی ئەو بەهایانە بن کە بەهای مرۆیی و کۆمەڵایەتین و سوودبەخشن بۆ ژیانی هاوبەشی کۆمەڵایەتیانەی خۆیان، ئەوە کۆمەڵگاش سروشتێکی تایبەت بەخۆیەوە دەگرێت. سیاسەتێکی تایبەت بەخۆی دەردەهاوێژێت، ئایین وەزیفەی دیکە وەردەگرێت و خێزانیش ئەرکی دیکە جێبەجێدەکات. بەڵام کاتێک ئێمە تەماشا دەکەین لە خێزاندا سەرکوتکردنێکی زۆر هەیە، لە ئاییندا توندوتیژی بەرهەم دێتەوە، لە سیاسەتی ئێمەدا عینادی و کەللەرەقی و گەندەڵی دروست دەبێت، ئەوە ئەندامەکانی ئەو خێزانو سیاسەت و ئایینە دەبنە هەڵگری ئەو بەهایانەی کە خۆشبەختی و هەستی هاوبەش لەو کۆمەڵگایە دوور دەخەنەوە و ئەخلاقی بردنەوە زاڵ دەبێت. بەبڕوای من لەماوەی ئەو چەند ساڵەی ڕابردوودا ئێمە لەئاستی بەئینسانیکردنەوەی ئەم کۆمەڵگایەدا شکستمان هێناوە، لەگەڵیشیدا ئەو هێزە کۆمەڵایەتیە چالاکانەی کە دەبوو کۆمەڵگای ئێمە بەئینسانی بکەنەوەو بەها ئینسانیەکانی بۆ بگێڕنەوە، لاواز و بەپەراوێز کراون. ئەمەش بۆ خۆی ئەو قسەیە دەسەلمێنێت کە دەڵێ، کاتێ ئەخلاقی بردنەوە باڵادەست بێت، هەموو یاریکردنێک دەبێتە قومار و هەر کاتێکیش قومارکردن دەبێتە دیاردەیەکی بەکۆمەڵی، ئەوا کۆمەڵگایەکی قومارچیش بەرهەمدەهێنێت.

- سوپاس بۆ ئەم گفتوگۆیە.

# لە پەیوەندییەوە بۆ خۆشەویستی

## گفتوگۆ لەگەڵ ئاری عومەر

### تەوەری یەکەم

*{پەیوەندی چیە و بۆچی پێویستە؟ پەیوەندیی وەك چەمکێکی تەندروست و وەك پانتاییەك بۆ بەختەوەری. لە خۆناسینەوە بۆ ناسینی بەرامبەر و لەوێشەوە بۆ پەیوەندی لەنێوان دوو مرۆڤی سەربەخۆدا}.*

## پەیوەنـــدی

***پێمخۆشە سەرەتا لە چەمکی پەیوەندییەوە دەستپێبکەین: ئایا پەیوەندیی ئێمە لەم کۆمەڵگایەدا پەیوەندییەکی دروستە، واتە ڕەهەندێکی ئەقڵانی ماوچەرخی هەیە؟ یان لەپەیوەندی تەقلیدی لەسەر بنەمای گەورەو بچووك تێپەڕ ناکات؟***

- بەرلەوەی باس لە دروستی و عەقڵانیبوونی پەیوەندییەك بکەین، بابزانین ئێمە چی لەمانای زاراوەی «پەیوەندیی» خۆی تێدەگەین؟ ئەم زاراوەیە دەلالەت لە هەبوونی دوو جەمسەر، یان دوو لایەنی سەربەخۆ دەکات و ڕایەڵی نێوان ئەم دوو جەمسەرە و ئەوەی پێکیانەوە دەبەستێتەوە پێی دەگوترێ (پەیوەندی). ئەوەی بەلای منەوە گرنگە سەربەخۆبوونی ئەو دوو لایەنەیە کە پەیوەندیەکەیان لە نێواندایە، چونکە ئەگەر فاکتەری سەربەخۆییمان لەبەرچاو نەگرت ئەوە ناشتوانین

باسی پەیوەندی بکەین و ئەوکاتە دەشێ باس لە تێکەڵبوون، توانەوە، فەنا و سەپاندن و هتد بکەین نەک پەیوەندی. دوو لایەنیش کە تێکەڵ دەبن و لەیەکدا دەتوێنەوە، چیدی پەیوەندییان لە نێواندا نیە، یان پەیوەندیەکەیان لەئاستێکی تردایە بەبێ ئەوەی ئیدی ئەوان وەك خۆیان مابن و خاوەنی سەربەخۆیی خۆیان بن. بۆیە بەبڕوای من پەیوەندی کاتێك پەیوەندییە کە لایەنە پێکهێنەرەکانی ئەم پەیوەندییە، (چ دوو کەس بن، یا دوو گروپ، یان دوو نەتەوە و میللەت، یاخود دوو ئاراستەی رۆشنبیری و کولتووری بن)، بتوانن لەو پەیوەندییەدا خۆیان دروستبکەن و پەیوەندیی ببێتە پانتاییەك بۆ خۆدروستکردن، ببێتە وزەیەك بۆ خۆ تازەکردنەوە و ببێتە رێگایەك بۆ بەردەوامیدان بە ژیانێکی مرۆڤانەی دەروەست و ئەخلاقیانە بەبێ ئەوەی سەربەخۆیی خۆیان و ئەو شتە لەدەست بدەن کە ئەوان وەك لایەنێکی دانسقە و تایبەت پێناسە دەکات. بەم مانایە پەیوەندی گەرانتێکە دەتوانێ وامان لێبکات ئێمە وەك مرۆڤ بتوانین پەیوندی بەمرۆڤەکانی بەرامبەرمانەوە بکەین و مافی ئەخلاقیو سیاسیو کۆمەڵایەتی و بوونخوازانەی بەرامبەرەکەمان لەو پەیوەندییەدا پێشێل نەکرێ. واتە پەیوەندیی پێویستییەکی مرۆڤە بۆ نزیکبوونەوە لە خودی خۆی و لە ئەوانیتریش و لەوێشەوە نزیکبوونەوەی لەو خەونانەی کە بەختەوەرتر و دڵنیاتری دەکەنەوە لە ژیانێکی پڕ بەها. پەیوەندی ئەو کاتە تەندروستە کەمن تیایدا ئەو پەیوەندییە لەگەڵ تۆ، بۆ وەدەستهێنانی دەسەڵاتێکی تایبەت بەکار نەهێنم تاتۆی پێ جڵەو بکەم، یان تۆی پێ کۆنترۆڵ بکەم، چونکە ئەمە بەمانای ئەوەیە من رێزم لە دانسقەیی و سەربەخۆبوونی تۆ نەگرت و ئەمەش یەکەمین هەنگاوە بۆ سەرهەڵدانی ستەمکاری و دیکتاتۆریەت و سڕینەوەی بەرامبەر. بەپێی ئەم تێڕوانینە، بۆی هەیە لە پەیوەندیی نێوان دایك و باوك و منداڵە ساوەکەیان، یا نێوان ئێمە و خوشك و برا بچکۆلەکەمان و تەنانەت دوو کەسیشدا کە خۆشەویستی یەکترن، خەسڵەتی ستەمکارانە هەبێت و ئەمەش بەناوی جۆربەجۆرەوە ئاراستە بکرێت. هەڵبەت ئەم تێگەیشتنە لەپەیوەندی تەنیا پەیوەندی نێوان مرۆڤ و مرۆڤ دەگرێتەوە، نەك مرۆڤ و ئاژەڵ یان مرۆڤ و درەخت و مرۆڤ و خودا. چونکە بەبڕوای من پەیوەندی

بەو مانایەی باسمکرد، تەنیا پەیوەندییە لەنێوان بووە عاقڵەکاندا، واتە لە نێوان مرۆڤ و مرۆڤدا نەك مرۆڤ و شتەکانی تردا، کە ناتوانین لێرەدا زۆر لەسەری بدوێین. هێندە هەیە پێویستە بیرمان نەچێ ئەوەی لەنێوان مرۆڤ و ئاژەڵدایە زیاتر لەسەر بنەمای (دەستەمۆکرن)ـەوەیە و ئەوەی لەنێوان مرۆڤ و سروشتدایە لەسەر بنەمای (سوود و قازانج) و ئەوەش کە لەنێوان مرۆڤ و یەزداندایە لەسەر بنەمای (باوەڕهێنان) و ملکەچییەوەیە و لەهەموو ئەم دۆخانەشدا ئەوشتەی کە سەربەخۆیی لایەنەکانە لەئارادا نیە، بۆیە پەیوەندیشیان نیە، یاخود پەیوەندییەکەیان لە ئاستێکی تردایە .

بەدبەختانە ئەم پێناسەیە بۆ پەیوەندی لەو کۆمەڵگایانەدا کە ڕێز و حورمەتێك لە تاکەکەس ناگیرێت، شتێکی دەگمەنە و لەم ڕووەیشەوە پەیوەندی لە کۆمەڵگایەکی وەك کۆمەڵگای خۆماندا لە قەیراندایە، چونکە جیهانبینی کۆمەڵایەتیانەی ئێمە و سیستەمی ئەخلاقی و سیاسی و پەروەردەیی ئێمە هەموویان لەسەر بنەمای کۆگەلییەوە دامەزراون و ئەمەش ڕێدەگرێ کە لەو سیستەمانەدا پەیوەندیی بەشێوەیەکی تەندروستانە دابمەزرێ، چونکە تیایاندا مانایەکی جێگیر بۆ چەمکی تاکەکەس لەئارادا نیە کە بەردی بناخەی هەر پەیوەندییەکی تەندروستانەیە. ئەوەی ئێمە لە کۆمەڵگای کوردیدا دەیبینین پەیوەندییەکی تەندروست نیە، بەڵکو شێوازێکی گیرۆدەکردنی تاکەکانە لەناو تۆڕێکی پێکەوەبوونی کۆمەڵایەتیدا و لەژێر زەبری کۆمەڵێ بەها و یاسای نەنووسراودا کە بوونەتە یاسای بەدەروونیبووی تاکەکان و لەلایەن سیستەمێکی فراوانی چاودێریکردنی توندوتیژەوە جڵەو دەکرێن. بۆیە ئەو شتەی ئێمە پێمانوایە لە کۆمەڵگاکەماندا پانتایی پەیوەندی پێکدەهێنێت، نەك هەر توانای نیە لایەنە پێکهێنەرەکانی ئەم پەیوەندییە کامەران و دڵخۆش بکات، نەك هەر ناتوانێت دەرفەتی خۆدروستکردن بخاتە بەردەم تاکەکەس، بەڵکو پەژموردەی دەکات و کۆمەڵێ گرێی دەروونی بۆ دروستدەکات کە دواجار ئاسان نییە خۆیان لێدەرباز بکات. ئێمە بەو پێیەی لە لە کۆمەڵگایەکی مرۆییدا دەژین، ئەوە بە پێویست خۆشمان لەناو کۆمەڵێ پەیوەندیدا دەبینینەوە، وەلێ ئەو پەیوەندیە ناتەندروستانە، نە وزەی خۆ دروستکردنمان پێدەبەخشن و نە بەختەوەریشمان دەکەن. ئەگەر تۆ

تەماشـای پەیوەندییـەکانی خـۆت و مـن تەماشـای پەیوەندییـەکانی خـۆم لەگـەڵ دەوروبـەری خۆمانـدا بکـەین، دەبیـنین جـۆرە میکـانیزم و کەشـوهەوایەك لەناویانـدا حـاکمو دەسـەڵاتدارە کـە ناچـارمان دەکـا هەمیـشە دەسـت لـە بەشـێك لەحـەز و خواستەکانی خۆمان هەڵبگرین بۆ ئەوەی دڵی بەرامبەر ڕازیی بکـەین. هەمیـشە ناچـار دەبین برێك لەئازادییەکانی خۆمان لەدەست بدەین بـۆ ئـەوەی کەسـی بەرامبـەر، یـان گرووپی بەرامبەر، یان بۆچوونی بەرامبەر دڵنیا بکەین و بەو جۆرە.. هەڵبەت لە هـەموو پەیوەندییەکدا ئاسـتێکی دڵنیـاکردن و ڕازییکردنـی بەرامبـەر و ڕێژەیـەکی دۆڕانـدنی ئـازادی لـەئارادا هەیـە و پەیوەنـدی بـەبێ قوربانیـدان مەحاڵـە، بـەڵام دواجـار پەیوەندییەکـــە دەبێـــت توانـــای باربووکردنـــەوەی وزە لەدەستـــچووەکەمان و دروستکردنەوەی ئازادییەکی فراوانتریشی هەبێت، دەنا نەبۆتە پەیوەندییەکی دروست و لە «گیرۆدەبوون» و بوون بەداوی تۆڕێکی کۆمەڵایەتییەوە زیاتر، هیچیتر نیە. بۆیـە لە نەبوونی تێگەیشتنێکی ورد و پێناسەیەکی تیۆریانەدا بۆ چەمکی پەیوەندی، ئـەوە لە ئاستی ژیانی پراکتیکیماندا پەیوەندییەکان نەك هەر بەختەوەریمان بۆ دابین ناکەن بەڵکو لە کۆژانەکانیشمان(معانات) زیاد دەکـەن. بۆیـە لەکاتێکدا دەڵـێین: پەیوەنـدی ئـەو پانتاییەیـە کـە پێویـستە تیایـدا بەختـەوەربین و ئـەو بەختەوەریـە بـۆ خـۆ دروستکردنو بۆ دۆزینەوەی ڕەهەنـدە شـاراوەکانی کەسـێتی خۆمـان بـەکار بهێـنین، لەگەڵ واقیعی (پەیوەندییە پراکتیکیەکان)ی خۆماندا دەکەوینە ناکۆکییەوە و هیچیان ئەو پێناسەیەیان لەسەر ناچەسپێ کـە دەشـێت بـۆ پەیوەندییـەکی دروسـت لەسـەری ڕێکبکەوین. چونکە بەکەمێ وردبوونەوە لە پەیوەندیەکانمان بۆمان دەردەکەوێ ئێمـە بەدەست ئازاری گەورەوە دەناڵێنین کە زۆربەیان پەیوەنـدییان هەیـە بـەو مەرجانـەی بەرامبـەر بۆمـان دایـدەنێ یـان ئێمـە بـۆ بەرامبـەری دادەنـێین تـا ئـەو پەیوەندییـەی پێکـەوە هەمانـە بـەردەوامیی خـۆی وەربگـرێ. کەواتـە ئێمـە لەسـەر حـسابی «بەردەوامیدان» بە پەیوەندییەکانمان، دەبین بەداوی ئـەو تـۆڕە کۆمەڵایەتییـەوە کـە (بەردەوامیی) بە نیشانەی سەرکەوتن لێکدەداتەوە و پەیوەندییەکەش دەکاتە پاشکۆ و قاوغێك بۆ گیرۆدەبوونی ئێمە لەگەڵ ئەوانیتردا. بـۆ نمونـە پەیوەنـدی هاوسـەرێتی،

پەیوەندی مامۆستا و قوتابی، پەیوەندی باوان و منداڵەکانیان و هتد، هەموویان لەو قەیرانەدا دەژیـن و بەردەوامیـدان بۆتـە خـاڵی سـەرەکیی نـەك بەختـەوەربوون. لـە کۆمەڵگای ئێمەدا سووپایەك ژن و مێرد، قشوونێ مامۆستا و قوتـابی و عەشـرەتێ لـە ئەنـدامانی خێـزان هـەن کـە دەیانـەوێ لێکـدی جیـا ببنـەوە و سـەربەخۆیی خۆیـان بەدەست بهێنن، وەلێ بەناچاری دەبێت بەردەوامبن. بێگومان لەم بارودۆخەدا خـودی پەیوەندیەکـە لـە «ئامـانج»ێکـەوە دەبێتـە «ئـامراز»ێـك و ناتوانێـت بەشـێوەیەکی سرووشـتی بـەردەوامی وەربگرێـت و نەخۆشـدەکەوێت و یـەك ڕێگـای لەبەردەمـدا دەمێنێت کە ئەویش تەقینەوە و هەڵوەشانەوەیەکی تراژیدیانە و تێکشکانێکی ڕۆحیی گەورەیـە بـۆ لایەنـە پێکهێنـەرەکانی. ئـەم تێکـشکان و هەڵوەشـانەوە و تراژیـدیا ڕۆحیانەن کە ژیانی شەخسیمان گومڕا و موبتەلا دەکەن و لە جیاتی دەروونێکی ئارام و ڕۆحێکی مەزن، هەلاهەلا و شەقار شـەقارمان دەکـەن و بـەژیان و ئومێـدەواربوون و گەشبینی نامۆمـان دەکـەن. ئـەوە سرووشـتی هـەر پەیوەندییـەکی ناتەندروسـتە کـە ناهێڵێـت پەیوەندییـەکان ببنـە پەیوەنـدیی نێـوان کەسـە سـەربەخۆکان تـا بەجیاوازییـەکانی خۆیانـەوە لەگـەڵ یـەکتردا بـچنە نـاو پەیمانێکـەوە و بـەبێ هـیچ ئازاردانێکی یەکدی، یەکتری وەکئەوەی کە هەن، قەبووڵ بکەن. کۆمەڵگای گەلـەخواز و کۆخواز ئەمجۆرە پەیوەندییە قەبووڵناکات چونکە پێیوایە لـەوێوە تاکـەکان دەچـنە دەرەوەی کـۆنترۆڵی خۆیـەوە و بـواری ئـازادکردنی خۆیـان لـە یاسـا گەلەکییـەکان دەدۆزنـەوە. لـە کۆمەڵگایـەکی وەکئـەوەی ئێمـە پەیوەندییـەکی دەوێـت کـە توانـای هەڵگەڕانەوەی هەبێت بۆ پەیوەندییەك کەتیایدا من بمـەوێ جیـاوازیی تـۆ بـسڕمەوە و تۆ ناچار بکەم تەماعی ئاوێتە بوونێك لەگەڵ میزاجـی مـن، لەگـەڵ هـزری مـن، لەگـەڵ عەقڵییەتی مندا دروست بکـەیت و کەسـی بەرامبـەریش بەهـەمان شێوە. ئالێرەدایـە کەپەیوەنـدی دەبێتـە پانتاییـەکی تـری خۆبەرهەمهێنانـەوەی کۆمـەڵگا و لەهـەمان کاتیـشدا دەبێتـە ئامرازێـك بەدەسـت سیـستەمە کۆمەڵایەتییەکانـەوە تـا بەهۆیـەوە ئەندامەکان یەکتری بەرزەفت بکەنەوە و ببنـە چـاودێر بەسـەر یـەکترەوە. لێرەشـەوە تێدەگەین کە شێوازی پەیوەندی لە لـە کۆمەڵگایـەکی وەك کۆمـەڵگا نەریتخوازەکـەی

ئێمەدا، ئەو قاوغەیە بۆ جڵەوکردنی ئەندامان تا لەناویدا هەموو ئەو میکانیزمانەی، هەموو ئەو شێوازی مامەڵەکردنانەی نەریتخوازیی دەیەوێ، بەردەوامی وەربگرن. بێگومان ئەم جۆرە پەیوەندیەش جگەلەوەی لەسەر بنەمای گەورە و بچووکەوە خۆی ڕێکدەخات و مافی تەواو دەداتە گەورە و ڕدێن سپییەکان، ئاواش پەیوەندییەکی نا عەقڵانیانەیە. بەو مانایەی کە عەقڵ لە پێناسەکردن و ڕێکخستنیدا ڕۆڵی نیە و هەموو یاساکانی لەلایەن نەریتە بۆماوەکانەوە دارێژراون.

*** تۆ پێتوایە بۆ ئەوەی پەیوەندییەکانمان پەیوەندییەکی کۆك‌و دروست بن پێویستیمان بەخۆناسین هەیە و دواتر پێویستمان بەناسینی بەرامبەر هەیە، واتە پێتوایە لەکۆمەڵگای کوردیدا شتێك هەبێ ناوی خودگەرایی بێ.. وابزانم ئێمە هێشتا لەناو کۆگەراییدا ین؟***

ـ کاتێك ئێمە پرسیاری پەیوەندیمان لادەبێتە پرسیار و وەختێك تۆ پەیوەندی دەکەیتە بابەتێك بۆ بیرلێکردنەوە، بەناچاری پێویستە باس لە پەیوەندی وەکئەوەی پەیوەندیە لە نێوان تاکە سەربەخۆ و ئازاد و خاوەن ئیرادەکاندا، بکەین و بپرسین: ئایا تاچەندە دەتوانین پەیوەندی بەو مانایەی کەپێشتر باسمکرد وەك پانتاییەك بۆ دروستکردنی خودیەتی خۆمان بەکاربهێنین؟ من لە بەشێکی قسەکانمدا جەختم لەسەر ئەوە کردەوە کە کۆمەڵگای ئێمە ڕێگە بەو جۆرە پەیوەندیانە نادات کە تیایاندا تاك بوارێك دەدۆزێتەوە بۆ دەربازبوون لە یاسا گەلەکیەکان. بەڵام ئەوە سرووشتی پەیوەندییەکی تەندروستانەیە کە بتوانێت دروستکەری تاکەکەس بێت. کەواتە لەگەڵ دەستکردنمان بە ئاخافتن لەسەر پەیوەندی، دەستیشدەکەین بە قسەکردن لەسەر ڕۆڵی تاك لەو پەیوەندیەدا. دروستبوونی پەیوەندی بۆخۆی دروستکەری تاکە و دەربازکردنیەتی لە گیرۆدەبوونی بە تۆڕە گەلەکی و سەپێنراوەکانەوە. کۆمەڵگای کوردی هیچ ڕێزێکی ئەوتۆی بۆ تاکەکەس لەدەرەوەی سیستەمی کۆگەلیەوە نیە، بەڵام هەر لەناو ئەم کۆمەڵگایەدایە کە تۆ پرسیار لەسەر پەیوەندی دەکەیت و دەیکەیتە کێشەیەك بۆ گفتوگۆ لەسەرکردن و دەتەوێت پێناسەیەك بۆ پەیوەندی بەرهەمبهێنیت. ئەمجا کێشەکە لەو ناکۆکیەدایە کە لە نێوان

پێناسەکردنەکان و واقیعی پراکتیکیانەی ئەو شتەدا هەیە کە ئێمە پێمانوایە ناوی پەیوەندییە. بۆ نمونە پەیوەندی هاوڕێیەتی وەربگرە و کەمێ لێی ووردبەرەوە: ئێمە هەمووومان پێناسەی هاوڕێیەتی وەك ئایدیالێکی ژیانی خۆمان و وەك پیرۆزییەك دەکەین، کەچی لەکاتی پراکتیزەکردنی ئەم پەیوەندییەدا زۆربەی کات ئێمە دیسان بەختەوەر نین، دیسان زویر و پەژموردەین، دیسان هەستدەکەین بەردەوام پێویستیمان بە دەستپێکردنەوەی سەرلەنوێ هەیە لەگەڵ ئەوکەسانەی کە هاوڕێمانن و بگرە جەستە و رۆحی هەر کامێکمان شوێنزامی ئەو برینانەی پێوەیە کە هاوڕیکانمان لەسەریان هەڵکەندووە. زۆربەی شەڕەکان و ناکۆکیەکان شەڕی نێوان «هاوڕێکان»ی دوێنێ و «نەیارەکان»ی ئەمڕۆن و گەلێ نمونەمان لەبەردەستایە کە ڕاستیی ئەم لێکدانەوەیە دەسەلمێنن. کەواتە پەیوەندی لەلای ئێمە هێشتا نەبۆتە پانتاییەکی سەربەخۆ تا بواری خۆ دروستکردن و خۆ ناسینمان بخاتە بەردەم، چونکە ئێمە ناتوانین پەیوەندیی قەبووڵ بکەین ئەگەر بڕوامان بە سەربەخۆیی خۆمان و بەرامبەرەکەمان نەبێت و تیایدا نەتوانین خودی خۆمان بین. پێویستە بەدەر لە ویستی کۆمەڵگا، پێوەرمان بۆ پەیوەندیی باش ئەوەبێ کە تاچەندە ئەو پەیوەندییە بوار بۆ من دەڕەخسێنێ کەببمەوە بەخۆم وەك خودێك لەبەرامبەر کەسێکی تردا کەدیسان خاوەن خودێتی خۆیەتی. پەیوەندی ئەو دۆخەیە کە ئەم دوو تاکەکەسە بەخودبووە کۆ دەکاتەوە، نەك دوو لایەنی مەرجدار کە خۆیان گیرۆدەی کۆمەڵێك ئازار و کێشە دەکەن لەناو پەیوەندییە ناچاریەکەیاندا. هەرکات پەیوەندی نەیتوانی ئازادیی هاتنەدەرەوەمان لە خۆی بۆ دابین بکا، دەبێتە بەندیخانە. بۆیە مەرجی پەیوەندی شتێ نیە لەسەرەتاوە ڕابگەیەنرێ، بەڵکو شتگەلێکن لە ژیانی پراکتیکیدا لەسەریان ڕێکدەکەوین و دروستیاندەکەین بۆ پاراستنی پەیوەندیەکەمان لەو مەترسیانەی دەورەیان داوە. یەکەم مەرجی ئەو جۆرە پەیوەندیەش ئەوەیە کە نابێت ئامادەیی ئێمە لەناو پەیوەندییەکدا ببێتە هەڕەشە بەسەر خواستو ئارەزوو و ئیرادەی یەکترەوە و لەهەمان کاتیشدا ئەم پەیوەندییە پێویستە یارمەتیمان بدات خۆشمان بدۆزینەوە. کەواتە مەسەلەی پەیوەندی لە بنەمادا جۆرێکە لەخۆدزینەوە

لەو کۆگەلییە سەپاوەی کە تۆ لەسەرەتاوە ئامازەت پێدا. ئەگەر قەرار بێت ئێمە هەر لەناو چوارچێوەی ئەو کۆگەلیەی کۆمەڵگا و دەزگاکانی و گوتاری سیاسی و ئایینیی دەیخەنە بەردەممان، بمێنینەوە، پێویستمان بەپەیوەندی نییە، چونکە ئێمە لەناو کۆمەڵگادا ئەرکەکان جێبەجێ دەکەین و چاوەڕوانییەکانی کۆمەڵگاش دەهێنینە دی و بەو پێیەش پاداشت و سزاکان چاوەڕێمان دەکەن. بەڵام وەختێ دەمانەوێ بچینە ناو پەیوەندییەوە، بێگومان دەمانەوێ خۆمان بین و هەنگاوێك لەو چوارچێوەیەی کۆمەڵگا بۆی کێشاوین، خۆمان بدزینەوە. کەواتە ئەوە کۆمەڵگا نییە کە هەلی دروستکردنی پەیوەندیمان بۆ دەڕەخسێنێ، چونکە کۆمەڵگا لەناو سیستەمەکانی دەسەڵاتی خۆیدا (جێگیرمان) دەکات، بەڵکو ئەوە هوشیاریی خۆمانە کە دنەمان دەدات بۆ سازدانی پەیوەندی. هەر بۆ نمونە: کۆمەڵگا لە سیستەمی خێزاندا وەك (ژن) و وەك (مێرد) جێگیرمان دەکات، بەڵام ئەمە بەمانای ئەوە نییە ئێمە نەتوانین لەگەڵ هاوسەرەکەماندا پەیوەندییەکی تایبەت دروستبکەین. هەروەها سیستەمی پەروەردە وەك (قوتابی) و (مامۆستا) پێناسەمان دەکات، وەلێ ئەمە بەمانای ئەوە نیە نەتوانین لەو پێناسەیە دەربچین و توانامان نەبێ پەیوەندییەکی تر لەگەڵ یەکدیدا دروستبکەین کە تیایدا مانایەك بۆ قوتابیبوون و مامۆستایەتی و ژنبوون و مێردبوون نەمابێت.

*** بەڵام تا چەندە دەرچوون لەو پێناسەیە گرنگە و بۆچی؟**

ـ بێگومان دەرچوون لەو پێناسەیەی کۆمەڵگا ئێمەی تێدا جێگیر دەکات گرنگە بۆ بەخودبوونی ئێمە، بۆ سەربەخۆبوون و لەهەموویشی گرنگتر بۆ بەختەوەربوونمان. مانەوە لەناو پێناسەی سیستەمەکاندا ئەو مەترسییەی بەدواوەیە کە ئێمە یەکتر بدۆڕێنین و شتی هاوبەش لەنێوانماندا نەمێنێت. بۆی هەیە هەتا دەمرین لەناو دامەزراوەی خێزاندا وەك ژن و مێرد بمێنینەوە بەبێ ئەوەی بەختەوەر بین و بەمەش کۆمەڵگا لەخۆمان نەتۆرێنین. بۆی هەیە هەتا خانەنشین دەکرێین و دەمرین مووچەی پیشەکەمان وەربگرین و سیستەمی پەروەردە لەخۆمان ڕازیی بکەین، وەلێ ئایا ئەوە بەختەوەریمان بۆ دەستەبەر دەکات؟ بەبڕوای من و بە وردبوونەوەمان لە

بارودۆخەکان، وەڵامی ئەم پرسیارە: نەخێرە. کەواتە پێویستە لەودیو پێناسە ڕەسمییەکانەوە پەیوەندییش لەگەڵ کەسەکاندا دروستبکەین تا یەکتری و بەختەوەریمان نەدۆڕێنین. ئەمەش لەبەرئەوەی لە پێناسە ڕەسمییەکاندا زۆرجار کەسایەتی و سەربەخۆیی و گەورەیی ئینسانیانەی ئێمە پێشێل دەکرێت و ئێمە لە پێناوی شتێکی تردا دەکرێینە ئامراز، نەك مەبەست. بۆ نمونە: لەپێناسەی ڕەسمیی کۆمەڵگادا بۆ خێزان، (خێزان) دەکرێتە ئامانج نەك ئێمە کە پێکهێنەر و بکەرانی زیندووی ناو خێزانین. واتە ئێمە دەکرێینە ئامرازێك بۆ بەردەوامبوونی یەکەیەکی کۆمەڵایەتی و هەندێ ئەرکمان دەدرێت بەسەردا کە دەبێت جێبەجێیان بکەین. بۆیە گرنگە دواجار ژن و مێردێك لەودیو ئەو چوارچێوەیەوە کە کۆمەڵگا بۆ خێزانی داناوە، پەیوەندییەکیش لەگەڵ یەکتردا دروستبکەن و بەختەوەریی خۆیان بکەنە ئامانج نەك ڕازییکردنی کۆمەڵگا بەو پێکەوەبوونەیان، کە بۆی هەیە لەناو دامەزراوەکەدا بووبێتە پێکەوەبوونێکی دۆزەخیانە. ئەسڵەن بەلای منەوە دەربازبوون لەو پێناسانەی دامەزراوە سەرجەمگیرەکان (*total institution*) ی وەك ئیدارەی سیاسی، کایەی پەروەردە، دەزگا ئایینییەکان و کۆمەڵایەتییەکان بەسەرماندا دەیسەپێنن، بەشێکە لە خەباتی مرۆڤی هاوچەرخی ئێمە لە دژی دەسەڵاتی نەرێت و دەسەڵاتی سیاسی و دەزگاکانی و هەوڵدانە بۆ بەدەستهێنانی ئازادی. ئازادییەك لەناو چواردیواری ماڵدا، ئەوکاتەی گڵۆپەکانمان کوژاندۆتەوە و باوەش بەیەکتردا دەکەین و یەکتر ڕادەمووسین، دەشێت بەدەستی بهێنین. ئازادییەکی خۆکرد، نەك دامەزراوکرد یان دەوڵەتکرد و سیاسیکرد. بۆیە پێویستە خۆمان لە هەموو پێناسەیەك ڕزگار بکەین کە بازرگانەکانی ئەم ئەزموونە لە ناو دامەزراوەکانی خۆیدا پێمانی دەبەخشێ تاکو بتوانین کەمێ لە پەیوەندییە تایبەتیەکانماندا ئازاد و بەختەوەر بین. بۆ نمونە: ئەم ئەزموونە بەوە چاوبەستماندەکات کە گوایە ئێمە (هاوولاتین)، (میللەتێکی بەشەرەفین) و (خاوەنی خوێنی شەهیدانین) و هتد. باشە ئەگەر وایە، کێن ئەو هەموو خەڵکە هەژارەی لە ژێر خێمەکاندا دەژین، کێن ئەوانەی ڕۆژانە لەناو دائیرەکاندا، دائیرەی پۆلیس، مروور، وەزارەتخانەکان، مدیرعاممەکان، موحەقیقە عەدلی و

خەستەخانە و تەنانەت دادگاکانیشدا، زەلیل و بێحورمەت دەکرێن و سووکایەتیان پێدەکرێت؟ ئایا ئەوانە بێگانە و دووژمنن، یان ئەخلاقی سیاسی لەم ئیدارەیەدا ئەوەندە لاوازە کە ئێرەو ئەوێ بڕ ناکات؟ بەبڕوای من ڕەخنەگرتن و خۆ ڕزگارکردن لەم ماشێنە بیرۆکراتیەتە کوردیە، قەدەری داهاتووی خەباتی هێزە گۆڕانخوازەکانی کۆمەڵگای ئێمە دەستنیشاندەکات. هەڵبەت ئەگەر ئەو هێزانە بوونیان هەبێت!

*** هەستناکەیت کەمێ ڕەشبینانە قسە دەکەیت؟***

ـ ڕەنگە وابێت، بەڵام ئەمە پەیوەندی بە جۆری بیرکردنەوەی منەوە نیە، بەڵکو پەیوەندیی هەیە بە واقیعێکی برینـدار و گەندەڵەوە کە بۆ ئینسانیەتی ئێمە بۆتە دۆزەخێکی ناسنین.. وێڕای ئەوەش پێویستە ئێمە وەك گرامشی گوتویەتی، بڕوامان بە بەدبینی ڕۆشنبیرانە و گەشبینی ئیرادە هەبێت. دیاردە و بارودۆخەکان وەکئەوەی دەیانبینین و ئازارمان دەدەن وەسف بکەین، ئاماژە بە دزێوی و ناشیرینیەکان بکەین و شەرم نەکەیەن لەوەی ڕەخنەی جیدی لە خۆمان و کۆمەڵگا و کولتوور و دامەزراوەکانی بگرین.. لەهەمان کاتیشدا هەوڵی گۆڕینیان بدەین و ئیرادەمان بەوە هەبێت، کە دەشێت گۆڕان دروست ببێ.

{پەیوەندی و متمانە چی پێکەوە دەیانبەستێتەوە؟ بۆچی کۆمەڵگای کوردی ڕێگر لەبەردەم کوڕ و کچاندا دروستدەکات و ناهێڵێ متمانەیان لەلا دروستببێت؟ بەر لە خۆشەویستی: حەزلێکردن. ئایا هەموو کەسێ لە حەزلێکردنەوە دەتوانێ بە خۆشەویستی بگات؟ خۆشەویستی وەك پەیوەندییەکی ئازاد.}

## قەیرانەکانی پەیوەندی

***** *ئێستا دوای ئەوەی هەندێ خاڵتان بەگشتی لەسەر دیاردەی پەیوەندی ڕوونکردەوە، پێمخۆشە زیاتر قسە لەسەر پەیوەندییەکی تایبەتیش بکەین، کە ئەویش پەیوەندیی کوڕ و کچانە. هۆکاری نەبوونی ئەو «متمانە»یە چییە کە لەنێوان کوڕ و کچدا هەیە و وایان لێدەکات بەر لەدەستپێکردنی پەیوەندی خۆشەویستی بیر لەوە بکەنەوە یەکێکیان قۆڵی یەکێکی تریان نەبڕێ. واتە دەمەوێ باس لە هۆکاری ئەو بەدگومانیەم بۆ بکەیت کە لەپێش دەستپێکردنی پەیوەندییەکەیانەوە بەرامبەر یەکتری هەیانە؟*

- ئەمە پرسیارێکی گرنگە و بەرلەوەی باس لە هۆکارەکانی ئەو بەدگومانیە بکەین، پێمخۆشە بەکورتی قسان لەسەر ئەو داوە باریکە بکەم کە (متمانە) و (پەیوەندی) پێکەوە دەبەستێتەوە و تۆش بەجوانی تەعبیرت لێکرد. کۆمەڵناسانی وەك (نیکلاس لۆمان و ئەنتۆنی گیدنز و ئولریش بێك) بایەخێکی زۆریان بە چەمکی متمانە داوە و دەتوانم بڵێم: متمانە بەتایبەتی بابەتێکی گرنگی سۆسیۆلۆژیای هاوچەرخە. لە کۆی

ئـەو پێناسـانەوە کـە بـۆ چـەمکی متمانـە کـراون، دەتـوانین ئـەوە هـەڵهێنجین کـە پەیوەنـدی و متمانـە دوو ڕووی یـەك بابـەتن و قـسەکردن لەسـەر پەیوەنـدیی بـەبێ قسەکردن لەبارەی ڕۆڵی متمانە لە پەیوەندیدا مانایـەکی نابێت. بۆیـە ئەگـەر متمانـە بمانباتەوە بۆ دڵنیابوون لە جۆر و چۆنێتی و خەسڵەتی کەس و شتێ، یـان دڵنیـابوون لە ڕاستیی گوتە و پەیمانێك، ئەوە پەیوەندی دەرهاویشتەی متمانەیە. یان وەك گیدنز دەڵێ: «متمانە جۆرێکی تایبەتە لە دڵنیایی» و ئەمـەش ئـەو شـتەیە کـە سـەرکەوتنی هـەر پەیوەندییـەك دەسـتەبەر دەکـات. مـادام ئێمـە لەسـەرەتاوە مـەرجی هـەر پەیوەندییەکمان بـە ئامـادەیی دوو لایـەنی سـەربەخۆ دانـا، ئـەوە پێویـستە ئـەو دوو لایەنە کاربکەن بۆ وەدیهێنانی متمانە لەلای یەکتر و بۆ ئەمەش واچاکە هەریەکەیان لە ئاست ئەویتردا خۆی لە بەدگومانی و حوکمی پێشینە ڕزگار بکـات و لێـی دڵنیـا بێـت. چونکە پەیوەندیی دروستنابێت ئەگەر هاتوو لایەنەکان لـە بەرامبـەر یـەکتردا کـراوە و دڵفراوان نەبوون و وەڵامگۆی چاوەڕوانییەکانی یەکتر نەبوون. بوونی بـەدگومانی هـەر تەنیا ڕێگر نیە لەبەردەم پەیوەندیدا، بەڵکو نیشانەی نـەبوونی خـودێکی سـەربەخۆ و بڕوا بەخۆبوویشە. چـونکە تـەنیا کەسـێك دەتوانـێ بچێتە نـاو پەیوەندییەکـەوە کـە لـەخۆی دڵنیابـێ و لـەخۆی تێگەیـشتبێت و ئامـادەش بێـت بـۆ قـەبووڵکردنی لایـەنی بەرامبەر. پێشتر لە وتاری (دیموکراتیزەکردنی خود)دا نوسـیومە: (مرۆڤـی بـەدگومان مرۆڤێکـە بـێ خـود، هەربۆیەشـە مرۆڤێکـە ناتوانێـت پەیوەنـدیی لەگـەڵ مرۆڤـەکانی دیکەشدا ببەستێت، چونکە پەیوەندیی و ئاڵوگۆڕ تەنیا لە نێوان خودە سەربەخۆکاندا دروستدەبێت). هەڵبەت لێرەدا پـتر بـیر لـە پەیوەندییـەکی تەندروسـتانە دەکەمـەوە، نەك پێکەوەبوونە دووبارەو ناچارییەکان.

لە کۆمەڵگای ئێمەدا و لە پەیوەندیی بە پرسیارەکەتەوە، لـە ڕێگرێك زیـاتر هەیـە کـە ناهێڵێت لە نێوان کـوڕ و کـچدا متمانـە دروسـتببێت، بـەم پێیـەش دەتـوانین بـاس لـە *فرەڕێگری* لەبەردەم نەبوونی متمانەدا بکەین. هەنـدێك لـەو ڕێگرانـە پەیوەندییان بـە سرووشت و میزاجی تاکەکەسیانەی کوڕ یـان کـچەوە نییـە، بـەڵکو پەیوەنـدییان بـەو بازنە سرووشتی و سیاسی و کولتوورییەوە هەیە کە ئەم دوو تاکە وەك نێر و مێ، یان

وەکو کچ و کوڕ تیایدا پەروەردە بوون و کۆنەستی ئەوانی داگیرکردووە. هەروەها کۆمەڵگای ئێمە یەکێکە لەو کۆمەڵگایانەی بێمتمانەیی بەشێکی پێکهێنەرە لە بونیادی کولتووری و سیاسیدا، مێژووی نوێ و هاوچەرخی ئێمە لەسەر بێمتمانەیی بە داهاتووی خۆی و بە هێزە بکەرەکانی ناوی دروستبووە. مێژووی سیاسیی ئێمە پڕە لە نمونەی هەستنەکردن بە دڵنیایی و سەقامگیریی و بیرکردنەوە لەو مەترسییانەی کە دراوسێ و داگیرکەر و ئەوانیتر بەسەرمان دەهێنن. لەم ڕووەوە گەشتنامەکەی (مستەر ریچ) لە ١٨٢٠ بۆ شاری سلێمانی چەندین نمونەمان لە زمانی خەڵك و میرەکانی ئەوساوە بۆ باسدەکات کە بێ متمانەیی ئەوان بە داهاتووی خۆیان دەسەلمێنن و ئەمەش وایلێکردوون تەنانەت دەستەوەستان بن لە ئاست چاککردنەوەی خانووەکانیاندا، چونکە ئەوان خۆیان بۆ ئاوارەبوون و شارویرانی ئامادەکردووە نەك بۆ حەوانەوەی یەکجارەکی لە ماڵی خۆیاندا! شۆڕشەکانی کورد چەندە سووربوونی ئەم میللەتەیان لەسەر خواستەکانی خۆی سەلماندووە، ئەوەندەش بە تێکشکانیان نائومیدی و دوودڵی و بێ متمانەییان کردۆتە بەشێك لە پێکهاتەی کەسایەتی ئەم مرۆڤە. لە مێژووی نزیکی کۆمەڵایەتیشماندا، دەنگوباسی ڕاگواستنی زۆرەملەی گوندەکان لەلایەن بەعسیەکانەوە بەس بوو تا ژیان بوەستێنێ و جوتیار و کاسبکار و خاوەن زەویەکان پێش چەند ساڵێکی ڕووداوەکەش دەستیان نەچێتە هیچ کارێ و بگرە لەو ماوەیەدا ژن و ژنخوازییش کەم ببێتەوە. هەتا ڕووخانیی یەکجارەکیی دیکتاتۆریەت، ترسێك هەبوو لەگەڕانەوەی بەعس و پێموایە هەتا سەدام حسێنیش وەك ڕەمزی تۆقین لە زەینی ئێمەدا ببمێنێ، ئەو ترسەش هەر دەبێت. ئەمە جگە لە ترسی بەردەوام لە ژیلەمۆی شەڕە ناوخۆییەکان کە زۆرجار بە ئاشتبوونەوەکانیش ئەو ترس و نادڵنیاییە ناڕەوێتەوە و متمانە بەئاسانی دروستنابێتەوە.

بەر لەهەموو ئەمانەش فەزای خێزانی کوردیمان لەبیر نەچێت کە تیایدا چەندین جۆری سزادان پراکتیزە دەکرێن. ئێمە هەموومان لەو خێزانانەوە هاتووین کە بڕوایان بە منداڵ داغکردن و خەتەنەکردن هەیە و هەڕەشەی وەك: (هەردوو چاوت دەردەهێنم،

گوێچکەت دەبڕم و دەتدەم بە گورگەکان بتخۆن) لەو شتە هەرە ئاساییانەن کە منداڵ بەرگوێی دەکەون. زۆربەی ئەوانەمان کە بڕێ نەوسن بووین و لە شیرخواردن تێرمان نەخواردووە، یان ئەوەتا پەنامان بۆ شیری ئافرەتێکی تر بردووە و بەمەش لەگەڵ کچ و کوڕەکانیدا بووینە (خوشك و برای شیریی) و ئیتر لە دوارِۆژدا بۆمان نەبووە وەك خۆشەویست بیریان لێبکەینەوە، یان ئەوەتا پەلاماری سنگی داچەقاوی ژنە قەرەجێکمان داوە و بەمەش بووینەتە (کوڕە قەرەچ)، یاخود ئەگەر هەر دەستمان لە نەوسنی هەڵنەگرتبێت ئەوە دایکمان لیمەندۆزی و بیبەری تیژی لەسەر گۆی مەمکییەوە هەڵسووە و وەك دوو پشك پێوەی داوین و ئەمجا دەستمان لەو مافە ئاساییەی منداڵیمان هەڵگرتووە کە مژینی ئەو میوە خوداییەیە.. ئەمە وێڕای ئەوەی هەر لەو فەزایەدا و لە تەمەنێکی زۆر زووەوە خەیاڵیان پڕکردووین لە دێو و درنج و جنۆکە و هاکا بۆمان هاتن و بردیانین. من لە دانمارك و دوای تەمەنێکی زۆریش، هێشتا لەو دێوە سەگبابانە دەترسام کە کاتی خۆی لە گوندەکەمان خرابوونە ناو سەرمەوە و قەراربوو ئەگەر عاقڵ نەبام، بمخۆن..

بێگومان هەموو ئەمانە ڕەنگدانەوەی خۆیان هەبووە لە پێکهاتەی کەسایەتی کوردیدا و لە تێڕوانینی بۆ جیهان و کات و بوونی خۆی و لە مامەڵەکردنیدا لەگەڵ شوێن. لەئاساییترین دۆخدا ئەم ڕەفتارانە هەستێکی توندڕەوانەیان تێدا دروستکردووین، بروابەخۆبوونیان لێسەندوینەتەوە و ئەوەیان تێدا چاندووین کە هەردەم وا بزانین ئێمە باش نین، دەست دەنرێت بە ڕوومانەوە، ئەوانیتر خۆشیان ناوێین و لە خۆیانمان دوور دەخەنەوە. یاخود ساردییەکیان تێدا دروستکردووین بۆتە هۆی کوشتنی هەستی پێویستیبوون و پەیوەندیبەستنمان لەگەڵ کەسانی تردا.

**** ئەم قسانە دەستنیشانکردنی گرنگن، بەڵام هەستناکەیت نەبوونی متمانە لە نێوان کچان و کوڕاندا هۆکاری تری هەبێ کە زیاتر پەیوەندییان بە ئێستای دۆخی کۆمەڵگای ئێمەوە هەبێت..؟***

ـ بێگومان.. یەکێك لەو هۆکارانە ئەوەیە کۆمەڵگای ئێمە بەشێوەیەك لەشێوەکان خۆی بەخاوەنی هەموو ئەندامەکانی دەزانێ و پەیوەندیی ئەم کۆمەڵگایە

بەئەندامەکانی خۆیەوە پەیوەندییەکی خاوەندارانەیە. پەیوەندییەکە تیایدا کۆمەڵێك یاسا و ڕێسا، کۆمەڵێك نەریت یا ئەوەی کەپێی دەوترێ «بڕیارە پێشینەکان» و ئێمە نازانین لەکوێدا نووسراون، لەکوێدا تۆمار کراون، لە چ کونێکەوە دێنەدەر و لە هەموو شوێنێکدا ئامادەن و بەدەگمەن و زۆر هێواش گۆڕانیان بەسەردا دێت، دەسەڵاتیان هەیە. ئەم فاکتەرانە بەبێ ویست و ئیرادەی مرۆڤ بڕیار دەدەن تا ئەم تاکەکەسەی کە ناوی «کوڕ» یان «کچ»ـە پێویستە لە ژیانی عەمەلیدا چۆن بێت و بەردەوامیش هەستبکات ئەو گرێدراوە بە شتێکی ترەوە کە لە خۆی گەورەترە. واتە پەیوەندی ڕەگەزی نێر و مێ لە ژیانی کۆمەڵایەتیانەی خۆیاندا بەو فاکتەرە بڕیاردەرانەوە، هێندەی ئەوەی پەیوەندییەکی یەکسان بێت، زیاتر گیرۆدەبوونێکە و دۆخێکی ملکەچانەیە لەبەرامبەر دەسەڵاتێکی هەمیشە ئامادەدا. دەسەڵاتێ کە بەرجەستەبوونێکی ماتەریالیانەی نییە، بەڵام دەزانین کۆمەڵگا ئەوەندە بەپیرۆزیکردووە کە هەرجۆرە خۆ لێدزینەوەیەکی بە سەرپێچی و گوناهێك دەژمێردرێت. ژیان لەناو بازنەی ئەم دەسەڵاتە نادیار و هەردەم ئامادەیەدا بۆخۆی لەهەمان کاتیشدا دەستنیشانی جۆری پەیوەندی کوڕ و کچ دەکات و هەموو خەونبینینێکی تاکەکەسیانە دەچەپێنێت، ئەمەش بە ئەندازەیەك کە گەنجەکان (کچبوون) و (کوڕبوون)ی خۆیان بیر دەچێتەوە و دەبنە کائینی بێ ڕەگەز و بێ ناسنامەی جنسیی خۆیان. ڕەنگە ئەمە لە ئێستادا گەورەترین ستەمی کۆمەڵگا بێت لە تاکەکانی خۆی و ڕێگر بێت لەبەر دەم دروستبوونی هاووڵاتیدا، چونکە مرۆڤ تەنیا ئەوکاتە دەتوانێت ببێتە هاووڵاتی کە خاوەنی سەربەخۆیی و ئازادیی شەخسیی خۆی بێت و لەژێر زەبری فەرمانە سەپێنراوەکاندا نەخەسێنرابێت. لەڕاستیدا مرۆڤ بەبێ ناسنامەی جنسی ناتوانێت ببێتە هاووڵاتی، چونکە یەکێك لە بنەماکانی هاووڵاتیبوون داننانە بە ناسنامەی ڕەگەزی ئەو مرۆڤەدا وەك بکەرێکی نێر یان مێ. ئەم پەیوەندییە خاوەندارانەیەی کۆمەڵگا بەتاکەکانی خۆیەوە، جگە لەوەی لەخێزاندا بۆتە هۆی ئەوەی کە باوك خۆی بەخاوەنی منداڵەکانی بزانێ و حەقیقەتی خۆی وەك حەقیقەتی ئەوان ببینێ و نوێنەرایەتیان بکا، ئەوە لە سیستەمی پەروەردە و لەقوتابخانەشدا

ڕەنگیداوەتەوە و درێژە بە مانەوەی خۆی دەدات و بۆتە پەیوەندییەکی بەدەزگایی بوو. واتە مامۆستاش بەمانایەك لەماناکان جێگای باوکێك دەگرێتەوە کە حەقیقەتی قوتابییەکانی وەك حەقیقەتی خۆی دەبینێ. لە زۆربەی دۆخەکاندا دەگمەنن ئەو مامۆستایانەی کەنەیانەوێ باوکێکی ناو خێزان بن لەناو پۆلدا و ئەمەش کێشەیەکی گەورەی بۆ پەیوەندییەکانی ئێمە دروستکردووە و ڕێگرە لەبەردەم دروستبوونی متمانە لەناو گەنجەکاندا.

***مەبەستت ئەوەیە بۆ نموونە وەستانی مامۆستا لەناو پۆلدا وێنەیەکە لەڕووی حاڵەتی دەروونییەوە کۆمەڵێك کاریگەریی خۆی دەبێت بۆ گواستنەوەی وێنەی باوك بۆ ناو پۆل؟**

ـ بەڵێ، مەبەستم ئەو دەسەڵاتەیە کە نایەوێت ڕەمزییەتی خۆی لەناو کایە جیاوازەکاندا ونبکات و بەردەوام خۆی بەرهەمدەهێنێتەوە. وەرە با هەمان وێنە بگوێزینەوە بۆ وێنەی ڕۆشنبیرێك کە کۆڕ دەگێڕێت و دوو کاتژمێر خەڵك بێ دەنگ دەکا و هەمان دەسەڵات لە کایەی ڕۆشنبیریدا دووبارە دەکاتەوە. ئەمە هەمان وێنەیە کە مەلایەکیش لەمزگەوت و کایەی ئاییندا و بەهۆی وتاربێژییەوە دروستیدەکاتەوە و هەمان وێنەیشە کە سەرکردەیەکی سیاسی لە کایەی سیاسیدا بەرهەمی دەهێنێتەوە. ئەنجامی دروستکردنەوەی ئەم وێنەیە بریتیە لە دروستکردنی «زۆربەیەکی بێدەنگ» لەبەرامبەر قسەکەرێکی تاکدا و ڕەوایەتیدان بە هەرەمیەتی دەسەڵات کە لەسەرەوەی هەرەمەکەدا ئەو تاکە قسەکەرە وەستاوە و دەنگی ئەو، دەسەڵاتی ئەوە. ئەمە جگەلەوەی ئەو پەیوەندیە هاوپەیمانەتییەکی ناوخۆیی لە نێوان قوتبەکانی دەسەڵاتی هەر کایەیەکدا وەدی دەهێنێ. واتە بە «سیلەی ڕەحم» باوك دەبەستێ بە مامۆستاوە، مامۆستا دەبەستێ بە مەلاوە، مەلا دەبەستێ بەڕۆشنبیرەوە و ڕۆشنبیر و ئەوانیتریش دەبەستێ بەسیاسیەوە. ئەم بازنەیە چەندە ڕەمزەکانی دەسەڵات پیرۆز دەکات و هێزیان پێدەبەخشێت، ئەوەندەش زیاتر تاکەکەس سەرکوت دەکات و بواری بۆ ناهێڵێتەوە بیر لەتاکبوونی خۆی بکاتەوە وەك هەنگاوێك بۆ متمانە بە خۆ بوون و سڕینەوەی بەدگومانییەکانی لە ئاست ئەوانیتردا. تۆ لەبیرت نەچێ کە

کردەیەکی وەك پێکەنینەکانیشمان دەکەونە بەر هەڵسەنگاندن و ئێمە بۆمان نییە لەهەر کوێدا و بەهەر بۆنەیەکەوە پێبکەنین و بگرە دەبێت بشزانین کۆمەڵگا چ جۆرە پێکەنینێکمان لێ قەبووڵ دەکا. واتە دەبێت نییەتی پێکەنینەکانیشمان بۆ دەسەڵاتە ڕەمزییەکانی کۆمەڵگا ڕوونبێت! لێرەوە دەمەوێت ئەوەت پێبڵێم: کە بازنەی دەسەڵاتی باوکە جیاوازەکان بەسەر تاکەکەسدا، بازنەیەکە زیاتر لەوەی متمانە دروستبکات بەدگومانی و ترس بەرهەمدەهێنێت و ئەمەش دەبێتە ڕێگر لەبەردەم ئەوەی تاکەکەس بتوانێ خۆی بێت. بۆیە ڕیگرەکان لەبەردەم بەخودبوونی تاکەکەسدا خۆبەخۆ دەبنە ڕێگریش لەبەردەم دروستبوونی پەیوەندییەکی متمانەدارانەدا، تەنانەت ئەگەر ئەو پەیوەندییە خۆشەویستیی نێوان کچ و کوڕیش بێت. ئەمەش لەبەرئەوەی ئەو پەیوەندیە، بەرلەوەی لە چاوی دوو کەسی سەربەخۆی خاوەن ئیرادەوە ببینرێ کە یەکتریان خۆشدەوێ، لەچاوی گەورەی کۆمەڵگاوە تەماشای دەکرێت کە پێناسەیەکی تایبەتی بۆ پەیوەندیی خۆشەویستی هەیە.

**** لە سەرەتاوە باسی فرە ڕێگریتان لەبەردەم دروستنەبوونی متمانە لە نێوان کچ و کوڕدا کرد. حەزدەکەم لەسەر ئەوە بەردەوامبیت..***

- بەڵێ، ڕێگرێکی دیکە نەبوونی شوێن و کەشێکی ئازادی کۆمەڵایەتییە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی کەسەکان لەگەڵ یەکتردا. بۆئەوەی پەیوەندی دروست ببێت پێویستە فەزایەك هەبێ بۆ (بەرجەستەبوون)ی ئەو پەیوەندیە. پەیوەندی جگەلەوەی لە نێوان تاکەکەسەکاندا دروستدەبێت، ئەوە پێویستی بە شوێنێکیش هەیە تا تیایدا نەشونما بکات و بەدیارکەوێت. ئەو شوێنەش هەر کونجی ژوورەکان، ناو نامە نهێنی و سەرسووچی کۆڵان و نیگای خەماوی ئەودیو پەنجەرەکان نییە، بەڵکو شوێنی کارکردن و خوێندن و شوێنە گشتی و بازاڕ و مەیدان و باخچەکانیشە.. ناکرێت باس لە دروستبوونی پەیوەندی بکەین و هەموو ئەو شوێنانەمان لە کچ و کوڕەکان قەدەخە کردبێت کە پەیوەندی تیایاندا بەرجەستە دەبێت. ناکرێت باس لە پەیوەندی بکەین وەك کەشێك بۆ دروستبوونی تاکەکەس و کەچی کۆمەڵگامان لەو کەسانە کردبێتە بەندیخانە. چونکە ئێمە گوتمان پەیوەندی ئەو دۆخەیە کەتیایدا ئێمە هەم ڕووبەڕووی

خۆمان دەبینەوە و هەم رووبەرووی ئەویتر دەبینەوە، ئەم دۆخەش لەکۆمەڵگای ئێمەدا دۆخێکی یاساخە و تا ئێستاش دیتنی کچو کوڕێك پرسیاری کۆمەڵایەتیانە و ئەخلاقیانە و تایبەتیانەی خۆی لەسەرە کە بۆی هەیە کوشتن و سزای توندی بەدواوە بێت. ئەمەش بەومانایەیە کاتێ فەزایەك و شوێنێك نابێ تیایدا پەیوەندی لە رووبەرووبوونەوەدا بەرجەستە ببێ، ئەوە ئەو بەدگومانییەش نارەوێتەوە کە نەرێتە کۆمەڵایەتییەکان لەسەر پێکەوەبوونی کچو کوڕێك بەرهەمیان هێناوە و بەپێی هەمان بەدگومانیش هەموو رووبەرووبوونەوەیەکی نێوانیان بە کەوتنەوەی کارەسات و ئابڕووچوونێك تەماشا دەکرێت. تەنانەت لێخوڕی تەکسیەکانیش ئامادە نین کچ و کوڕێك پێکەوە لە دواوە سوار بکەن، چونکە ئەوان لێکدانەوەیەکی تایبەت بۆ ئەمە دەکەن و پیشەیەکیان بیردێتەوە کە لە رووی کۆمەڵایەتییەوە شوێنی سەرشۆڕییە. هەتا ئەو تێڕوانینە تەقلیدیە بۆ پێکەوەبوونی کچ و کوڕ بمێنێ ئەوە پەیوەندی بەرجەستە نابێت، بگرە (بەلادا تێپەڕین) و تەکنیکەکانی تری یەکتربینینی شاراوە پەرە دەستێنن. ئەمەش دەبێتە هۆکاری دروستبونی دوو ڕوویی، درۆکردن و شاردنەوە و نهێنیسازی لە کەسایەتی گەنجەکاندا و هانیاندەدات بۆ کردەی لادەرانە و شاردنەوەی وردەکارییەکانی ژیانی ڕۆژانەیان تا ئەوکاتەی شتەکان ئەوەندە ئاڵۆز دەبن کە ئیدی بۆ خۆیان توانای چارەسەرکردنیان نیە و ناچاریشن بەردەوامبن لە شاردنەوەی کێشەکانیان، چونکە متمانەیان بە دەوروبەری خۆیان لەدەستداوە. بەمجۆرەش ئەو شتەی کۆمەڵگا لێی دەترسێ و دەیەوێت ڕوونەدات، بە نهێنی و لە پەراوێزدا ڕوو دەدات.

ڕێگرێکی دی لەبەردەم نەبوونی متمانە لە نێوان کچ و کوڕەکاندا، تەسلیمبوونی ئەوانە بەو نیگایەی کۆمەڵگا و دەسەڵاتەکانی تەماشای گەنجەکانی پێدەکەن. کۆمەڵگای ئێمە و دایکان و باوکانی ئێمە نایانەوێت ئەو درزە قەبووڵ بکەن کە کەوتۆتە نێوان خۆیان و نەوەکانیانەوە و جیاوازیی ئەوانی لە نرخاندن و بەهاسازیدا دروستکردووە. وەك دەزانین ئەوەی پێشوو دەیەوێ نرخ و بەهاکانی خۆی بگوێزێتەوە بۆ نەوەکانی پاشتر و لەمەشدا هەموو سیستەم و دامەزراوەکان بەکار

دەهێنێت، لەکاتێکدا بەرەی نوێ بەجۆرێکی دی دەڕوانێتە ئەو بەهایانە و ژیانی هاوچەرخ و گۆڕانکارییەکان وادەخوازن بەهای تازە دروستبېن. جیاوازە بەهاکان «بگوێزینەوە» و بەسەر نەوەی نوێدا «بیانسەپێنین» لەگەڵ ئەوەی هەوڵبدەین لەو بەها نوێیانە «تێبگەین» کە نەوەی نوێ بۆ ژیانی خۆی دەیانسازێنێ و وەك سیستەمێکی خۆجیاکردنەوە بەکاریان دەهێنێت. هیچ مەرج نیە بەهای کوڕێك یان کچێك بۆ سیاسەت، بۆ هونەر، ئایین، خۆشەویستی، زانست و ئابووری و نەریتە کۆمەڵایەتییەکان و.. هەمان ئەو بەهایانە بێ کە باوك و دایکی بۆ هەمان ئەو شتانە هەیانە. ئەوکاتەی باوان دەیانەوێ منداڵەکانیان بەچاوی ئەوان شتەکان ببینن و ئەزموونەکانی خۆیان بکەنە پێوەر لە ژیانی نەوەکانیاندا، ئەوە لەبنەمادا ڕێدەگرن لەوەی منداڵەکانیان ببنە خاوەنی ئەزموونی خۆیان. بۆیە کچو کوڕەکان کەدێنە ناو پەیوەندییەکەوە یا هەوڵی دروستکردنی جۆرێك لەجۆرەکانی پەیوەندی دەدەن، بەهەموو ئەو بەدگومانیانە بارگاوی بوون کە لە ئەزموونی کەسەکانی ترەوە دروستبوون. خەیاڵی ئەوان دەبێتە (خەیاڵێکی داگیرکراو) بەو بڕیارە پێشینانەی ترنجاونەتە مێشکیانەوە. بۆیە ئەوان هەر لە بەراییەوە بەدگومانن لە ئاست ئەو کەسەی کە دەیانەوێ پەیوەندی لەگەڵدا ساز بکەن و وەك ئێوە فەرمووتان، هەر لەسەرەتاوە بیر لەوە دەکەنەوە کە یەکێکیان قۆڵی ئەویتر نەبڕێت. سەرچاوەی ئەم بیرکردنەوەیە ئەوەیە، ئەوان هەموو متمانەیەکیان وەك گەنج لێسەندراوەتەوە و تەنیا وەك ئامرازێك رووبەڕووی کەسێکیتر دەبنەوە کە بۆی هەیە مەترسیدار بێ و بەکاریان بهێنێ.

**** مەبەستت چییە لەوەی کە دەڵێت: گەنجەکان وەك (ئامراز) ڕووبەڕووی یەکتر دەبنەوە؟***

ـ بەئامرازبوونی گەنجەکان لەوەدایە کە ئەوان لەسەرەتاوە متمانەیان بەخۆیان لێسەندراوەتەوە و ئەمەش وا دەکا خۆشیان نەتوانن متمانەبەخش بن. ئەوکاتە گەنجەکان دەبنە ئامراز کە هەموو بەدگومانییەکانی کۆمەڵگا لەڕێیانەوە دەگوازرێتەوە و ئەوان نەك هەر بەچاوی خۆیان، بەڵکو بەچاوی کۆمەڵگاش دەڕواننە

کەسەکەی بەرامبەریان و لێرەشدا ئەوان خۆیان دەخەنە پەراوێزەوە، خۆیان دەسڕنەوە و چاوی خۆیان دەنوقێنن تا کۆمەڵگا لەوانەوە و لەجیاتی ئەوان ببینێ و کەسەکەی بەرامبەریان بۆ هەڵسەنگێنێ و بڕیاریان بۆ بدات. بێگومان لە هەموو کۆمەڵگایەکدا ڕاوێژکردن لەنێوان گەنجەکان و کەسە بەئەزموونەکاندا هەیە و ئێمە بەردەوام پێویستمانە بۆ بیروڕا و ئەزموونی ئەوانیتر بگەڕێینەوە، بەڵام واچاکە دوا بڕیار خۆمان بیدەین. کێشەکە سەبارەت بە گەنجەکانی وڵاتی ئێمە ئەوەیە: ئەوان ئەو ڕێگرە قەبووڵدەکەن کە کۆمەڵگا لەسەر بنەمای (بێمتمانەیی بەگەنجەکان) لەبەردەم پەیوەندییەکانیاندا قوتیدەکاتەوە. گەنجەکان لەجیاتی ڕەواجدان بە کولتووری لێبووردەیی تایبەت بە خۆیان و سەربەخۆبوونیان لە هەڵسوکەوت و هەڵسەنگاندنی واقیعبینانەیاندا بۆ کەسایەتی یەکتر، لە جیاتی سنگفراوانی و خۆکردنەوە بۆ بەرامبەرەکەیان، تەسلیم بە فەندەمەنتالیزم و کولتووری تەقلیدیانەی کۆمەڵگا دەبن و خافڵن لەوەی ئەم خۆ تەسلیمکردن و ملکەچییە ڕێگرێکی هەرە سەرەکییە لەبەردەم خۆناسی و بەخودبوونی خۆیاندا. ئەو کاتەش کە خۆناسیی نابێتە پڕۆژەیان، لە قاوغێکی بەتاڵ دەچن کە هەموو خەمێکیان دەبێتە (خەنافیزەکردن، مۆبایلیزەکردن و مەکیاژیزەکردن)ی خۆیان و ڕووخساری دەرەکییان، نەك وتووێژ و گفتوگۆ و گۆڕینەوەی بیروڕا لەگەڵ یەکتردا، چونکە ئەوان بە بیروڕا فەندەمەنتالیستیەکانی کۆمەڵگا ئاخنراون کە پڕن لە بەدگومانی و هەژارن لە متمانەدا. ئەوان هەر کە لەماڵەوە دێنە دەرێ بڕیاری پێشینەی خۆیان لەسەر یەکدی داوە و چوارساڵ پێکەوەبوونی زانکۆش ئەو بڕیارەیان پێناگۆڕێ. ئەوە ڕاستە لە ماڵەوە و لە قۆناغی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندیدا، کچ و کوڕ یەکتریان لێدەکرێتە گورگ و لەسەر میزاجی شەخسیی مامۆستای دەروون پڕگرێ پەروەردە دەکرێن، بەڵام زانکۆکان باشترین شوێنن کە ئەم دۆخەیان تیادا بەرجەستە بووە و ئەوێ ئەو شوێنەیە کە گەنجەکان وێڕای ئەوەی پێکەوە کاتێکی زۆری تیادا بەسەر دەبەن، بەڵام هەمان شوێنیشە کە بەتەواوی یەکتری تێدا وندەکەن! ئەوان نمونەی بەئامرازبوونی گەنجن لەم کۆمەڵگایەدا و من پێموایە ئەگەر لە داهاتوودا شەڕێکی

دیکەی ناوخۆیی هەڵگیرسێت یان شەپۆلێکی خۆکوشتن دەستپێبکات، ئەوە لە زانکۆوە دەبێت، ئەمەش لەبەرئەوەی ئەو هاوڕێ ئازیزانەمان ئامادەیی تەواویان هەیە بەدرێژایی هەموو ساڵەکان ڕقیان لەیەکتر ببێتەوە و دیعایە بۆ یەکتر هەڵبەستن و یەکتر نەبینن، بەڵام ئامادە نین دوو وشە لەگەڵ یەکتردا بگۆڕنەوە. فەزای هاوڕێیەتی قوتابیانی زانکۆ لەو ژووره ئینفیرادیانەی بەندیخانە دەچێت کە دوو کەس بە حەزی خۆیان و بەو پەڕی چێژەوە هەریەکەیان سووچێکی گرتووە و ناوەڕاستەکەشیان پڕە لە کێشە و وردە ناکۆکی، نەك لە کەسانی تر و هاوڕێی دیکە. ئەوان ئامادەن بەدرێژایی ساڵەکان لەو زیندانەدا بمێننەوە بەڵام بەو مەرجەی کەسیان قەبووڵی نەکات یەکێکیتر بێتە نێوانیانەوە. من بۆخۆم دەیان قوتابیم بەیەکتر ناساندووە کە سێ و چوارساڵ لەهەمان بەشدا و لە دوو هۆبەی جیاوازدا دەخوێنن بەڵام یەکتریان نەناسیوە! بێگومان لەمەشدا زانکۆ بۆخۆیشی وەك دەزگایەك ڕۆڵی گەورەی هەیە لە داماڵینی متمانە لە گەنجەکان و بەئامرازکردنیان لەبەردەم کۆمەڵێ نەریت و شێوازی مامەڵەکردندا، کە بەناوی زانستگەرایی و ئەکادیمیەتەوە دەفرۆشرێن و کەچی لە بنەمادا جگە لە فەندەمەنتالیزم و ستەمکاریی بەناوی زانست و ئەکادیمیاوە زیاتر شتێکی دی نیە.

* ***بەرلەوەی پرسیارت سەبارەت بە پەیوەندیی خۆشەویستی لێبکەم، دەمەوێ لەبارەی حەزلێکردنەوە، قسەم بۆ بکەیت. تۆ لە کۆرێکدا لە زانکۆی سلێمانی، باسی حەزلێکردنت وەك بارودۆخی پێش پەیوەندیی خۆشەویستی کرد. دەکرێ پێم بڵێی کاتێك ئێمە حەز لەیەکێکیتر دەکەین، چی ڕوودەدات و بۆچی حەزلێکردن ئەوەندە خۆشە!؟***

– زۆرم پێخۆشە کە حەزلێکردن وەك بارودۆخێك وەسف دەکەیت. بەڕاستی حەزلێکردن بارودۆخێکە نەك پەیوەندی و لەو بارودۆخەشدا مرۆڤ وا هەستدەکات لە جیهانێکی دیکەدا دەژی و بەردەوام هاوەڵی وێنەی ئەو کەسەیە کە لەسەر شاشەی ناخی خۆی حەزی لێکردووە. حەزلێکردن هەم بارودۆخێکی دەروونیی تایبەتی ژیانی تاکەکەسە لەگەڵ خۆیدا و هەم لە هەندێ کاتیشدا شێوازێکی تایبەتی لەگەڵبوون و

ئەزموونکردنی ئەویتریشە. ئەم بارودۆخە هەندێ دەروەستی و ئەرك لەسەر شانی مرۆڤ هەڵدەگرێ و کەسێ کە لەدۆخی حەزلێکردندایە هێندەی لێناگیرێ. کردەوەی شێتانە و گێلانە و شتی نائاسایی لێقەبووڵ دەکرێت و هەڵە و کەموکوڕییەکانی زۆر لەسەر حساب ناکرێن. شەرم و تەریقبوونەوە ئەو بایەخەیان نامێنێ، ئەگەرچی مرۆڤ لەبارودۆخی حەزلێکردندا ڕووبەڕووی گاڵتەپێکردن و پێڕابواردنیش دەبێتەوە، بەڵام هێندە بەقوورسی نایانگرێت و سەرخۆیان ناهێنێ.. ئەمەش لەبەرئەوەی حەزلێکردن ئەوەندە مرۆڤ بەوکەسەوە سەرقاڵدەکا کە حەزی لێیکردووە، سەر ئەوە ناپەرژێت بیر لەکەس و شتەکانیتر بکاتەوە. بەڵام بۆچی حەزلێکردن ئەوەندە خۆشە؟ ئەم پرسیارە وەك ئەوە وایە بپرسین: بۆچی قەند شیرینە و بۆچی مرۆڤ بەدار و پلە شاخان هەڵدەگەڕێ تا شانەی هەنگوین دەربهێنێ، ئەگەرچی سووریش دەزانێت گەر بکەوێتە خوارەوە دەمرێت؟ حەزلێکردن وەك ئەوە وایە بەدوای شیرینی و هەنگویندا بگەڕێین و بەبێ ئەو شیرینیە ژیان مانای نەبێت. ئەگەرچی زۆرجاران لەپێناوی مانا بەخشین بەژیان، ناچارین بەرەو مەترسیی بڕۆین و گوێ نەدەینە ئەوەی ڕیسوا و سەرگەردان ببین و گاڵتانمان پێبکرێ..

*** لەوبڕوایەدایت لە هەمووساڵەکانی تەمەندا بتوانین حەز لە کەسانێکیتر بکەین، یان حەزلێکردن تایبەتە بە قۆناغێکی تەمەن و لەناو دەچێت؟***

– پێموانییە حەزلێکردن پرۆسەیەك بێت لە هەموو ساڵەکانی تەمەندا دووبارە ببێتەوە، تەنیا مەگەر هەرگیز ڕێگەی خۆنواندنی پێنەدرێ و بواری ئەزموونکردنی بۆ هەڵنەکەوێ. لەبەر ئەوەی بارودۆخی حەزلێکردن زیاتر پابەندی جەستە و ئۆرگانەکانێتی و بزوێنەری مەیل و ئارەزووە جەستەییەکانە، ئەوە دەتوانین بڵێین زیاتر لە تەمەنی گەنجێتیدا مرۆڤ دەکەوێتە ناو ئەو بارودۆخەوە. چونکە شێوەی ئیشکردنی جەستە و ئۆرگانەکانی لە قۆناغی گەنجێتیدا چالاکانەتر کار دەکەن و دەکەونە ژێر کاریگەریی دنیای دەرەوە. لەکاتێکدا کە لە قۆناغی هەڵچووی تەمەن و پیرێتیدا، جەستە بزێوی خۆی لەدەستدەدات و ناتوانێت بەخێرایی لە ئاست کارلێکە دەرەکییەکاندا پەرچەکردار دەربڕێ. بەلایەکی دیکەدا، حەزلێکردن لەو کاتانەدا زۆر

دووباره دەبێتەوە کە نەتوانین سەرنجی بەرامبەر (یان ئەوانەی حەزیان لێدەکەین) رابکێشین و پەیوەندیی دروستبکەین و ئەمەش ببێتە هۆی ئەوەی ئەو وزەیەی کە پێویستە ئاراستەی بکەین و بەتاڵی بکەینەوە، بواری ئاراستەبوون و بەتاڵبوونەوەی بۆ نەڕەخسێ. هەروەها خۆکۆنترۆڵکردنی زۆر و سەرکوتانەوەی وزە دەروونی، جەستەیی و ئۆرگانییەکانیش بۆی هەیە ببێتە هۆی دووبارەبوونەوەی بارودۆخی حەزلێکردن و حەزلێکردنەوە. بڕوام بە لەناوچوونی بارودۆخی حەزلێکردن نییە، بەڵکو واچاکە بڵێین ئەم بارودۆخە لە میانەی تەمەنی مرۆڤدا تێپەڕ دەبێت و بەسەر دەچێ. بێگومان ئەمەش لەژێر کاریگەرییە دەرەکییەکان و لەئەنجامی هاوجووتبوونیان لەگەڵ دنیای ناوەوەمان. ئەگەر دنیای ناخی ئێمە وەڵامگۆی کاریگەرییە دەرەکییەکان بێت و دەرەوە ناوەوەمان ببزوێنێ، ئەوە چاوەڕوانیەکانمان دێنە دی و بگرە زۆرجارانیش سنووری چاوەڕوانیمان فراوانتر دەبێت. هەندێ جاریش کە دەرەوە و ناوەوە وێکنایەنەوە و ئەو وێنەیەی لەسەر کەسێك لە ناخماندایە لەگەڵ خودی کەسەکە وێکنایەتەوە، ئەو خەسڵەتانەی وامان هەستدەکرد تیایدا هەن و کەچی وا دەرناکەون، ئەوە دووچاری نائومێدی دەبین و ماوەی ئەم نائومێدییەش لەکەسێکەوە بۆ یەکێکیتر دەگۆڕێ. بۆیە حەزلێکردن بە پەیوەندییەکی نەرگسیانەی تاك بەهەستەکان و حەزەکانی خودی خۆیەوە ناو دەبەم، چونکە لە ڕاستیدا ئەو کەسەی حەز لەکەس و کەسانێکیتر دەکات، ئەو شتانە دەکاتە پێوەر کە لەناخی خۆیدا هەن و تەوزیفیان دەکات بەسەر ئەویتردا. بۆیە لە دۆخێکدا کە حەزەکانی ئێمە لەئەو کەسەدا نایەنە دی کە حەزمان لێکردووە، بارودۆخەکە تێپەڕ دەبێت و بەشێوەیەکی کاتی کۆتایی پێدێت تا کەسێکی تر دێت و حەزی خۆمانی ئاراستە دەکەین.

**** ئایا مرۆڤ ئامادەیی تێدایە هەمیشە حەز لەکەسێکی تر بکات و وەك تۆ دەڵێی: وزەی دەروونی، جەستەیی و ئۆرگانیی خۆی ئاراستەی ئەو کەسە بکات؟***

– مرۆڤ توانایەکی لە سنوور بەدەری هەیە بۆ حەزلێکردن و مەیل نواندن و سەرنجڕاکێشان، بەڵام ئەمە بەمانای ئەوە نییە دەتوانێت هەمیشە و لە گشت بارودۆخێکدا حەز لەکەسانی تر بکات. بۆ نمونە ئەوکاتانەی مرۆڤ لە پەیوەندیی

خۆشەویستیدایە و کەسێك خۆشی دەوێ، ناتوانێ هەروا بە سانایی حەز لەکەسێکی دی بکات، بەومەرجەی لەپەیوەندییەکەی ڕازی بێت لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا. ئەگەر ئەمە ڕوویدا، یان ئەوەتا بەردەوام حەز لەو کەسە دەکاتەوە کە خۆشیدەوێ، یان ئەوەتا مرۆڤێکی نەرگسییە و ئاشکرای دەکات جگە لەخۆی کەسیتری خۆشناوێ و بۆ ئەمەش هەر ڕۆژە وێنەی کەسێك لە فەنتازیای خۆیدا بەرجەستە دەکات و دالغەی پێوە لێدەدات، کە هیچ مەرج نیە ئەو کەسە لێیەوە نزیك بێت، بیناسێت و لە هەمان کۆمەڵگاشدا بێت. کەسانێك هەن حەز لە بێژەرەکانی تەلەفزیۆن، قارەمانەکانی وەرزش و گۆرانیبێژەکان و وێنەی سەر گۆڤار و ڕۆژنامەکان دەکەن و هتد.

***لە قسەکانی پێشووەوە بۆم دەرکەوت کە هەموو کەسێك بە بارودۆخی حەزلێکردندا تێپەڕ دەبێت..؟**

- زۆربەمان ئەم بارودۆخە بەشێوەیەکی سرووشتی لە تەمەنی هەرزەکاری و لاوێتیدا تاقیدەکەینەوە. بەڵام کەسانێکیش هەن لەتەمەنێکی هەڵچوودا بەم ئەزموونەدا تێپەڕ دەبن و جووتی خۆیان دەدۆزنەوە. بەمدیوی تریشدا کەسانێك پەیدا دەبن، لەبەر زۆر هۆی جیاواز، ژیانێك دەژین بەبێ ئەوەی بەو ئەزموونەدا تێپەڕ ببن و ئەمەش دەگێڕنەوە بۆ ئەو بارودۆخانەی پێیاندا تێپەڕیون و بواریان نەداونەتێ هەستەکانی خۆیان پەروەردە و بەرجەستە بکەن. حەزلێکردن و دەربڕینی هەستەکان وەك درێژکردنی دەست وایە بۆئەوەی تەوقەی لەگەڵ دەستێکی تردا پێبکەین، بەبێ ئەوەی هیچ گەرانت و دڵنیاییەك هەبێت کە ئەو دەستەی دی دێتە دەستمانەوە. بەڵام دەستدرێژکردن باشترە لەوەی لەو چێژە بێبەش بین کە حەزلێکردن دەیبەخشێ. چونکە بۆی هەیە حەزلێکردن سەرەتایەکی باش بێت بۆ چوونە ناو پەیوەندییەکی گەورەترەوە کە پەیوەندیی خۆشەویستییە.

***کەواتە با لە خۆشەویستی بدوێین. ئاخۆ بنەما چەسپیوەکانی وەك تەمەن، جوانی، سامان، خێڵ، هۆکاری سەرەکی نین بۆ تێکچوونی هەموو هاوسەنگییەکانی پەیوەندیی لەکۆمەڵگایەکی وەکئەوەی ئێمە، یان چۆن بتوانین پەیوەندییەکی مرۆیی**

***دروست بکەین و پێی بلێین خۆشەویستی ئازاد بەبێئەوەی لەسەر ئەو بنەمایانەوە دامەزرابێت؟***

- ئەم پرسیارەت زۆر پەیوەندی بەپرسیاری یەکەمەوە هەیە کەتیایدا پێناسەی پەیوەندیمان بەو جۆرە کرد، کە پەیوەندییە لە نێوان دوو مرۆڤی ئازاد، دوو لایەن، یان دوو گروپدا. ئەم پەیوەندیە بۆ ئەوەیە هەم لایەنەکان بتوانن خۆیانی تێدا دروستبکەن و هەم بشتوانن جیاوازییەکانی یەکتریش قەبووڵ بکەن. ئەو پێوانانەی تۆ ناوت بردن: تەمەن، جوانی، سامان، خێڵ، و تەنانەت هاوبالایی و هاوخەمی و هاوچینی و هاوئاینییش، هیچیان گەرانت و ڕێگە خۆشکەر نین بۆ پەیوەندییەکی سەرکەوتوو، نە لەبواری کۆمەڵایەتی و نە لەبواری خۆشەویستی و شەخسیدا. چونکە ئەگەر لە بیرت مابێ، ئێمە پێناسەی پەیوەندیمان بەو جۆرە کرد کە پەیوەندییە لە نێوان خودە سەربەخۆکاندا. بەڵام کۆمەڵگای ئێمە ڕێگرە لەبەردەم دروستبوونی خودی سەربەخۆدا و ئەمەش بە مانای ئەوەیە کۆمەڵگای ئێمە لەهەموو کایەکاندا بنەماکانی خۆی دادەڕێژێتەوەو تەئمینی بەردەوامی ئەو بنەمایانە دەکات، تەنانەت لە شەخسیترین پەیوەندیشدا. بۆ نموونە ئەوەی کە تۆ ناوت ناوە پەیوەندی هاوسەنگ، ئەم هاوسەنگییە تەنیا لە وەسفی زماندا بوونی هەیە، نەك لەناو خودی پەیوەندیەکاندا چونکە بەدەگمەن پەیوەندیمان هەیە توانیبێتی هاوسەنگییەك دروست بکات. واتە ببێتە پانتاییەك بۆ دروستکردنی خۆمان و بۆ دروستکردنی ئەویتر. ئەوەی کۆمەڵگا و یەکە کۆمەڵایەتییەکانی وەك خێڵ و خێزان ئیشی لەسەر دەکەن، دروستکردنی تۆڕێکە بۆ گیرۆدەکردنی مرۆڤەکانە بەو ئەرکانەوە کە بنەما چەسپیوەکان بەرهەم دەهێننەوە، نەك ئیشکردن بۆ دروستکردنی کەشێك کە تیایدا ئەندامان بەهۆی کارلێککردنیان بۆسەر یەکتر، خۆیان دروستبکەن. ئەوەی بەلای کۆمەڵگا، خێڵ و خێزان و یەکە کۆمەڵایەتییەکان یترەوە گرنگن مرۆڤەکان خۆیان نین، بەڵکو ئەو یاسا و پێشنووس و نەریتانەن کە وەکو کۆت و پێوەند کراونەتە ئەستۆی مرۆڤەکان تا لەژێر دەسەڵاتی خۆیاندا بیانهێڵنەوە. بۆیە بەشێکی زۆری ئەو بنەما چەسپیوانەی تۆ دەفەرمووی، هاوسەنگیی تێکدەدەن و دەبنە ڕێگرێکی سەرەکی

لەبەردەم دروست بوونی ئەو پەیوەندییەدا کەئێمە پێشتر بە پەیوەندییەکی تەندروستانە و عەقڵانیانە ناومان برد.

*** بەڵام چۆن پەیوەندییەکی مرۆیی دروست بکەین‌و پێی بڵێین خۆشەویستی ئازاد؟**

– بەبڕوای من ئەمە بەر لەوەی پرۆسەیەکی کۆمەڵایەتی بەرفراوان بێت پرۆسەیەکی تاکە کەسیانەیە و پێویستی بە ئامادەیی تاك هەیە لەو پەیوەندیەدا وەك بکەرێکی کارا و خاوەن ئیرادە.. من پێموایە ئەوە تاکەکەسە خاوەن ئیرادەکانن کە دەتوانن نموونەی ئەو پەیوەندیەمان لەلا بخەملێنن‌و بەرجەستەی بکەن، کەئەمەش پێویستی بە ریسك و موجازەفەکردن و چاوپۆشیکردنە لە مەترسی و حەیاچوون و ریسوا بوون. بێگومان ئەمەش لە کۆمەڵگای ئێمەدا کە ئەوەندە گرنگیی دەدات بەوەی نابێت ئابڕوومان بچێ و ریسوا ببین، شتێکی زۆر زەحمەتە. بەڵام هەروەختێ ئێمە موخاتەرە و ریسك بکەین لەناو کۆمەڵگادا توانیویشمانە دەرگایەکیتر لەسەر ژیان بکەینەوە، یان لە دەروازەیەکی ترەوە، لەدەرگایەکی دیکەوە بچینە ناو ژیانێکەوە کە کەمتر پابەندە بەڕەچاوکردنی نەریتەکانی کۆمەڵگا. ئەگەر ئێمە بەو جۆرە باس لە پەیوەندیی بکەین کە پەیوەندیی ئازادی دوو مرۆڤی کامڵە بەیەکترەوە، من پێموایە ئیتر مەسەلەی تەمەن، سامان و پابەندبوون بە خێڵ و پێگە کۆمەڵایەتییەکانەوە هیچ بایەخێکیان نامێنێ و خودی مرۆڤ دەسەڵات وەردەگرێت. چونکە خود وەختێك خودێکی کامڵە کە لەودیو هەموو ئەو ئینتیما شکڵییە بۆماوەییانەوە دروست بووە و ئەم خودە خۆی هەڵگری ئەو خەسڵەتانەیە کە مانەوەی پەیوەندیەکە دەستەبەر دەکا. بەڵام وەختێك ئێمە پرۆسەیەکی مەعریفی و کۆمەڵایەتی و سیاسیی بەرفراوانمان نەبێت بۆ قسەکردن لەسەر خود و دروستکردنی خود و بەخود بوونی مرۆڤ، ئەوە خۆشەویستی ئازاد جگە لە درووشمێکی رۆشنبیرانە زیاتر نیە. لە ئێستادا دەبێ ئێمە زیاتر تەماشای ئەو نموونە دەگمەنانە بکەین کە بە موخاتەرەکردن بەژیانی خۆیان هەتا سنووری ریسوابوون و خۆ بەکوشتدان بتوانن نموونەیەکی وامان پێشکەش بکەن کەنموونەی پەیوەندییەکی ئازادە و نموونەی پەیوەندییەکە ئەشێ ببێ بەئایدیاڵێك، بە مۆدێلێك لەبەردەم هەموو تاکەکانی تری

کۆمەڵگادا. ڕاستە کۆمەڵگا ڕێز لەو کەسانە ناگرێت کە یاساکانی تێکدەشکێنن، وەلێ ئەوەشمان بیر نەچێت کاتێ دەبیستین دوو دڵخواز تائەو شوێنەی ڕیسوا دەبن و خۆیان دەکوژن، هەم جێی گاڵتە پێکردن و هەم لەناخیشەوە ڕێزیان لێدەگرین، چونکە ئەوان بە گیان و کەسایەتی خۆیان لە پێناوی خۆشەویستیدا ژیاون و مردوون.

**** ئەگەر دەرکەوتنی ئەو پەیوەندییە ئازادانەیە پەیوەست بێت بە سەرهەڵدانی تاکەکەسی خاوەن ئیرادەوە کە هیچ ئیلتیزامێکی نەبێت بە نەریت و یاسا کۆمەڵایەتییەکانەوە و ڕیسک بکات، ئەی ئیلتیزام لەو خۆشەویستییە دا چ ڕۆڵێکی هەیە؟***

– کاتێك من دەڵێم مرۆڤی ئێمە بۆ ئەوەی پەیوەندییەکی ئازادی هەبێ پێویستە ڕیسك بکات، بەمانای ئەوەنییە ئەم مرۆڤە هیچ جۆرە ئیلتیزامێکی نەبێ. چونکە دواجار لە هەموو پەیوەندییەکی ئازادانەشدا کەدوو جەمسەرەکەی بریتین لەخودی کاملی دوو مرۆڤ، ئیلتیزامێکیش هەیە بەژیانێکی هاوبەشەوە و ئێمە لەهەموو شتەکانیش خۆمان ڕزگار بکەین ناتوانین لە پابەندبوون بەرامبەر بەئینسانەکەی تر خۆمان ڕزگار بکەین. بۆیە چوونە ناو پەیوەندی خۆشەویستییەوە جۆرێکیشە لە دەروەستی بەرامبەر بەو مرۆڤەی تر. پەیوەندی ئازادانە وەها تێنەگەین کە بێدەروەستیبوونە بەرامبەر بە مرۆڤەکەی تر، بەڵکو پەیوەندی ئازاد لەوێدا ئازاد و پڕ بەهایە کە ئێمە لەسەددا سەد و تەنها بەهۆی بڕوا و قەناعەتی خۆمانەوە، دەتوانین ئیلتیزام بکەین بەو وادە و پەیمانانەی وەك تاکەکەسێك دەیبەخشین بەکەسێکی دیکە. بەڵام چۆن دەتوانین وادە و پەیمان بەکەسێکی تر ببەخشین، ئەگەر لەئاست خودی خۆماندا دەروەست نەبین؟ مرۆڤ کاتێك ڕوو دەکاتە ئەویتر و پێیدەڵێت: (خۆشم دەوێی..) جگەلەوەی گوتویەتی (خودی خۆشم لەلا خۆشەویستە)، دەشڵێت: پابەندبوونی من بە تۆوە لە پابەندبوونمەیەوە بە خودی خۆمەوە. خۆشمدەوێی، واتە لە مندا پانتاییەکی فراوان هەیە بۆ بوونی تۆ لەناویدا، واتە خودی من ئامادەیە بۆ قەبووڵکردنی تۆ و کراوەیە لە ئاست ئامادەیی تۆدا. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە خودی من دەیەوێت ئەو سنوورە فراوانتر بکات، کە ژیانی تاکەکەسی بۆی

دەستنیشانکردووە و تیایدا (من) کەوتۆتە سەنتەرەوە. گوزارەی **خۆشمەدوویی**، بەرجەستەکەری ئیرادەی خودە کە چیدی نایەوێت (من) لەناویدا سەنتەر بێت و گەرەکیەتی (ئێمە) بکاتە سەنتەر. بەم مانایەش هەر کاتێك دوو کەس وادەی خۆشەویستی بەیەکتر دەبەخشن، ئاسۆی ژیان و بوون بەرفراوانتر دەبێت و ئیلتیزامی مرۆڤ لە ئیلتیزامی تاکەکەسێکەوە دەگۆڕێ بە دەروەستییەکی کۆمەڵایەتیانەی ئەوتۆ، کە تیایدا ماف و ئەرك لەگۆڕێ نییە، هێندەی ئەوەی بەخشینی خۆشەویستی لە ئازادایە بەبێ چاوەڕوانیکردنی هیچ پاداشتێك لە بەرامبەرەکەت.

**تەوەری سێیەم**

{لە سێکسکردنەوە بۆ پۆرنۆگرافی و خیلاعییەت، لە ئیرۆتیکاوە بۆ خۆشەویستی و ئەویتریستن. ئایا کۆمەڵگای ئێمە سێکسی قەدەغەکردووە، یان ئیرۆتیکا؟ هۆکارەکانی بەهێزبوونی سێکسیزم چین؟ نێرسالاری و سێکساندنی پەیوەندییەکان. خۆشەویستی وەك وزەیەکی مرۆیی دەمێنێ، وەلێ وەك پەیوەندییەکی نێوان مرۆیی ئاوا دەبێ.}

## سێکس و ئیرۆتیکا

***ئێستا با بچینە سەر بابەتێکی تر: دەمەوێ سەبارەت بەو قسانەی تا ئێستا کردمانن پرسیارێکت لەسەر سێکس لێبکەم: ئایا سێکس وەك ڕەهەندێکی حەرامکراوی ناو مێژووی ئێمە هەمیشە ئەو گوناهە نەبووە کە بۆتە هۆی تێکدانی هەموو پەیوەندییە جوانەکان؟ یان باشترە بڵێین: بۆچی مومارەسەکردنی سێکس، زۆر جار وەك چەکێك بۆ شەرمەزارکردن و ڕووڕەشکردنی ئەویتر (الاخر) بەکار دەهێنرێت؟***

- جارێ با ئەوە بڵێم کە ئەوەی لە مێژووی ئێمەدا حەرامکراوە، ئیرۆتیکایە نەك سێکس. بۆیە پێموایە کاتێ ئێمە وشەی (سێکس) بەکار دەهێنین دیسان بەمانایەك لەماناکان بە زمانی لە کۆمەڵگایەکی تەقلیدی قساندەکەین، کە بێگومان لەجیاتی باس لە ئیرۆتیکا بکات باس لەسێکس دەکات و مەبەستیشی پۆرنۆگرافیایە. تا ئەوکاتەی ئێمە باس لەسێکس دەکەین باس لەسیستەمێکی فیکری دەکەین کە تێڕوانینی بۆ ئافرەت، بۆ مێینە تێڕوانینێکی جەستەیی ڕووت و مەسرەفگەرایانەیە.

لەم تێڕوانینەوە، ئافرەت وەك شتێ لەوێدایە تا منی نێرینە بۆ دامرکاندنەوەی خرۆشانی جنسیی خۆم سێکسی لەگەڵدا بکەم. واتە بیکەم بە موڵکی خۆم و ڕووتی بکەمەوە و خۆمی تیادا بەتاڵکەمەوە و پاشان فرێیدەم و لەوێدا جێیبهێڵم، دوایەوەی پاداشتێکی ماددی یان ڕەمزیی پێدەدەم. جا ئەم پاداشتە ئایین دەستنیشانی کردبێت وەك (مارەیی) یان کولتووری کۆمەڵایەتی باو (وەك داواکردنی پێشەکی و پاشەکی و ئاڵتوون و هتد). ئەمە ئەو دیمەن و تێگەیشتنەیە لە مێینە کە لە فیلم و گۆڤارە ڕووتەکاندا بەرهەم دەهێنرێن و من دەزانم بۆچی هاوڵاتیانی ئێمە هێندە شەیدای ئەو فیلم و گۆڤارانەن، هەڵبەت ئەگەر کارەبا هەبێ! بەکارهێنانی ئەم زاراوەیە بۆ خۆی دیسان ئەمانخاتەوە بەردەم ئەو ڕاستیەی کە پێماندەڵێت: ئێمە لەکۆمەڵگایەکی تاسەر ئێسقان تەقلیدیدا دەژین و هەر ئەم کۆمەڵگایەش دیدێکی پێداوین تا لێوەی تەماشای ئافرەت بکەین و ناچاریکردووین بەزمانێکی تەقلیدیانە قسە لەسەر مێینە بکەین. لەپشت بەکارهێنانی زاراوەی سێکسەوە، لەپشت ئەوەی کە ئێمە پێمانوایە دەبێ پەیوەندیەکانمان پەیوەندیی (سێکسانە) بن نەك (ئێرۆتیکیانە)، ئەوەش هەیە کە ئافرەت وەك لایەنێك کە ئەشێ سێکسی لەگەڵدا بکەین، کائینێکە ئێمە دەتوانین بۆ دامرکانەوەی حەزە جەستەییەکانی خۆمان بەکاری بهێنین نەك بمانەوێ پەیوەندی لەگەڵ ببەستین. لێرەشدا ئافرەت وەك کائینێك کە هەڵگری کۆمەڵێك تایبەتمەندی مەعنەوی و ڕۆحی و ئینسانیانەی خۆیەتی بەپەراوێز دەکرێت و لە جەستەیدا کورتدەکرێتەوە و بەپێی جەستەیشی هەڵدەسەنگێنرێت. لەو بڕوایەدام ئەم تێڕوانینە مەسرەفگەرایانەیە بۆ مێینە لە وڵاتی ئێمەدا دیاردەیەکی تازە بێت و پەیوەندیی هەبێت بە هەڵوەشانەوەی سیستەمی تەقلیدیانەی خێڵ و گەڕانەوە و زیندووبوونەوەی بەهاکانی هەمان سیستەم لە شاردا، کە یەکێك لەو بەهایانە (نێرایەتی) و بە پیرۆزکردنی ڕەمزەکانی نێرە. چونکە ئێمە ئەوەش دەزانین کە تێڕوانینی سیستەمی خێڵ و باوکسالاری بۆ ئافرەت مەسرەفگەرایانە نەبووە و ئافرەتی وەك بەرهەمهێنەری وەچە و هێزی کار تەماشا کردووە. بێگومان گەڕانەوەی نێرێتی لە شارە گەورەکاندا پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی

هەیە بەو عەقڵییەتە سیاسیە تەقلیدی و نەریتخوازەی کە لە ڕاپەڕین بەدواوە سیستەمی سیاسیی وڵاتی ئێمەی کۆنترۆڵکردووە و بەردەوام لە ململانێ و شەڕەکانی ڕاگەیاندنی خۆیدا ئیشی لەسەر پیرۆزکردنی ڕەمزەکانی نێرایەتی کردووە. نەك هەر ئەوە، بەڵکو کێبەرکێی بەردەوامیکردووە بۆ بەرزکردنەوەی نرخی جووتبوون و تەنانەت لەناو هەڵبژاردەی سیاسیی ئێمەدا کەسانێك هەن سەفەری تایبەتی سێکسی دەکەن بۆ وڵاتانی وەك تورکیا و لوبنان و ئەو پارەیەش کە لە ڕابواردندا سەرفیدەکەن شتێکی خەیاڵییە. هەڵبەت ئەوەشمان بیرنەچێت کە تێڕوانینی مەسرەفگەرایانە بۆ مێینە لە بواری جنسیدا خەسڵەتێکی دیاری کۆمەڵگا پیاوسالارییەکانە، ئەگەرچی بۆیشی هەیە هەر لە کۆمەڵگای پیاوسالاریدا، یان لە قۆناغێکی تری پیاوسالارانەی کۆمەڵگادا تێڕوانینی ناوبراو کەمتر بێت، یان زۆر لاواز بێت. بۆ نمونە لە قۆناغی شیعری کلاسیکیی ئێمەدا، شاعیرێکی وەك مەلاخدری نالی زۆر دوورە لەو تێڕوانینە نێرسالارانەیەی باسمانکرد و پیاوێکە لەپەیوەندیی خۆیدا بە مێینەوە، زیاتر ئیش لەسەر ئێرۆتیکا دەکات نەك سێکس. واتە پەیوەندی ئەو بە ئافرەتەوە پەیوەندییەکی ئێرۆتیکیانەی شارستانیانە بووە نەك مەسرەفگەرایانەی سێکسبازاڕی. ئەمەش پێماندەڵێت: نالی وەك نێرینەیەك، کاتێ باسی پەیوەندیی خۆی بە مێینەوە کردووە، ئەوە باسی لە پەیوەندییەك کردووە کە تیایدا مێینە ئینسانێکە هەڵگری تایبەتمەندیی مەعنەوی و ڕۆحی و مرۆڤانەی خۆیەتی و جیهانێکی تایبەت بەخۆی هەیە، نەك باسی پەیوەندیی لەگەڵ زیندەوەرێ کردبێ کە تەنیا وەك جەستە تەماشای بکات و لە جەستەدا کورتیبکاتەوە و بیەوێت مەسرەفی بکات.

بۆیە دووبارەی دەکەمەوە و دەڵێم: لە کۆمەڵگا و مێژووەکەیدا وەك کۆمەڵگایەکی تەقلیدی و وەك مێژوویەك کە نێر و سێمبوولەکانی پیاو تیایدا ستایشکراوە، سێکس قەدەغەکراوێك نەبووە و ئەوەی حەرامکراو بووە ئێرۆتیکا بووە. بەڵام کاتێ ئێمە لە ئێستاشدا بەهەمان چەمك و زاراوە تەقلیدیەکان بیردەکەینەوە، ئەوە بۆمان ڕووندەبێتەوە کە هێشتا ئەو تێڕوانینە نێرسەنتەریە بەسەرماندا زاڵە و زمان و زەینی ئێمە وەك پێویست کولتووریزە نەبووە. تێڕوانینی ناوبراویش بەو جۆرە تەماشای

ئافرەت دەکات، کە ئەو کائینێکە بۆ پیاو نەك کائینێکە لەخۆیدا و نەك زاتێکی سەربەخۆیە بەهەموو ڕەهەندە ئینسانیەکانی خۆیەوە. لەو تێڕوانینەدا ئافرەت ئەوکاتە بوونێکی کاتیانەی بۆ پیاوسالار هەیە کە (دێوە کەڕ کوێر و سەرسەختەکە) لە پیاودا بێدار دەبێتەوە و ناچاری دەکات بەدوای پەیداکردنی (ژەمێ سێکس)دا، یان یارییەکی سێکسیانەدا بڕوات کە ئەویش تەنیا هەندێ بەشی جەستەی ئافرەتە نەك هەموو ڕەهەندە ئینسانیەکانی مێینە. چونکە پیاوی کورد بەگشتی زەکەر سالارە و لە هێزی زەکەرەوە دەڕوانێتە دنیا و کاتێ زەکەری لەکار دەکەوێت ئیتر ئەو (لە پیاوەتی کەوتووە).

بەپێی ئەم تێگەیشتنە لە دنیا، پیاوی نێرسەنتەر ناتوانێت ئافرەت لە گشتمەندی خۆیدا ببینێت، بەڵکو لە زەینی خۆیدا لەتوپەتی دەکات و تەنیا ئەو بەشانەی لەشی ئافرەت دەبینێ و داڵغەیان پێوە لێدەدات کە لەڕووی سێکسییەوە دەیخرۆشێنن..

*** بەلام حەزدەکەم ڕوونتر پێم بڵێی: جیاوازیی سەرەکیی ئەم دوو چەمکە(سێکس و ئێرۆتیکا) لە چیدایە و بۆچی سێکس پۆرنۆگرافی بەرهەمدەهێنێت و ئێرۆتیك خۆشەویستی بۆ مرۆڤ و ژیان بەرهەمدەهێنێت؟***

- چەمکی (ئێرۆت) لە چاوگی گریکی (*eros*)ەوە وەرگیراوە کە بەمانای خواوەندی ئەڤین بەکارهاتووە و بەرهەمهێنەری غەریزەی ژیانە. پاشان وشەی (ئێرۆتیك *Erotic*) لە (*erotikos*)ەوە دروستکراوە بۆ تەعبیرکردن لە ئەڤینێکی هەستەوەرانە و ڕۆحیی و مەعنەوی. لە ئێرۆتیکادا هێزی مرۆڤمان لە خۆشەویستی بۆ ژیان و بۆ مرۆڤەکانیتر بۆ دەردەکەوێت و ئەم هێزە وزەیەکی خۆ دروستکەر و ژیانبەخش و پەیوەندی دروستکەرە. ئێرۆتیك واتە هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە لە پەیوەندی نێوان دوو مرۆڤدا بەرجەستە دەبن، هەڵبەت بە پەیوەندییە جنسی و جەستەییەکانیشەوە. بەم مانایەش پەیوەندی ئێرۆتیکیانە لایەنی جەستەیی و سێکسی نێوان مرۆڤەکان ڕەتناکاتەوە، وەلێ جەستە و سێکس ئامانجی سەرەکیی ئێرۆتیکا نین و مەرجیش نییە سەرکەوتوویی پەیوەندییەك لە ڕووی جەستەیی و سێکسییەوە مانای ئێرۆتیکیبوونی ئەو پەیوەندییە بدات. بۆ نمونە نالی هیچ پەیوەندییەکی جەستەیی و

سێکسی لەگەڵ بەرامبەرەکەیدا نییە و کەچی ئیرۆتیکا بەشێکی گرنگە لە پەیوەندی نالی بە مەستوورەوە. واتە لەو پەیوەندییەدا ڕەهەندی ئینسانیانەی بەرامبەر بۆ نالی لەوەدا نییە کە جەستەیەکە و پێویستە لەگەڵیدا جووت بین و سێکسی لەتەکدا بکەین. بەمانایەکی تر دەمەوێ بڵێم: مەرج نییە پەیوەندی ئیرۆتیکیانە حەزی غەریزیانەی مرۆڤ بۆ نەوە خستنەوە بهێنێتە دی، هێندەی ئەوەی حەزی مرۆڤ بۆ ژیان و بەردەوامی و گەشبینی دەهێنێتە دی. ئالێرەشەوە دەکرێ بگوترێ ئیرۆتیک ئەو پەیوەندییەیە کە تەنیا لە نێوان مرۆڤەکاندا بەرجەستە دەبێت، نەك لەنێوان ئاژەڵ و گیاندارەکاندا کە هاندەری غەریزییان هەیە بۆ نزیکبوونەوە و جووتبوون لە پێناوی نەوەخستنەوە و مانەوەدا. هەرئەوەشە وایکردووە لە زۆربەی کاتدا ئاژەڵەکان لەکات و وەرزی تایبەتدا پێکەوە جووت دەبن و ئەرکێك جێبەجێدەکەن کە سرووشت لەچارەی نووسیون، لەکاتێکدا مرۆڤ وەرزێکی تایبەتی نییە بۆ بەرجەستەکردنی وزەی ئیرۆتیکیانەی خۆی.

هەرچی وشەی سیکسە لە چاووگی (*sexus*)ی لاتینییەوە دروستبووە و تەنیا دەلالەت لەو ئۆرگانانەی جەستە دەکات کە سێکسیان پێدەکرێت. بەم پێیەش جیاوازییەکی گەورە هەیە لە نێوان تێڕوانینێکدا کە باس لە پەیوەندیی سێکسی دەکات و پەیوەندییەکە بچووکدەکاتەوە لە دوو یان چەند ئۆرگانێکی جەستەیی نێر و مێدا، لەگەڵ تێڕوانینێك کەباس لە پەیوەندییەکی هەستەوەرانەی ئیرۆتیکی دەکات و ئەمەش دەبەستێتەوە بە خۆشەویستی مرۆڤ بۆ مرۆڤ و مرۆڤ بۆ ژیان. بۆیە ئەگەر خۆشەویستی بەمانا فراوانەکەی بەرجەستەکەری وزەی ژیانبەخشی بێت لە هەموو ساتەکانی بوونی مرۆڤانەماندا، ئەوە پۆرنۆگرافیا بەرجەستەکەری پەیوەندییەکی سێکسیانەی ڕووتە لەو کاتانەدا کە جەستەی بەرامبەر دەبێتە ئامانجمان بۆ ئەوەی لەگەڵیدا جووت ببین و بە تەواوبوونی پرۆسەی جووتبوونەکەیش پەیوەندیمان بە ئەویترەوە دەپچڕێت و دەتوانین لەم مرۆڤەوە باز بدەین بۆ ئەویتر. ئەمەش پێماندەڵێت: پێشمەرجی هەر پەیوەندییەکی ئیرۆتیکیانە ئەوەیە کە دەبێت دوو مرۆڤ لەو پەیوەندییەدا ئامادەییان هەبێت. کەچی لە پەیوەندیی سێکسیانەدا مەرج نییە

پێکهێنەرەکان دوو کەس بن و بۆی هەیە گرووپێك بن، هەروەها مەرجیش نییە دوو لایەنەکە هەردووکیان مرۆڤ بن. بۆی هەیە مرۆڤ ئەمکارە لەگەڵ بزن و ماکەر و سەگ و بووکەشووشەیەکیشدا بکات. ڕەنگە هەر ئەمەش بێت کە وایکردووە لەبەرهەمهێنانی بەشێکی زۆری ئەدەبیات و فیلمی ڕووتدا، دەرهێنەرەکان جەخت دەکەنەوە سەر هەبوونی لایەنێکی نامرۆیی، بۆ نمونە بوونی ئاژەڵێ، یان ئەو لەیستۆك و ئامرازانەی بۆ ئەو مەبەستە داهێنراون. کەواتە پۆرنۆگرافی بریتیە لەو ئەدەبیاتەی کە تەنیا گرنگی بە ڕەفتارە جنسی و جەستەییەکان دەدات لە میانەی پیشاندان و زەقکردنەوەی ئۆرگانە سێکسیەکاندا. لێرەشەوە، وشەی (*Porno*) مانای لەشفرۆش و (*Graphy*) مانای نووسین و تۆمارکردن دەگەیەنێت، ئەمەش پێماندەڵێت کە لە حەکایەت و دیمەنی ناو ئەو ژانرەدا تەنیا گرنگیی دەدرێت بە پرۆسەی جووتبوونی ڕووت و بەپەراوێزکردنی هەموو جۆرە خۆشەویستی و ئەڤیندارییەك لە مرۆڤەوە بۆ مرۆڤێکیتر. بۆیە ئامانجی پۆرنۆگرافی بریتیە لە بزواندنی حەزە سێکسیەکان و لەوێدا شوێنی مرۆڤ، وەك بوونەوەرێکی هزرمەند و کامڵ و خاوەن گەورەیی، بوونی نیە.

**** ئەی چۆن ئەم قسانە دەبەستیتەوە بەوەی کە دەڵێیت، کۆمەڵگای ئێمە سێکسی حەرام نەکردووە و ئیرۆتیکای قەدەغە کردووە؟***

— من تەنیا دەمەوێت ئەوەندەت بەبیر بهێنمەوە کە بە پێچەوانەی بیرورای باوی گشتییەوە، کۆمەڵگای ئێمە سێکسی حەرام نەکردووە بەڵکو ئیرۆتیکای حەرامکردوە، واتە قبوڵکردنی ئینسانیانەی ئافرەتی حەرامکردووە نەك قبوڵکردنی جەستەییانەی. ئێمە ژن دەهێنین، نەك هاوسەر دەدۆزینەوە. ژن دەهێنین بۆ ئەوەی سێکسی لەگەڵدا بکەین، واتە دەمانەوێت تەنیا لەڕووی جەستەییەوە لەگەڵیدا تێکەڵ ببین، جا ئەم ژنە وەك ئینسانێك خۆی لە ناو خۆیدا چیە، ئەوە بۆ ئێمە گرنگ نیە و کوولتووری ئێمەش لەو بارەیەوە پێشنووسێکی ئەوتۆمان ناداتێ. کەس نییە لە پێش شەوی بووك و زاوایەتیدا پێمان بڵێت پێویستە چۆن لەگەڵ ئەو کەسەدا ڕەفتار بکەین، کە لەڕووی جەستەییەوە ئەمشەو لێی نزیك دەبینەوە و تێکەڵی دەبین. ئێمە تەنیا فێرکراوین کە قەڵایەك هەیە پێویستە ئەمشەو بەهەر نرخێك بووە، داگیری بکەین و بەیانییش وەك

جەنگاوەرێکی سەرکەوتوو خۆمان بناسێنین. ئیدی کێشەی ئێمە نییە (بەرامبەر) لە ناو ئازار و خوێندا گێنگڵ دەدات یان نە . هەر بۆیەشە زۆربەی پەیوەندییەکان کاتێ دەگەنە ئاستی بەدەزگاییبوونیان، مەترسیی هەڵوەشاندنەوەیان زیاتر دەبێت. بۆچی؟ لەبەر ئەوەی لە پشت ئەم جەستەیەی سێکسی لەگەڵدا دەکەی ئینسانێکیش هەیە کە هەر پێویستی بەسێکس نیە، هەر پێویستی بەوە نیە لە ڕێگەی بەکارهێنانی لەشییەوە بیناسیتەوە و بەهای بۆ دابنێین، بەڵکو پێویستمان بە ناسینەوەی ئینسانیەت و ڕێزگرتن لە گەورەیی ئینسانیانەیشی هەیە. ئەگەر وامان نەکرد، ئەوە ئەو (سێکس)ی لێدەبێتە شتێکی بێزراو، بەخۆی نامۆ دەبێت و خۆی لێدەبێتە بوونێکی سێکسی و ناچار دەبێت بچێتە ناو یارییەکەوە کە ڕۆحی خۆی تێدا دەدۆڕێنێت و لەڕووی دەروونیشەوە دووچاری گرێی ئاڵۆز دەبێت. ئەم تێڕوانینە باڵادەستە لە کۆمەڵگای ئێمەدا وایکردووە، ژیانی هاوسەرداری و دەزگای خێزان گەندەڵ ببێت، چونکە ئەم دەزگایە بەو پێیەی لەژێر دەسەڵاتی نێرسالاریدایە، ئەوەندەی بوونی مێیینە وەك بوونێکی سێکسیانە پێناسە دەکات، ئەوەندە هانی نادات وەك ئینسانێکی سەربەخۆ کە خاوەنی ڕەهەندی مەعنەوی و ڕۆحانی و کولتووریی تایبەت بەخۆیەتی، خۆی دروستبکات. بەمانایەکی تر، ئافرەت لەناو خێزانی کوردیدا وەك جەستە مەسرەف دەکرێت و بوونی ئەو بەجەستەیدا هەڵدەسەنگێنرێت. ئەمڕۆ باوترین شت ئەوەیە پیاوێ لەدەرەوەی ژیانی هاوسەردارییەوە، (بیکەپلێنێ) و بەپێی هزری بەموڵکایەتیکردنیش، کە خەسڵەتێکی بنەمایی نێرسالاریە، هەوڵبدات زیاد لە دۆستێکی هەبێت (ئەم دیاردەیە بەتایبەتی لە نێوان دووکاندار، سیاسی و بەناو ڕۆشنبیرەکاندا باوە). بۆیە زۆربەی کچە گەنجەکانی ئێمە بەداوی پیاوی بەئەزموون و خاوەن ژنەوە دەبن، نەك کوڕانی گەنج و ڕەبەن. حەق نیە دایکان و باوکان لەوە بترسن منداڵەکانیان تێکەڵ بەهاوتەمەنەکانیان ببن، وەلێ تێکەڵبوونیان بەخاوەن ئەزموونەکان بۆی هەیە کارەساتی بەدواوە بێت. ئەمەش پێماندەڵێت کە خۆشەویستی و ئیرۆتیکا لەبەرامبەر بەسێکسیبوونی کۆمەڵگادا لەمەترسیدان. من گومانم هەیە لەوەی خۆشەویستی بە شێوە باوەکەی

لەکۆمەڵگای ئێمەدا وەك پەیوەندییەك مانایەکی مابێ، هەربۆیەشە دروستبوونی پەیوەندیی وەك پانتاییەك بۆ خۆدروستکردن و ئەویترناسین هێندە دەگمەن بووە و بێ متمانەیی ئەوەندە پەرەی سەندووە و تادێت نێر و مێ پێشنەوەی یەکتر لە سەرجەمییەتی خۆیاندا ببینن، تەماشای ئەندامە سێکسی و حەز بزوێنەکانی یەکتر دەکەن..

*** باشە دەبێت هۆکاری لاوازبوونی خۆشەویستی، یان وەك تۆ دەڵێی: پەیوەندیی ئیرۆتیکی و بەهێزبوونی سێکسیزم، جگە لە باڵادەستی ئایدیۆلۆژیای نێرسالاری، لەکوێی تردا بدۆزینەوە؟**

ـ بەڕاستی لەو باوەڕەدام باشترین دەستپێکردنی مرۆڤ بۆ قسەکردن لەبارەی خۆشەویستییەوە، ئاخاوتن بێت لەسەر ئەزموونی ئەڤیندارانەی خۆی، کە لێرەدا شوێنی نیە و ڕەنگە پێمخۆشبێت ئەوە لە کاتێکی دیدا باس بکەم.. هێندە هەیە ئەمڕۆ ئێمە خۆمان لەبەردەم ئاوابوونی خۆشەویستیدا دەبینینەوە و ئەمەش ناچارمان دەکات بپرسین: بۆ خۆشەویستی و ئیرۆتیکا لە کۆمەڵگای ئێمەدا شکستیان هێناوە و سێکسگەرایی و ڕوانینی پۆرنۆگرافیانە پەرەیان سەندووە؟ من لەکاتی لێکۆڵینەوەم لەسەر قەسیدەکانی نالی، بەتایبەتیش لە کاتی خوێندنەوەی قەسیدەی (مەستوورە)دا، ساڵی ١٩٩٢، ئەم پرسیارەم بە خەیاڵدا هات و لەوە تێگەیشتم، خۆشەویستی ئەوکاتە لەلای نێر و مێ دروستدەبێت کە لایەنی مێیینەیی بەسەر لایەنی نێرینەییدا باڵادەست بێت. ئێمە لە هەندێ تیۆرییەوە فێربووین کە کەسایەتی مرۆڤ لە هەردوو ڕەگەزی نێرینەیی و مێینەیی پێکهاتووە و بەو مانایەی (کارڵ گۆستاف یۆنگ) تێیدەگات و لەئەنجامی خوێندنەوەیەوە بۆ ڕەمزە ئایینیەکانی چین، هەموومان خاوەنی (یانگ) و (ین)ی خۆمانین. خۆشەویستی ساتەوەختێکە تیایدا چ لەلای نێر و چ مێ، ڕەگەزی مێینەیی زاڵ دەبێت بەسەر کەسایەتیاندا و بێگومان ئەمەش دابڕاو نیە لەو زەمینە کولتووری و مێژووییەی مرۆڤی تیادا دەژی. واتە هەلومەرجە کولتووری و مێژووییەکان ڕۆڵیان هەیە لە بەرجەستەکردنی لایەنی مێینەیی و نێرینەیی کەسێتی مرۆڤدا. ئەگەر ئەو هەلومەرجانە ستایشی کولتوورێکی

نێرانەیانکرد، ئەوە نێرێتی ئەندامانی کۆمەڵگا لەلای هەردوو ڕەگەز پەرەدەستێنێ و پێچەوانەکەیشی هەر ڕاستە.

لەم ڕوانگەیەوە دەتوانین بەرەو پەرسڤدانەوەی پرسیارەکەت هەنگاو بنێین: لە مێژووی ساڵانی ڕابردووی ئێمەدا دوو وەرچەرخانی گەورە ڕوویانداوە، کە بێکاریگەر نەبوون لەسەر بارودۆخی خۆشەویستی و پەیوەندیە هەستەوەرییەکانی مرۆڤی کورد. یەکەمیان ئەوەیە لەو مێژووەدا، واتە لە بەعسیەکانەوە بۆ ساڵانی خۆبەڕێوەبردنی ئیدارەی کوردی، بەجۆرەها شێواز ستایشی نێرێتی کراوە. چ بەعسییەکان و چ پارتی و یەکێتی و ئیسلامییەکانیش لە ستایشکردن و زیندووکردنەوە و بەرز ڕاگرتنی ڕەمزەکانی نێرینەییدا، دەستەوەستان نەبوون. ئەو توندڕەوییەی بەعسییەکان لەسەر بنەمای بەدووژمنکردنی کوردەوە ئیشیان بۆ دەکرد و بەرهەمیان دەهێنا، دواجار لەسەر دەستی لایەنە کوردییەکان و لە میانەی شەڕەکانی ناوخۆ و شەڕە میدیاکانەوە پتر بەرجەستە بوو. واتە کورد خۆیشی بەهەمان میکانیزم یەکتریان بەدووژمن دەکرد و بەمجۆرەش ئێمە بووینە بێگانەی یەکتر. بۆیە توندڕەوی و نالێبووردەیی بەرامبەر بە ئینسانی کورد، هەرتەنیا شتێ نیە لەدەرەوە و لەلایەن خەڵکانێکی بیانییەوە فەرز کرابێ، بەڵکو بەشێکی دانەبڕاویشە لە مێژووی نوێی ئێمە، کە کوردەکان خۆیان بەسەر ئەم کۆمەڵگایەدا سەپاندیان. ستایشکردنی توندڕەوی و نالێبووردەیی بەبێ ستایشکردنی ڕەمزەکانی نێرینەیی و زیندووکردنەوەی ئایدیۆلۆژیای نێرسالاری، کە ئاڵاکەی دەستی (زەکەر)ە وەك پیرۆزترین ڕمزی خۆی، ئیمکانی نیە. ئەوە لەودیو ستایشکردنی نێرسالارییەوەیە کە دیاردەی تۆڵەکردنەوە و تێزابڕێژی و ئافرەتکوشتن، دەبنە شتی زۆر ئاسایی. بەم پێیەش بواری ژیانێکی ئەڤیندارانە و پەیوەندی ئیرۆتیکیانە تەسك دەبێتەوە و نێرایەتی هەموو کەلێن و قوژبنەکانی ژیانی مرۆڤی ئەم دەڤەرە داگیر دەکات و هەموو شتێ سێکساوی دەکرێت، هەموو شتێ بە پێوەرەکانی نێرسالاری ناودەنرێت. تەنانەت جۆری سەیارەکانیش سێکسیزە دەکرێن و ناوگەلی وەك: لەیلاعەلوی و شلەخەجێ و نازانم چییان بەسەردا دەبڕدرێتەوە.

دووەمین گۆڕان کە لەکۆمەڵگای ئێمەدا ڕوویداوە و بەبڕوای من پەیوەندیی هەیە بە

لاوازبوون ئاوابوونی پەیوەندیی خۆشەویستییەوە، گواستنەوەی زۆرەملەی گوندەکان و پاشان لەدوای راپەرینیشەوە، بەشاریبوونی گوندەکان بووە..

*** *زۆرباش ئەمەم لەلا روون نیە، مەبەستت ئەوەیە خۆشەویستی لەشاردا دەمرێ..؟***

ـ مەبەستم ئەوەیە بەلای منەوە خۆشەویستی دیاردەیەکی گوندیانەیە زیاتر لەوەی شاریانە بێت. بۆئەوەی ئەڤیندار بین پێویستە رۆحێکی گوندیانەمان تێدا بێت، یان هەڵگری کولتوورێکی گوندیانە بین، ئەمەش بەمانای رەتکردنەوەی شار و ئایدیالیزەکردنی گوند نیە، بەڵکو تەنیا دەمەوێت لەسەر مەسەلەیەکی هەستیارانە بە شەففافترین شێوە خۆمت بۆ روون بکەمەوە. من لەو بروایەدام، چاوەڕوانی و سەبرکردن و وێڵبوون و گێنگڵدان و شەرم، بەشێکن لەپێویستیەکانی ئەڤینداری، لەکاتێکدا ئەوەی لە شاردا ڕوودەدات، بەلای منەوە زیاتر لەوەی خۆشەویستی بێت، حەزلێکردنە، سێکساندن و بە پۆرنۆگرافیکردنە. شار فەزایەکی کراوەیە بۆ یەکتر بینین و ئاشکرایی و شەففافیەت. لەشاردا ڕووتیی مرۆڤەکان وادەکات لەئاستی دیداریدا بۆیەکتر ئاوەڵا بن و زوو یەکتری شوناس بکەن. شەرم، چاوەڕوانی، سەبرکردن و گێنگڵدان بۆ دیداری یار، کەمدەبنەوە. شار چاوی ئێمە لە ئاست جەستەدا بەتەماعتر و نەوسنتر دەکات. شێوەی جل و بەرگ، خۆ رازاندنەوە، ئەو پێگە و سەیارە و مڵك وماڵەی هەمانە و هتد.. برەو بە سەرنجراکێشانی جەستەیی لەشاردا دەدەن و لە هەڵسەنگاندنی نێرینە و مێینەدا بۆ یەکتر رۆڵیان هەیە. شار فێرماندەکات تەماشای ڕواڵەتی یەکتر بکەین و تێڕوانینمان لە ئاست و سنووری پێستەوە زیاتر تێپەڕ نەکات و نەبێتە تێڕوانینمان بۆ ماهیەت و ناسنامەی کەسایەتی یەکتر. ئەمرۆ خێزانی کورد، کچەکەیان دەدەنە هەرکەسێ، کە خاوەنی ئەمجۆرە ئیمتیازانە بێت و پرسینەوە لە کەسایەتیی و خودێتی ئەو کەسە تادێت کەم بایەختر دەبێت. بەکورتی من بڕوام وایە ئێمە لەشاردا (حەز) لەیەکتر دەکەین و ئەمەش پرۆسەیەکی بەردەوامە. واتە لە ڕۆژێکەوە بۆ ڕۆژێکی تر و لە کەسێکەوە بۆ کەسانی تر حەزەکەمان دەگۆڕێت و مەرجیش نیە لەسەر هەمان حەز بەردەوامبین، بەتایبەتی وەك پێشتر گوتم، ئێمە لە لە کۆمەڵگایەکی پیاوسالاریدا دەژین و ئەمجۆرە کۆمەڵگایانەش ستاییشی ئەو پیاوە

دەکەن کە لەیەك کاتدا زیاد لە پەیوەندییەکی هەبێت و ئەمەش خێرایی دەدات بە پرۆسەی بەکاڵابوونی ئافرەت لەم کۆمەڵگایەدا. بەتایبەتی دوای هاتنی ئەنتەرنێت و بڵاوبوونەوەی کولتوورێکی سێکسی و پۆرنۆگرافیانە. بەپێچەوانەی ئەمەوە، خۆشەویستی بە مانا ڕەمزییەکەی پەیوەندییەکی گوندیانەیە و پەیوەندیی ئەڤیندارانە پەیوەندییەکی ڕۆحیانەیە نەك جەستەییانە. لەبەرامبەر ڕووتیی شاردا، داپۆشراوەیی گوند هەیە و ئەمەش وادەکات پرۆسەی حەزلێکردن هەنگاوی یەکەم بێت بۆ خۆشەویستی و ئەمەشیان پەیوەست بێت بە کەسایەتی و ماهییەتی مرۆڤەوە، بە ئیمان و خۆ دروستکردنەوە، نەك ئەو ئیمتیازە مادیی و ڕەمزیانەی کەسەکان هەیانە.

بەڵام لەدوای ڕاگواستنی گوندەکان و دواجار ئاوەدانبوونەوەیان، دەبینین کولتوورێکی شاریانە چۆتە گوندەکانەوە و ئەمەش وایکردووە پێوەرەکانی شار بۆ حەزلێکردن ببنە هەڕەشەیەکیش بەسەر خۆشەویستییەوە. وایکردووە چاوەڕوانی و گێنگڵدان و فەنتازیای ئەڤینداران لاواز بن و ئەو چاوەڕوانی و سەبرگرتن و شەرمەی خۆشەویستی دەیسەپێنێ، شوێنی خۆی بۆ دیتن و خۆتێهەڵسوونی بەردەوام و نزیکبوونەوەی ڕۆژانە چۆڵبکات. ئەمڕۆ و دیارە لەپاشەڕۆژیشدا زیاتر، گەنجەکان بەرلەوەی بچنە ناو ژیانێکی پێکەوەیی و هاوسەرداریی‌یەوە، دەبنە خاوەنی ئەزموونێکی سێکسیانەی جەستەیی کامڵ و هیچ نهێنی و شتێکی شاراوە نامێنێ لە ڕەگەزی بەرامبەردا ئاشکرایان نەکردبێ.

***** دەتەوێ بڵێی: ئەو گۆڕانکاریانەی ئاماژەت پێدان، بوونەتە هۆکاری کوشتنی پەیوەندیی ئەڤیندارانە بەهۆی باڵادەستیی ئەو کولتوورە شارییەی باستکرد و لە سێکسیزمدا خۆی دەبینێتەوە؟***

- دەمەوێت بڵێم: شاڵاوی سێکسیزم کە پەیوەندیی بە گەورەبوونی شارەکان و کولتووری مەسرەفگەرای شارەوە هەیە، لە کۆمەڵگای ئێمەدا بۆتە هەڕەشەیەك بەسەر پەیوەندییە ئیرۆتیکیەکانەوە، ئەمەش بۆتە هۆی لاوازبوون و ئاوابوونی خۆشەویستی بەو مانایەی کە لە شیعر و داستان و بەیتە کوردییەکاندا دەیبینین. ئەمڕۆ چیدی کەسمان بەهەمان مانای ئیرۆتیکیانەی (خەج و سیامەند، لاس و خەزاڵ، مەم و زین،

جەزیری و سەلما، نالی و حەبیبە و وەلی دێوانە و شەم)ـە وە ناڕوانینـە خۆشەویستی و ئەڤینیش ناکەین. خۆشەویستی لە کۆمـەڵگای ئێمـەدا وەك دەرکەوتەیـەکی ڕۆحـی و مەعنەوی و پاشـان وەك ئاسـتێك لـە پەیوەنـدیی ئینـسانیانە، خەریکـە شـوێنی خـۆی چۆڵدەکات بـۆ شـتێکی دیکـە، کـە دەشـێت تەماعـە جەستەییەکان بێـت. فـەنتازیای عاشقانە، واتە بینینی باتنی و ناخگەرا بۆ مـرۆڤ، مـەرگی خـۆی لەبـەردەم شاشـەکانی ئەنتـەرنێت، فیلمـی ڕووت و سـەتەلایتدا دەبـینێ و سێکسیوالیزەبوون قـەدەری ئـەو دەستنیشان دەکات. زۆر فاکتەر هەن لە کوشتنی خۆشەویستیدا کاریگـەرن، بـەڵام وا پێدەچێت ئەو فاکتەرەی بەگشتی لەمەدا دەستنیشانکەر بێت، بریتی بێ لـە شـەپۆلێك کە بەرەو ئازادیی سێکسی دەمانبات. چونکە ئازادی سێکسی بۆی هەیە هەندێ حەزی بایۆلۆژی و خواستی جەستەیی ڕووت لەلای مرۆڤ بخاتە کار و بیانجولێنێ، کە بـەمانای ئـەوە دەکەونـەوە مـەرج نیـە مـرۆڤ تـا دەمـرێ لەگـەڵ هـەمان کەسـدا ئەڤیندارانـە بمێنێتـەوە. ئەمـەش بـەمانای ئـەوە نییـە کـە چـیدی ئێمـە نـاتوانین پەیوەنـدیی دووروودرێژمان لەگەڵ یەکتردا هەبێت، بەڵکو بەو مانایەیـە کـە سـەردەمەکە ناچـارمان دەکات، یان بەرەو ئەوە دەچێت ناچـارمان بکـات پەیوەنـدی کورتخایـەن هەڵبـژێرین. ئەمەش پەیوەندی هەیە بەوەی کـە چـیدی دەستخۆشـانە و هانـدانێکی کۆمەڵایەتیانـە نییە بۆ پەیوەندی درێژخایـەن و چـیدی کۆمـەڵگا پاداشـتی کۆمەڵایەتیانـە و پاداشـتی ئیرۆتیکیانــە پێکــەوە گرینــادات. ئــەوەی ئــەمڕۆ بایەخــدارە سێکــسوالیزەکردنی پەیوەندییەکانە و ئەمـەش جگـە لـە پتـەوکردنی ڕوانگـەی پۆرنۆگرافیانـە(خیلاعیـەت) هیچیتر نادات بەدەستەوە. کۆمەڵگای ئێمە تا دێـت خـۆی پـتر و پـتر ڕووتدەکاتـەوە و مرۆڤەکان بەرەو ئەوە هاندەدرێن خۆیان وەك *بابـەتێکی* سێکسی تەماشـا بکـەن. مـن ئەم گۆڕانە وەك گۆڕانێك دەبینم: لە خۆشەویستییەوە بۆ حـەزلێکردن، لـە ئیرۆتیکـاوە بـۆ سێکـسگەرایی و لـە خـۆ دروسـتکردنەوە بـۆ مەسـرەفکردن و لـە ئیمانــەوە بـۆ سەرگەردانی.

**** ئەی لەو بڕوایەدایت خۆشەویستی بەتەواوی و بۆ هەمیشە لەناو بچێت؟***

– یەکێك لە کاراکتەرەکانی خۆشەویستی ئەوەیـە لەسـەر بنـەمای ناسـینی مرۆڤەکـەی

بەرامبەرەوە، بەبێ هیچ مەرجێك خۆمان تەسلیم دەكەین. خۆمان تەسلیم بەو كەسە دەكەین كە وەك ئێمە مرۆڤە و لەناو مێژوویەكدا دەژی، نە كەسێكی ئەفسانەییە و نە بوونەوەرێكی فریشتەئاسا. ئۆكتافیۆپاز لە شوێنێكدا نووسیویەتی: «خۆشەویستی ڕاستەقینە، پێكەوەبوونێكی چارەنووس سازە، تیایدا بوونەوەرێكمان خۆشدەوێ كە قابیلی مردنە، وەلێ بەجۆرێ خۆشمان دەوێ وەك ئەوەی هەرگیز نامرێ!». لە خۆشەویستیدا گرنگ ئەوە نیە خۆشیان بوێی بەڵكو ئەوەیە خۆشەویستی ببەخشی و خۆت دەستپێشخەر بیت لە بەخشیندا. دیارە تا دێت ئەم تێگەیشتنە لە خۆشەویستی لە ناو كۆمەڵگای ئێمەدا بەسەر دەچێت، هەر لەبەر ئەوەیشە كە خۆكردنەوە و پەنابردن بۆ ئەویتر پرۆسەیەكی ئازاردەر و بە ئێشە و زۆربەی كات دەستمان بەئاگرەكەدا دەچزێ، پەشیمان دەبینەوە لەوەی كە دڵی خۆمان بۆ یەكێكیتر ئاوەڵا كردووە.. بەڵام ئەوە سرووشتی خۆشەویستیە كە بەو جۆرە بێدەسەڵاتانەیە بمانخاتە بەردەم ئەویتر. لەبەردەم ئەویتردا هەست بە لاوازی بكەین و بەهەموو مەرجەكانی ڕازیی بین و ژەهری ئەو بە قەند و نەبات وەربگرین. ئەمەیە ئەو شتەی لە كاتی خۆشەویستیدا وامان لێدەكات خودی خۆمان بین و پەیڕەوی لە هیچ نۆرم و ئەخلاقێكی كۆمەڵایەتی نەكەین، بەڵكو خودی خۆمان بین بەبێ هیچ ماسك و ڕووپۆش و خۆشاردنەوەیەك. پێكەنین و گریان، قووڕپێوان و قوربانی و شەوبێداری و برسێتی چەشتن، ببنە بەشێ لە ژیانی ئاسایی، تەنیا لە پێناوی ئەویتردا. ئەویتریش ئازادە لەوەی قەبووڵمان بكات یان نە.. وای ئەگەر دەست بنرێ بە ڕوومانەوە، وای لەو دارِمانە جەستەیی و مەعنەوی و عەقڵیی و هەستیاریەی دووچاری دەبین و كەس بە فریامان ناگات.. ئەگەر خۆشەویستی ئاوامان لێبكات و ئەو وزەیە بێت كە لە خودی خۆمانەوە سەرچاوەی گرتووە بەرەو ئەویتر، ئەوە بەم مانایە لەو بڕوایەدا نیم خۆشەویستی وەك وزەیەك بۆ هەمیشە لەناو بچێت. چونكە مرۆڤ هەمیشە پێویستی بە مرۆڤی تر هەیە و ئامادەیی مرۆڤەكان پێكەوە و لە حزووری یەكتردا، مەرجە بۆ وەدیهاتنی ژیانێكی ئینسانیانە. ڕەنگە بەهۆی مادەی كیمیاویەوە ئیمكانی هەبێت خۆشەویستی لەناو ببرێت، وەلێ نەك لە میانەی پرۆسە و پەیوەندییە

کۆمەڵایەتییەکاندا. خۆشەویستی هێز و ووزەیەکی بەجووڵەخەرە کە لە قووڵاییەکانی بوونی ئینسانیانەی ئێمەوە سەرچاوەی بەستووە. ئێمە وەك مرۆڤ مەحکومین بەوەی ئەم وزەیە بەگەڕمان بخات، چونکە بەشێکی زۆر لە خۆدروستکردنمان پەیوەندی بە مەسرەفبوونی ئەم ووزەیەوە هەیە. بۆیە ناکرێت لەناو ببرێت یان بسڕدرێتەوە، بەڵام بۆی هەیە سەرکوت بکرێ و لە شێواز و فۆڕمی جیاوازدا بەدیار بکەوێت. بۆی هەیە لە ئاسۆی ژیانی نەوەیەکدا، یان قۆناخێکی مێژووییدا ئاوا ببێت و لە سپیدەی ژیانی نەوەیەکی تر و قۆناخێکی دیکەدا هەڵبێتەوە. وەلێ لەناوچوونی هەمیشەیی خۆشەویستی، شتێکە بۆ من مانای نیە.

***بەڵام تۆ باسی ئاوابوونی خۆشەویستی دەکەیت..؟**

– من باسی ئاوابوونی پەیوەندیی خۆشەویستی دەکەم وەکئەوەی لە کۆمەڵگادا بەدیار دەکەوێت، نەك مەحووبوونەوەی وزەی ژیاندۆستی و خۆشەویستی وەك وزەیەکی هەمیشەیی لە بوونی مرۆڤەکاندا. مرۆڤ لەهەر کات و شوێنێ بێت وزەی سۆزگەرایی و ئیرۆسیانە بەشێکە لە شوناس و بەرجەستەکەری مرۆڤبوونەکەی، بەڵام مەرج نییە ئەم وزەیە لە هەموو سەردەمێکدا بواری بەرجەستەبوونی بۆ بڕەخسێ، یان تەندروستانە گوزارە لەخۆی بکات و ببێتە بەڵگەیەك لەسەر کامڵبوونی مرۆڤ. ڕاست دەکەیت، من باسی (ئاوابوون)ی خۆشەویستی دەکەم نەك نەمانی خۆشەویستی. ئەمەش بەمانای ئەوەیە ئەم ڕۆژگارەی ئێمەی تێدا دەژین و ئەو مێژووەی لەپشت سەرمانەوە جێمانهێشتووە، لە خزمەتی بەرجەستەبوونی پەیوەندییە ئیرۆسییەکاندا نەبووە و خۆشەویستی لە هەلومەرجێکی ئاوادا غەیبەت دەکا و ئاوا دەبێ. وەلێ مادام وزەی خۆشەویستی و خۆشەویستی لە قووڵاییەکانی بوونی مرۆڤانەی ئێمەوە سەرچاوە دەگرێت و مادام لەهەموو سەردەم و بارودۆخەکاندا کەسانێك هەن لەهەوڵی ڕەخساندنی ئەو هەلومەرجانەدان کە بۆ خۆشەویستی پێویستن، ئەوە ئاوابوونی خۆشەویستیش نابێتە شتێکی هەمیشەیی. خۆشەویستی بۆ جوگرافیایەکی دوور و نادیار ئاوا نەبووە، بەڵکو لە ڕۆح و ویژدانی خۆماندا وەك تاکەکەس ئاوا بووە و هەر کات ڕۆح و ویژدانی تاکەکەسەکانیش بێدار بۆوە، خۆشەویستی دووبارە هەڵدێتەوە.

# دەستبۆبردن،
# نقورچبازی و لێبادان

## گفتوگۆی: شەهلا مەحموود

*{هۆکاری ئەوەی کە پیاو نقورچ دەگرێ چییە؟ لەکوێ نقورچگرتن و لێبادان زۆرە؟ تەماشاکردنی کۆمەڵگا بۆ نێر و مێ. تاچەندە ئافرەتان بۆخۆیان دەیانەوێ نقورچیان لێبگیرێ و بۆچی بێدەنگ دەبن؟ کێ پەلاماری دەدرێ و ڕێگاچارە چییە؟}*

***شەهلا: هەندێك کات لەقەرەباڵغی، یان لەچۆڵەوانیدا، دەبینین کوڕێك (پیاوێك) هەڵێك دەدۆزێتەوە و پەلاماری کچێك (ژنێك) دەدات.. تۆ لە ڕوانگەی کۆمەڵناسییەوە چۆن ئەم دیاردەیە لێکدەدەیتەوە؟ بەڕای ئێوە هۆکارەکانی چین؟***

**سیوەیلی:** سەرەتا پێویستە ئەوە بگوترێ کە قسەکردن لەسەر بابەتگەلی ئاوا هەرتەنیا بابەتێك نیە بۆ زانستی کۆمەڵناسی و دەکرێ لە ڕوانگەی جیاوازی زانستەکانەوە قسەی لێبکرێ، بەتایبەتی لە ڕووی مێژوویی و دەروونناسیشەوە. بەڵکو پێویستە هاوکات لە ڕوانگەی هەریەکێ لەو بوارانەوە تەماشای بکرێت.. لەو

بڕوایەدام ئەم دیاردەیە دیاردەیەکی بنەمایی نییە و پەیوەندی نییە بە جەوهەری پێکهاتەی دەروونیی و جەستەیی مرۆڤەوە. ئێمە هیچمان بەوجۆرە لەدایک نابین کەدەستمان لە پێکهاتەی خۆیدا بەوجۆرە دروستبوویێت کە بە شێوەیەکی خۆبەخۆ ببێتە ئامرازێکی پەلاماردەر. دەست لە جەوهەردا ئەندامێکی جەستەیە بۆ وەرگرتن و بەخشین و بەرگریکردن و دروستکردنی پەیوەندی و جەمسەر پێکەوەبەستن، نەك ئامرازێك بێت بۆ پەلاماردان و نقورچگرتن و لێبادان و داپچڕین و ڕنینەوە. بەبڕوای من ئەم دیاردەیە زیاتر لەوەی پەیوەندی بە پێکهاتەی جەستەی مرۆڤەوە هەبێت، پەیوەندی هەیە بە جەستەی نەخۆشی کۆمەڵگاوە کە وەك خووێك فێری تاکەکەسەکانی دەکات و دواجار وەك دیاردەیەك بۆ ماوەیەك بەردەوامی وەردەگرێت و بۆی هەیە لە قۆناغێکیشدا کەم ببێتەوە، یان شوێنی ڕوودانەکەی بگۆڕێت یاخود هەر نەمێنێت.

لێرەوە گەرەکمە بڵێم: هەم کات و شوێن و هەم ئەو ژینگە کۆمەڵایەتیەی، کە تیایدا دەژین ڕۆڵی خۆی هەیە لەوەدا کە چەندە زوو ئەم خووە دەست پێبکەین و چەندەش خێرا خۆمانی لێ ڕزگار بکەین. کەواتە بەبڕوای من هەڵەیەکی گەورەیە گەر بڵێین: ئەمە تەنیا پەیوەندی بەبونیادی دەروونی تاکە کەسەکانەوە هەیە. دەبێت ئێمە بگەڕێینەوە بۆ ئەو یەکە کۆمەڵایەتییەی کە تاك تیایدا لەدایك دەبێت و پەروەردە دەکرێت بۆ ژیانێکی کۆمەڵایەتیانە، کە ئەویش یەکەی خێزانە. تەنانەت ئەگەر ئەم دیاردەیە وەك بارودۆخێکی بەدەروونیبووش لێکبدەینەوە، ئەوە پێویستە بزانین ئەو دامەزراوەیەی هەڵدەستێ بە دەروونیکردنی ئەم خووە، بریتیە لە خێزان و ئەو شێوازە پەروەردەییەی لە خێزانی کوردیدا باوە.

***شەملا: ئایا دەتوانیت ئەمە بە نمونەیەك ڕوونتر بکەیتەوە؟***

سیوەیلی: بەڵێ، با نموونەیەکت بۆ باس بکەم: ئەگەر کەسێك لە منداڵیدا لەتەمەنی (١-٦) ساڵی و تا زیاتریش لەماڵەوە، لەلایەن دایكو باوكو (خوشكو برا) گەورەکان، بەشێوەیەکی سروشتیو سۆزەوە دەستی بەسەرا نەهێنرابێت، لەباوەش نەکرابێت، بێبەش بوبێت لە سۆز و ناوبەناویش چەپۆکیان بۆ داهێنابێتەوە و سنگیان لێکوتابێ

و پەنجەی هەڕەشەیان لێبەرزکردبێتەوە و زللەیان لێدابێت، ئەوە ئەم منداڵە وەزیفە سرووشتیەکانی دەست فێرنابێت. چونکە هەموو ئەو جۆرە بەکارهێنانانەی دەست کە لە خێزانی کوردیدا باون، دەستێکی پەلاماردەر و شاڵاوهێنەر بە منداڵ دەناسێنن و دەیخەنە سەر ئەو بڕوایەی کە ئەویش بەوجۆرە دەستی خۆی بەکار بهێنێت و بێبەش بێت لە بەکارهێنانی ئەو ئەندامە گرنگەی لەش بۆ پەیوەندیگرتن و بەخشین و لێوەرگرتن. منداڵی کورد بەرلەوەی فێری دەستکردنە ملی هاوڕێکانی ببێت، فێری ڕنینەوەی قژیان دەبێت و بەرلەوەی فێری لێکردنەوەی گوڵ ببێت، فێری بەردهاویشتن دەبێت!

کەواتە ئەو منداڵانەی کەدەستی گەورەکانیان تەنیا بەوجۆرە نەناسی بێت کە دەستە بۆ (زللەو نقورچ و بەردهاوێژتن و قژ ڕنینەوە) بەڵکو واشیان ناسیبێت، کەدەست پڕە لەمیهرەبانیو دەتوانێت خۆشەویستی ببەخشێت، دەتوانێت ئاراممان کاتەوە بەوەی کە دەست بەسەرماندا بهێنرێت، بەهێمنی لە حەمامدا بمانشوات و بەهێواشی شانە بهێنێت بە قژماندا و.. ئەگەر منداڵ دەستی بەمجۆرە ناسیبێت، بە بڕوای من ئەو بیّ بەشیەی تێدا دروست نابێت کە دواجار دەستی خۆی بەشێوازێکی نامیهرەبانانە بەکاربهێنێت. بەمانایەکی تر: ئەگەر خێزان و شێوازی پەروەردەکردنەکەی وا مامەڵەی لەگەڵ منداڵدا کردبێت، کە ئەو «قوربانی»یەکە و لەهەر ساتێکدا بۆی هەیە بکەوێتە بەر شاڵاوەکانی دەست، ئەوا ئەم منداڵەش لەتەمەنی دواتری خۆیدا کاتێك جەستەی پێدەگات و ئەویش هەست بەتوانا و دەسەڵاتی خۆی دەکات، ئەوانی تر دەکات بەقوربانی. لەوانەیە یەکەمین قوربانیەکانی ژێر دەستی ئەم کەسانەش خێزانەکان و کەسانی نزیکی خۆیان بن.

لەلایەکی ترەوە، لەکۆمەڵگای ئێمەدا تاکە کەس تا تەمەنێکی زۆر شتێکی نییە لەڕێیەوە خۆی بسەلمێنێت، بۆیە لە قۆناغێکدا ئەم دەست بۆ بردن و نقوورچگرتنە وەك جۆرێ لە خۆسەلماندن دەردەکەوێت و بکەرەکانی دەیانەوێت بیسەلمێنن کە ئەوانیش هەن. لەهەموو حاڵەتێکدا کەدوو مرۆڤ دەست لەیەك دەدەن یان دەست بۆ یەکتر درێژ دەکە، جۆرێك لەپەیوەندی دروست دەبێت، بەڵام جیاوازی هەیە لەنێوان

ئەوەی کە ئێمە دەست درێژ بکەین بۆ ئەوەی تەوقە لەگەڵ یەکێکدا بکەین، یان باوەش بەیەکێکدا بکەین، لەگەڵ ئەوەی نقورچ لەیەکێك بگرین. وەلێ لە هەردوو باردا جۆرێ لە خۆ سەلماندن و تەئکیدکردنەوە سەر خۆ هەیە. لە کۆمەڵگایەکدا کە مۆڵەتی نەداوە تاکە کەسەکانی بەپێی قۆناغەکانی تەمەن خۆیان بسەلمێنن، ئەوە ئەو تاکانە بەدوای خۆ سەلماندنی لادەرانەدا دەگەڕێن و هەرکات چاودێری کۆمەڵایەتیان لەسەر نەما، دەیانەوێت هەلێك بقۆزنەوە و چەپێنراوەکانیان بەتاڵ بکەنەوە و بەرامبەرەکەیان بکەن بە قوربانیەك. بێگومان ئەم دیاردەی دەست بۆ بردن و نقورچ گرتنە، تەنها تایبەت نییە بەکۆمەڵگەی کوردی، بەڵکو هەموو ئەو کۆمەڵگەیانەش کە وەکو کۆمەڵگای ئێمە دروستبوون و دەسەڵاتی خێزان و چاودێریکردنی کۆمەڵایەتی ئەوەندە تیایاندا بەهێزە، ئەم جۆرە کەسایەتیانە بەرهەم دەهێنێت. بەڵام ئەگەر ئێمە کۆمەڵگای خۆمان وەربگرین و وردتر قسانی لەسەر بکەین، ئەوە من پێموایە دیاردەی دەستبۆبردن و خۆلێخشاندن و نقورچبازی لە هەشتاکانەوە بۆ نەوەدەکان و دواجار بۆ ساڵانی دوو هەزار، گۆڕانی زۆری بەسەردا هاتووە.

لەهەشتاکاندا ئەوانەی کە دەستیان بۆ کچەکان دەبرد و نقورچیان لێدەگرتن زیاتر لەشوێنە پڕ جەماوەرییەکان (قەرەباڵغ) ئەم کارەیان دەکرد، لەو شوێنانەی کە بواری خۆ ونکردن زیاترە. ئەم کەسانە دواجار کاراکتەرێکی نەعامە ئاسایان هەیە و دوای ئەنجامدانی کارەکەیان سەریان دەکەن بەناو ئاپۆرەی خەڵکدا. دەتوانم بڵێم لە هەشتاکاندا هەمیشە ئەو کەسانە لەشوێنێکی وا دەگەڕان، کەبتوانن بەزووترین کات ئەو کارە ئەنجام بدەن و دواجار خۆیان لەناو ئاپۆرەی جەماوەردا ونبکەن، بۆچی؟ لەبەر ئەوەی چاودێری کۆمەڵایەتی و سزاکان لەهەشتاکاندا لە کۆمەڵگای ئێمەدا زۆر زیاتر بوو بە بەراورد لەگەڵ ئێستادا. بەڵام لەنەوەدەکانەوە تائێستا، هەست دەکەم ئەم دیاردەیە چیدی دیاردەیەك نییە، تەنیا لەشوێنی قەرەباڵغ و لەناو ئاپۆرەی جەماوەردا روویدات، گەرچی لەوێش روودەدات، بەڵام لەشوێنی چۆڵتریش روو دەدات، ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی و سزاکان لاواز بوون. لەهەشتاکاندا ئەم دیاردەیە بەزۆری دیاردەی ناو بازاڕەکان، پاساژەکان و ڕیزی نان و

نەوت وەرگرتن و تەنانەت مەسیرەکان و حاڵەتەکانی قلێشانەوە بوو کە لەشوێنی فراواندا ئەنجامدەدران. بەڵام لە نەوەدەکاندا بکەرانی ئەم دیاردەیە بۆ شوێنی بەرتەسکتر دەگەڕێن و دیاردەکە دێتە ناو دائیرەکان و ناو پاس و تەکسی و شوێنە بەرتەسکەکانەوە و لە ساڵانی سەرەتای دوو هەزاریشدا بکەرانی ئەم دیاردەیە دەچنە ناو ریزی چڕی یاریگاکانەوە، وەکئەوەی لە هەولێر و سلێمانی و لەکاتی کۆنسێرتەکانی «زەکەریا»ی گۆرانیبێژدا بینیمان. ئەمەش ئەوە ئاشکرا دەکات کە لە دوای راپەرینەوە میدیاکان و لە ئێستاشدا ئەنتەرنێت، لە ئاستی دیداریدا شەپۆلێکی رەهابوونی سێکسیان خستەگەڕ بەبێ ئەوەی کۆمەڵگا لە ئاستی عەمەلیدا ئاسانکاری بکات بۆ راییکردنی ئارەزووی ئەندامەکانی، ئەمە جگە لەوەی بەبەراورد لەگەڵ هەشتاکاندا سزای کۆمەڵایەتیانەی ئەم دیاردەیە کەمتر بۆتەوە.

***شەملا: ئەی هەستناکەیت پەیوەندیشی هەبێت بەو جیاوازییەی لە تەماشاکردنی کۆمەڵگادا هەیە بۆ جەستەی نێر و مێ؟***

سیوەیلی: بێگومان، خاڵێکی تر بۆ بەردەوامیی ئەم دیاردەیە ئەوەیە کە تۆ باستکرد. ئێمە لەکۆمەڵگایەکدا دەژین کە هەر زوو جەستەی کچان لە کوڕەکان یاساغ دەکرێت و ئایین دەکەوێتە حەرامکردن و بە پیس لە قەڵەمدانی جەستەی مێینە، چونکە سەرچاوەی گوناهە، کۆمەڵگا بەوشێوەیە سەیری دەکات کە ئەمە «حەرەمێکی کۆمەڵایەتیە» و خاوەندارێکی هەیە و تۆ بۆت نییە لێی نزیك ببیتەوە. ئەمە جگە لەوەی کە لە سیستەمی پەروەردەیی ئێمەدا و لە دەرسی زیندەوەرزانیدا، کاتێك دەگەینە وانەی پێکهاتەکانی لەشی مرۆڤ تەنیا کۆئەندامی لەشی نێر دەخوێندرێت و هی مێ ناخوێندرێت! کەواتە سیستەمی پەروەردەش یارمەتیدەر و تەواوکەری هەمان بۆ چوونی سادەو سەر پێیانەی کۆمەڵگایە کەجەستە شتێکە نابێت ئێمە پرسیاری لێ بکەین. کاتێك مرۆڤ نەتوانێت بەشێوازێکی سروشتی ئەو لەشەی کەئارەزووی دەکا، ئاشکرای بکات، رقی لێی دەبێتەوە و دێت ئازاری بەرامبەرەکەی دەدات، چونکە ئەو تا بەرامبەر وەك قەدەخەکراوێك ببینێت هەمیشە ئازاری پێ دەچێژێتو ئەشزانێت، کە لەرێگەی ترەوە ناتوانێت پێی بگا بۆیە بیر لە ئازاردانی دەکاتەوە. خاڵێکی تر کە

نابێت بەسەریدا تێپەڕین بریتیە لە سەرنج ڕاکێشان. ئێمە دەزانین کە نێر و مێ بەهۆی جەستەیانەوە سەرنجی یەکتر ڕادەکێشن و لە فرسەتێك دەگەڕێن بۆ ئەوەی لەساتێکدا لەهەموو کۆنترۆڵە کۆمەڵایەتییەکانو هەموو شەرمە کۆمەڵایەتیو ئایینیەکان خۆیان ڕزگار بکەن و بگەن بە یەکتر. ئەم سەرنجڕکێشانە لای کچەکان حاڵەتێکی پاسیف وەردەگرێت و لە نیگاکردندا بەرجەستە دەبێت، لە کاتێکدا لای کوڕەکان حاڵەتێکی ئاکتیف بەخۆیەوە دەگرێت و دەگات بەوەی دەست بۆ بەرامبەرەکەی ببات کە لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە بە کردەیەکی لادەرانە حسابی بۆ دەکرێت. بە کورتی و پوختی دەستبۆبردن جۆرێکە لە لادانی کۆمەڵایەتی و حاڵەتێکی جەزبە و فەنایە کە نێری خوو پێوەگرتوو ناتوانێت کۆنترۆڵی خۆی بکات و پەلاماری بەرامبەرەکەی دەدات و دەستدرێژی دەکاتە سەر جەستەی و دەیەوێت بۆ چرکەیەکیش بێت خۆی پێوە بنووسێنێت، یان نقورچێکی لێبگرێت. ئەم دیاردەیە دیاردەی کۆمەڵگایەکی ناتاسودەیە کە نەیتوانیوە وزەی سێکسی ئەندامەکانی بەشێوەیەکی سرووشتی ئاراستە بکات و لەبەر ڕەچاوکردنی بەها تەقلیدیەکان ناهێڵێت پێکەوەبوونی ئەندامەکانی دۆخی ئاسایی خۆی وەربگرێت. لەلایەکی تریشەوە هەر لەم کۆمەڵگایەدا و بەهۆی تەلەفزیۆن و ئەنتەرنێتەوە وێناکردنی جەستە گۆڕانی گەورەی بەسەردا هاتووە و ئەمەش لەگەڵ ئەو بایکۆتەدا ناگونجێت کە کۆمەڵگا لەسەر جەستەی داناوە. بۆیە لێرەدا تاکەکان دووچاری ناکۆکییەکی کوشندە دەبن و هوشیاری ئەوان لەسەر پەیوەندیە سێکسیەکان زیاتر دەبێت لەوەی بتوانن بە شێوەیەکی پراکتیکی لە ئەویتر نزیك ببنەوە. بۆیە ئالێرەدا لادانەکان دروستدەبن و خولیای گەیشتن بەئەویتر حاڵەتێکی جنونی بەخۆیەوە دەگرێت و ئەمەش پەیوەندی نیە بە تەمەن و پیشە و پێگەی کۆمەڵایەتییەوە.

***شەهلا:هەندێك پێیانوایە ئافرەت خۆی هۆکارە، ئەگینا بۆچی پەلاماری ئەم ئافرەتە دەدرێت و پەلاماری یەکێکی تر نادرێت؟***

**سیوەیلی:** من پێموایە ئەم بۆچوونە تەنانەت ئەگەر ئافرەتەکان خۆشیان بیڵێن، شەرعیەت دەدات بەو دیاردەیە، کە دیاردەیەکی دزێوە لەکۆمەڵگای ئێمەدا. دەبێت

وریابین بەڵگەیەك نەدەین بەدەست بکەرانی ئەم دیاردەیەوە تاشانازی پێوە بکەن و بڵێن: کچەکان خۆیان بەرەو ئەوە هانمان دەدەن و پێیان خۆشە.. دەکرێت جۆرێك لەخودئازاری لای هەر مرۆڤێك بوونی هەبێت، واتە هەر مرۆڤێك ئارەزووی ئەوەی هەبێت لە کاتی هەستانی کەف وکوڵ و خرۆشانی سێکسیدا ئازاری ئەوانی تر بدات و هەم ئارەزوو بکات ئازار بدرێت، بەڵام دەکرێت ئەمە بە رێککەوتنی هەردوو لایەن بێت و پێویستیشە ئەو دووکەسە یەکتری بناسن، نەك بەوجۆرەی کە دەستدرێژکەرەکان دەیکەن و ئازاری کەسانێك دەدەن کە نایان ناسن و دەیانکەن بە قوربانی. دەکرێت ئەو ئارەزووکردنە بەئازاردانی ئەوانی تر لەکەسایەتی هەموو مرۆڤێکدا هەبێت، بەڵام کام مرۆڤ؟ بێگومان ئەوەی کەدەیناسین و لێی شارەزاین، واتە دوو کەس بڕیار دەدەن لەکاتی پێکەوەبووندا گاز لەیەکتر بگرن، نقورچ لەیەکتر بگرن، لەشی یەکتر بڕننەوە و نینۆك بچەقێننە جەستەی یەکترەوە و بەکورتی لە کاتی پراکتیزە کردنی حاڵەتی ئیرۆتیکیدا لەگەڵ یەکتر توندوتیژی بنوێنن.. بۆیە ناکرێت ئێمە هەموو ئافرەتەکان بەوە تاوانبار بکەین کە خۆیان ئارەزووی ئەوە دەکەن دەستیان بۆ ببردرێت. ئەم شتە راستە لەحاڵەتێکدا کە ئەو کەسەی دەبێتە قوربانی لەگەڵ ئازاردەر یەکتری بناسن، بەڵام ئێمە دەزانین زۆربەی ئەوانەی لەسەر شەقامەکان و ناو بازاڕ و کۆڵانەکاندا پەلاماری خانمەکان دەدەن یەکتری ناناسن، بەلای کەمەوە قوربانیەکە تاوانبارەکە ناناسێت ئەمەش کێشەیەکی گەورەیە، چونکە لەڕووی دەروونیەوە، ئەنجامی خراپ لای قوربانیەکە بەجێدەهێڵێت.

لەبیرمان نەچێت ئێمە لەوڵاتێکداین بیرەوەری ناخۆشمان لەگەڵ ئەم جۆرە «دەست-درێژکردنانە»دا هەیە، واتە دەست لە وڵاتی ئێمەدا، بەتایبەت لای بەعسییەکان دەستێك بووە یا میلی تفەنگی لێهێناوینەتەوە، یا زللەی لێداوین، یا قژی راکێشاوین، یان لە بەندیخانەکاندا بە کێبڵ ئازاری داوین، یاخود دەستی جاسووسێك بووە ئاماژەی بۆ کردووین تا بە گرتمان بدات.. ئەمە جگە لەوەی دەست زۆرجارانیش دەستی باوکێکی بێبەزەیی و مامۆستایەکی دڵڕەق بووە کە دارکاری کردووین. بۆیە ئەگەر دەستمان بەهەڵە بەکار بهێنین، هەموو ئەو وێنانە لەیادەوەریماندا زیندوو

دەبنەوە و ناکرێت بە بکەرانی ئەم دیاردەیە بڵێین: *دەستی ئێوە دەستێکە خۆشیی و چێژ بە قوربانییەکان دەگەیەنێت.* بەڵکو دەبێت پێیانبڵێین: دەستی ئێوە دەستی ئەو تاوانبارەیە کە خانمێکی ڕێبوار لە مرۆڤێکی ئاسایی سەر شەقامێکەوە دەکاتە قوربانییەکی لەخۆ وەڕسی ترساو.

***شەهلا: رایەك پێی وایە بێدەنگ بوونی ئافرەتەکان لەکاتی پەلاماردانەکەدا ئاماژەیە بۆ رازی بوونیان لەبەر ئەوەی پێی خۆشە، تۆدەڵێیت چی؟***

**سیوەیلی:** هەروەکو پێشتر گوتم: دەکرێت لەهەرکەسێکدا چ (نێر یان مێ) جۆرێك لە چێژبینین هەبێت، بەتایبەتی کە کردەکە زۆر بەخێرایی ڕوودەدات و چاوەڕوانکراو نیە. شتی چاوەڕوان نەکراویش بەتایبەتی بۆ زۆنەکانی سێکسیەکانی لەش، چێژبەخشە و مووچڕکە بە لەشدا دەهێنێت و هەر زوو دەبێتە هۆی دروستبوونی کارلێکە کیمیاویەکان لە جەستەی مرۆڤدا.. بەڵام ئەوەی پەیوەندی بەم جۆرە بەریەککەوتن و دەست بۆهێنانەوە هەبێت، من پێموایە دەبێت بگەڕێینەوە بۆ ئەوەی، کە لەهەندێکماندا ئەم چێژە رەنگە زیاتربێت و بەرگەی ئازارەکەیشی بگرین، لە هەندێکی تریشماندا کەمترە لەوەی کە بووبێت بە چێژ و زیاتر ئازاربەخشە. وەلێ من ناتوانم بەناوی هیچ ئافرەتێکەوە قسەی ئەوەت بۆ بکەم، کە ئەو چەندە ئارەزووی لەم مەسەلەیە هەیە و چێژی لێوەردەگرێت. بەڵام تا ئەو کاتەی ئێمە بەڵگەی تەواومان لەبەردەستدا نەبێت ناشتوانین تێگەیشتنێکی ڕاستەقینەمان لەسەری هەبێت، چونکە ئێمە دیاردەکە تەنیا لەزمان ئەو کەسانەوە دەبیستین، کە خۆیان وەکو «قوربانی» دەبیننەوە. هەر ئەوانە دێنە دەنگو چاکیش دەکەن کە دێنە دەنگ. خۆ ئەگەر ئەو خانمانەی کە گوایە چێژی لێوەردەگرن بێنە دەنگ، ئێمە دەتوانین لەسەر وەڵامی ئەوان شیکردنەوە بکەین و تێگەشتنێکی باشتریش لەسەر کەسایەتی بکەرەکان بەدەست بهێنین.

***شەهلا: ئەی ئەو جۆرە کەسانە چۆن پەلاماری خۆشكو دایكو برادەر و کەسە نزیکەکانی خۆیان نادەن؟***

**سیوەیلی:** ئەم پرسیارە زۆر گرنگە: بەبڕوای من ئەو دیاردەیە تا ئەو کاتەی لەدەست درێژیکردنو لە تقورچگرتن و لێبادانو ئەم شتانەدا دەمێنێتەوە، دیاردەیەکە دەبێت لەپەنهانـدابێت، دیاردەیەکـە ئـەم کەسـە زۆر دەترسـێت لەکەشـفبوونی کاراکتـەرە نەعامەییەکەی و هـەروەها پەیوەنـدی بـەو دۆخـە جنسیەشەوە هەیـە کـە ناتوانێـت کۆنترۆڵی بکات. بەڵام لەو کاتەدا کە ئەم کەسە دەتوانێت لەگەڵ کەسـە ناسـیاوەکانی شتی وابکات، دەستیان بۆ درێژناکات، بەڵکو لەوەش زیاتر دەکات و بۆی هەیـە بگـات بە جۆرێك لە جۆرەکانی کردەی لاقەکردن (اغتصاب). ئەو کەسـەی لەسـەر شـەقامێك دەست بۆ کچێك دەبات یان خۆی پێوە دەنووسێنێت و لێی بادەدات، لە ئـانو سـاتدا بڕیاردەدات بەبێ ئەوەی بیری لێبکاتەوە و پلانێکی تۆکمەی بۆ داڕشـتبێ، بـەڵام ئـەو کەسـەی بیـەوێت لەمـەزیاتر بکـات بـەدوای نەناسـراودا ناگـەڕێت و لەسـەر جـادەش ئەوکارە ناکات، بەڵکو کەسێك دەکات بەقوربانی کـە تـوانیبێتی جـوان دیـاری بکـاتو بزانێت ئەو کەسە ناتوانێت قسە بکاتو ترسـێکی وەهـای دەخاتـە دڵـەوە کـە بـوێریی نەبێت ئاشکرای بکات. زۆربەی لاقەکردنەکان هی کەسانی نـزیکن بـۆ کەسـانی نزیکـی خۆیان و لەمەشدا زۆر هۆکار ڕۆڵی خۆیان دەگێڕن کە یەکێکیان شـێوەی پـەروەردەی خێزانی و شێوازی بیناسازیە لە کوردستاندا و ناتوانین لێرەدا قسەی لەبارەوە بکەین. بەداخەوە ئێمە سەرژمێرییەکمان نیە پیشانمان بـدات ئـاخۆ چـەند بـاوك یـان بـرا بـەو شێوەیە لەکچو خوشکی خۆیان نزیك بوونەتـەوە. بـەڵام بـەبڕوای مـن زۆر خەسـڵەت و دەرکەوتەی ڕەفتاری لە مێینەی کوردا هەن، کە ئاشکرای دەکەن دیـاردەی لاقـەکردن لـە کۆمـەڵگای ئێمـەدا زۆرە و قوربانیـەکانیش لـەوە زیـاتر و ئـازاراویترن کـە ئێمـە دەبیستین.

***شـەملا:** بـەڕای تـۆ ڕێگەچارە چییە؟ چۆن ڕووبـەڕووی دیـاردەی دەسـتبۆبردن و تقورچگرتن و خۆپێوە نووساندنی بەزۆر ببینەوە؟*

**سیوەیلی:** یەکەم چارەسەر بەکێشەکردنی ئەم دیاردەیەیە، دەبێت وا تەماشای بکەین کەدیاردەیەکـە جۆرێـك لـە نائاسـودەیی کۆمەڵایـەتیو جۆرێـك لەپـشێوی بـۆ ژیـانی بەشێکی زۆر لەئەندامانی ئـەم کۆمەڵگایـە دروسـتکردووە. پاشـان ئەمـە ببەسـتینەوە

بەوەی کە ئازادیی چوونە بازاڕ و ئازادی بەکارهێنانی جەستەی خۆمان، ئازادی خۆ ڕازاندنەوەو جوڵە و سەربەستیمان لەسەر شەقامەکان سنوردار دەکات. ئەم کێشەیە هەروا تەماشا نەکەین، کە زەوقی کوڕێکی گەنجە و ئەم کوڕە گەنجە بۆی هەیە هەموو شتێك لەهەر شوێنێکدا بکات، کەشوێنی هەموومانە.

هەروەها پێویستە سیستەمی پەروەردە گرنگی بدات بەم دیاردەیە و وەك «دەستدرێژیکردنێك» بۆسەر ئازادی تاك لە بواری وانەی مافەکانی مرۆڤدا بخوێندرێت. ئەمە بێجگە لەوەی کە پێویستە بەسەرجەمی ئەو کتێبانەی خوێندنگاکاندا بچینەوە کە تیایاندا جەستەی مێ بەحەرامکراوە یان بەکەم تەماشا کراوە و سنوورێکی ئەستوور لە نێوان کوڕ و کچەکاندا داندراوە و بەیەکتر نامۆکراون. هەروەها پێویستە لەڕاگەیاندنەکانمانەوە ڕیپۆرتاژی لەسەر بکرێتو قسەی لەسەر بکرێت و هەم بکەران و هەم قوربانییەکان بهێنرێنە دەنگ، تەنانەت ئەوانەش کە گوایە چێژی لێوەردەگرن. زۆرم پێباشە سەنتەر و ڕێکخراوەکانی ژنان و ئافرەتان چەند خەتێکی تەلەفۆن تەرخان بکەن بۆ ئەوەی هەم دەنگی بکەرەکان و هەم قوربانیەکان تۆمار بکرێت و پاشان بدرێتە خەڵکی شارەزا تا بیر لە یارمەتیدانی هەردوو لایان بکرێتەوە. ئەمە جگەلەوەی دەکرێت بە کامێرای شاراوە وێنەی حاڵەتەکە بگیرێت.

بەبڕوای من ڕێگەیەك زیاترمان هەیە بۆ ئەوەی ئەم دیاردەیە بەدەنگ بهێنین و هووشیاریی کۆمەڵایەتی لەسەر دروست بکەین تا ئەم هووشیاریە کۆمەڵایەتیە ببێتە ڕێگرێك لەبەردەم ئەو کەسانەی ئەم کارەدەکەن. چونکە دواجار من پێموانییە بکەرانی ئەم دیاردەیە هەر تەنیا مرۆڤی لەخوانەترس و نەخۆش و ناعەقڵانی و گەنجە سەرەڕۆکان بن. بەڵکو دڵنیام ئەمانە هەمان مرۆڤە لەخوا ترساوەکان، هەمان مرۆڤە خوێندەوار و عاقڵەکان و هەمان مرۆڤە خاوەن پێگە و کامڵ و بەتەمەنەکانی ناو ئەم کۆمەڵگا نەخۆشەی سەردەمی ئێستامانن. کۆمەڵگایەك کە بۆخۆی هاندەرێکی سەرەکییە لە هێشتنەوەی دیاردەکەدا بەوەی کە هیچ نەبێت بواری داوە بکەرەکان بە شانازییەوە باسی کردەوەکەی خۆیان بکەن، کەچی بەگومانەوە سەیری ئەو خانمە دەکات کە دەبێتە قوربانی. خۆشبەختانە هەندێك لە قوربانییەکان جارجارە ئاوڕ دەدەنەوە و بە هەموو هێزی خۆیان تفێك لەناوچەوانی بکەرەکان دەکەن. من پێموایە ئەو تفە ڕووی کۆمەڵگاش دەگرێتەوە..

# نیشتیمان وەك دۆزەخ..

## (سەبارەت بە پرسی لاوەکان)

### وتووێژی: شۆڕش غەفووری

{لاو بەکێ دەڵێن و چۆن پێناسەی بکەین؟ قەیرانی لاوان لە نێوان بەجیهانیبوون و نەریتخوازیدا. جیاوازی نێوان باوکە بایۆلۆژییەکان و باوکە ڕەمزییەکان. بۆچی لاوەکان بێ ئینتیمان و کێ وادەڵێ؟ سەرکوتکردنی غەریزە وەك سەرەتایەك بۆ لادان.}

***غەفووری: با بەپرسیارێکی گشتی دەست پێ بکەین، پێناسەی جەنابت بۆ لاو بە گشتی و لاوی کورد بەتایبەتی چیە؟ ئایا لاوی کورد ئەکەوێتە کام یەك لەو پێناسانەی کە بۆ لاوێکی ئەورووپی ئەکرێ؟***

سیوەیلی: بە بڕوای من بوونی پێناسە بۆ لاو بەپێی ژمارەی کۆمەڵگاکان دەگۆڕێ، هەر کۆمەڵگایە پێناسەیەك، یان زیاد لە پێناسەیەکی بۆ لاو هەیە. واتە لەو بڕوایەدا نیم ئەوە کارێکی زانستی بێ کە ئێمە بێین و یەك پێناسە بۆ لاو بکەین و ئەو پێناسەیەش قابیلی ئەوەبێ کە بەسەر کۆمەڵگاکاندا بیگشتێنین. هەر کۆمەڵگایەك دەشێ پێناسەیەکی تایبەتی خۆی هەبێ بۆ لاو و دەکرێ هەرکۆمەڵگایەکیش لە ڕەوتی مێژوویی خۆیدا پێناسەکانی بۆ قۆناغی لاویەتی بگۆڕێ.. ئەوەی کە دەزانم لە ڕووی زانستییەوە قابیلی گۆڕان نییە و نەگۆڕێکە لەو بوارەدا، ئەوەیە پەیوەندیی

بوونی پێناسەیەك بۆ قۆناغی لاویەتی لە کۆمەڵگاکاندا زۆر پەیوەستە بە تێڕوانینێکی تایبەت بۆ کات و پەیوەندی هەیە بەو تێڕوانینەی کە ئەو کۆمەڵگایە هەیەتی بۆ کات. تێگەیشتنی کۆمەڵگاکان بۆ کات و دابەشکردنی کات لە میانەی تێپەڕینی تەمەنی مرۆڤدا، دەستنیشانی ئەو پێناسانەش دەکات کە کۆمەڵگاکان بۆ قۆناغی لاوێتی هەیانە. چونکە تەمەنی لاوێتیش لە نێو کات دا دابەشدەکرێ و لە کاتدا فۆرمی خۆی وەردەگرێ. هەندێك لە کۆمەڵگاکان پێناسەی لاویەتی بۆ نموونە ئەخەنە قۆناغێك لە تەمەنی مرۆڤەوە کە ئەم قۆناغە بە بەراورد لەگەڵ کۆمەڵگایەکی دیکەدا کە تێڕوانین و تێگەیشتنێکی دیکەی هەیە بۆ کات و دابەشکردنی تەمەن لە کاتدا، گۆڕانی بەسەر دادێ و ئەمەش وادەکا کە جیاوازیی بکەوێتە نێوان پێناسەکانەوە. بەشێوەیەکی گشتی ئەتوانم بڵێم لەو کۆمەڵگایانەی کە مرۆڤ تەنیا و تەنیا وەك ***هێزی کار*** تەماشا دەکرێ، قۆناغی لاویەتی یا نییە، یان زۆر کورتە. ئەمەش لەبەرئەوەی لەو جۆرە کۆمەڵگایانەدا هەر لەبنەماوە نیاز لە نەوە خستنەوە و وەچە دروستکردن، نیازێکی کردەییە و بە نییەتی پتەوکردنی هێزی کارکردنە. هەر لەبەر ئەوەشە لەو کۆمەڵگایانەدا تاکەکەس هیچ سەربەخۆییەکی نییە و وەك بەشێك لە گرووپ دەبینرێ و گرووپیش دەسەڵاتی کۆمەڵگا دەبات بەڕێوە و کۆنترۆڵی دەکات. لەم کۆمەڵگایانە دا تەمەنی لاو زۆر کورتە و مرۆڤ هەر ئەوەندەی توانی دەست بەرێ بۆ بەردێك و سێوەکەی پێ بخاتە خوارەوە و یا ڕەوایەك بەدەستەوە بگرێ و گوێز و بەری درەختەکانی پێ بتەکێنێ_ ئیتر ئەمە قۆناغی لاویەتی خۆی تێپەڕاندوەو پێویستە ببێتە کرێکار، یان دەبێتە ئەو هێزەی کە دەبێ بەشداری بکا لە دابینکردنی بژێوی ژیانی ئەو کۆمەڵەیەی کە تیایدا ئەندامە.. ئەمجا ئەشێ لە کۆمەڵگایەك کە بۆ دابینکردنی بژێوی ژیانی پشت بەڕاوکردن دەبەستێ ئەم لاوە زوو ببێتە ڕاوچییەك و لەو کۆمەڵگایانەشدا کە کشتوکاڵین ئەرکی یەکەمی مرۆڤ بریتیە لە ئاودێری و جوتیاری و شوانکارەیی. گرنگ ئەوەیە تێبگەین کە ئەوە کۆمەڵگایە جۆرێ لە لاو پێناسە دەکات و بەپێی پێویستیەکانی خۆی ڕاپێچیدەدەکاتە ناو ئەو ئەرکانەوە کە بۆمانەوەی خۆی پێویستی پێیان هەیە.

**غەفووری: ئایا ئەم بارودۆخە هەر بەردەوام دەبێت، یاخود له قۆناغێکی مێژووییدا گۆڕانی تێدەکەوێ؟**

سیوەیلی: دەتوانین بڵێین لە دوای سەدەی هەژدەهەمەوە، لە شۆڕشی پیشەسازی بە دواوە و لەگەڵ دروستبوونی مانیفاکتۆر و شێوازی سیستماتیکانەی تەقسیمی کار دا، کە خۆی لە خۆیدا نیشانەی گۆڕانێکیش بوو لە تێکەیشتنی کۆمەڵگا خۆرئاواییەکان لە کات، پێناسەش بۆ قۆناغی لاویەتی دەگۆڕێ. ئاساییە لە هەر کۆمەڵگایەکدا بە زیادبوونی ڕێژەی خۆشگوزەرانی و رەفاهییەت، قۆناغی لاویەتیش درێژدەبێتەوە و ئەمەش نەگۆڕێکی دیکەیە کە نابێت لەبیرمان بچێت. کۆمەڵگا خۆشگوزەرانەکان نایانەوێت پیر ببن و بچنە ساڵەوە، بۆیە لەوێ چ لەرووی تەندروستی و چ لە ڕووی کولتوورییەوە گرنگییەکی زۆر بە لاوێتی مانەوە و درێژکردنەوەی گەنجێتی دەدرێ. تەنانەت پرسیارکردن لە مرۆڤی ناو ئەو کۆمەڵگایانە سەبارەت بە تەمەن، پرسیارێکی نائاساییە و وەك دەست درێژیکردنێك وایە بۆ ناو ژیانی شەخسی. سەبارەت بە کۆمەڵگای خۆشمان دەتوانم بڵێم کە قاچێکمان لە نێو نەرێتدایە و هەنگاوی دووەمیشمان هەڵهێناوەتەوە بەرەو دنیایەك کە بە تەواوی ناتوانین بڵێین دنیایەکی مۆدێرنە، بەڵام چیدی ئەو دنیایەش نییە کە قاچی یەکەممانی تیا چەقیوە. بۆیە لەمجۆرە کۆمەڵگایانەدا ئاسان نییە پێناسەیەکی جێگیر بۆ لاو بدۆزیتەوە.

***غەفووری: لاوی کورد لە رۆژهەڵاتی ناویندا بە قەیرانێکی گەورەدا دەتلێتەوە: لە لایەکەوە بەجیهانیبوون بەرەو لای ئەورووپاییبووندا دەیشکێنێتەوە و لە لایەکی دیکەیشەوە سوننەت و نەریت بە دەست و پێیەوە ئاڵاوە. لەو تەمەنە پڕ لە یاخیگەرییەدا، واتە تەمەنی لاویەتی کە تەمەنێکە پێویستی بە ئازادی هەیە، ئەو لاوە چۆن دەتوانێ بەو ئازادیە بگا کە هێشتا لە نەریتدا نووقم بوە؟***

سیوەیلی: من عەرزم کردی کە لەوە دڵنیاین لاوەکانمان لەنێو سوننەت و قەیرانەکانی سوننەت و پیرۆزی سوننەت دا گیریان خواردوە بەڵام ئەو بەشەی دیکەی من نازانم بەرەو کوێ دەڕوا. ئێمە لە حاڵەتی گواستنەوە و تێپەڕینداین: دەزانین بەشێکی زۆر لە ئازادیەکانی ئێمە بۆنموونە لە لایەن ڕێسا نوسراو و نەنووسراوەکانی نەرێتەوە

ئابلۆوقە دراون و ئازادییەکانی ئێمە لە چوارچێوەی تێگەیشتنەکانی خوودی خۆماندان لە نەریت و بنەماکانی نەریت. دەشزانین کە ئەو ئازادیە سنووردار و مەرجدارە و ئازادییەکەش هێندەی ئەوەی کە بەرژەوەندیی دەرە تاکەکەسیانەی تێدا رەچاوکراوە، ئەوەندە بەرژەوەندی تاکایەتی لەبەر چاو نەگیراوە. هەروەها دەشزانین کە تاکی ئێمە بەتوندی ملکەچە بۆ یاساکانی نەریت و دەشزانین کە نەریت میکانیزمێکی هەمیشە پیرۆزە و هەرکاتێکیش کە باسمان لە پیرۆزیی کرد سنووری ئازادیمان بەرتەسك کردۆتەوە. چونکە *ئازادی، ئازادییە لەدەرەوەی پیرۆزی*. هەرکۆمەڵگایەکیش ئیش لەسەر پیرۆزی بکات و هەموو پەیوەندییەکان راپێچی ژێر دەسەڵاتی بنەما پیرۆزەکان بکات، بە مانایەك لە ماناکان لەدژی ئازادی رەفتاری کردووە. من ناتوانم بە وردی پێت بڵێم کێشەی لاوانی ئێمە بۆ گەیشتن بە ئازادی لە کوێدایە، تەنیا ئەتوانم بڵێم لاوانی ئێمە لە بەربەرەکانییەکی بەهێزدان لەگەڵ تێڕوانینی نەریت بۆ جەستەی خۆیان. نەریت پێت دەڵێ دەبێ تۆ جەستەیەکی داپۆشراوت هەبێ و خاوەنی جەستەیەکی شەرمن و کەسایەتیەکی داشکاوە و سەرشۆڕ بیت. دەبێ کاراکتەری کەسایەتی تۆ پڕ بێ لە ملکەچی و خۆبەخشی و لە هەموو ئەو رەفتارانەی کە گرووپ رازی دەکات. بەمدیوی تردا هۆشیاری لاوانی ئێمە لە ئاساتێکدایە کە دەیهەوێ خۆی بێ و کەمتر پەنا بەرێ بۆ شەرم و سەرشۆڕی و شکانەوە و ئەمجۆرە شتانە.. ئالێرەدایە کە هەست بەوە دەکەین لاوانی ئێمە هۆشیارییەکی کەمیان پەیدا کردوە، سەبارەت بەو گوشارە گەورەیەی کە دەسەڵاتی نەریت دەیخاتە سەری و لە لایەکی تریشەوە لە دوور را رۆشنایییەك دەبینێ کە ئازادی ئەوی تیا دیارە. بۆیە من پێموایە هەنووکە و ئێستا ئەو ساتەوەختەیە کە بۆ لاوی ئێمە قەیراناویترین ساتەوەختە و بەخۆڕایی نییە کە لەو قۆناغە مێژوویەی ژیانی سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی ئێمەدا، لاوەکان لە زۆر شت کەنارەگیرن. تەنانەت زۆرترین رێژەی لاوەکانمان خەونی چوونەدەرەوەیان هەیە و زۆرترین رێژە بەکوڕ و کچەوە لە دژی ئەوەن پێکەوەبژین و پەیوەندییان هەبێ، زۆرترین لاوەکانی ئێمە بەرەو داخران و هەندێ حاڵەتی دەروونی و تایبەت دەڕۆن و تووڕەییان پێوەدیارە،

ناتوانن دڵخۆشبوونی خۆیان بەرجەستەبکەن. جگەرەکێشان و خۆکوشتن و خۆسووتاندن تیاندا زیادی کردووە. هەموو ئەمانە پێماندەڵێن لەلایەکەوە ئەو ئازادیانەی نەرێت بۆ مرۆڤی لەبەرچاو گرتووە بایی ئەوەندە نین کە وەڵامگۆی خواستەکانی لاوان بن، لەلایەکی دیکەشەوە لاوانی ئێمە دەسەڵاتی ئەوەیان پەیدا نەکردوە کە بەو ڕۆشناییە دوورە بگات کە ئازادی خۆی تێدا دەبینێتەوە. بۆیە من پێموایە هەنووکەی ژیانی لاوانی ئێمە قەیراناویترین ساتەوەختە لەڕووی دەروونناسیەوە. ئەگەرچی قۆناغی لاوێتی بۆخۆی پڕە لە قەیران چونکە جۆرێك لە گەشەی فیسیولۆجی و جەستەیی لە ئێمەدا دروست دەبێ، بۆ نمونە موو دەردەکەین، بەتەواوی هەست بەجیاوازی فیسیولوجی خۆمان، کوڕ لەگەل کچدا دەکا، هەستدەکەین بووینەتە ئۆبژەیەك بۆ چاوەکانی کۆمەڵگا، چاودێری دەکرێین و هتد. ئەمانە هەموو قەیرانن، بەڵام ئەم قۆناغە لەکۆمەڵگای ئێمەدا بۆ لاوەکان دووجار بۆتە قەیران: جارێك لەبەر ئەوەی لاوەکانی ئێمە ئەم بارودۆخە فیسیولۆجیە تەی دەکەن و جارێکیش لەبەرنەبوونی تێگەیشتنێکی ستاندارد و جێگرتوو بۆ چەمك و دیاردەی لاوێتی لەکۆمەڵگاکەماندا. کەواتە نەبوونی پێناسەیەك لەکۆمەڵگای ئێمەدا بۆ لاو، وایکردوە ئەو کائینە یاری پێبکرێ و ڕۆژانە لەلایەن دەسەڵاتە جیاوازەکانی کۆمەڵگاوە، بخرێتە بەردەم سزای جۆربەجۆر. ئەمەش دیسان قەیرانێکی ڕۆحی و مەعنەویی بۆ لاو دروستدەکات و ئەوان هەستدەکەن کە دەسخەڕۆ ئەکرین و بەردەوام وا دەزانن کە درۆیان لەگەڵ دەکرێ و لە هەموو کایەکان و بوارەکانی خۆسەلماندندا بەپەراوێز دەکرێن. ئەمەش وایکردوە کە گەنج بەدوای ئەڵتەرناتیڤێکی دیکەدا بگەڕێ، واتە لەواقیعدا ئەو لاوەی کەبیر لەخۆسووتاندن یا خۆکوشتن دەکاتەوە، شێت و بێعەقڵ نییە، بەڵکو ئەمە ئەو ڕێگایەیە کە خراوەتە بەردەمی و بەرەو ئەوێ ئاراستە کراوە. وەختێك کە تۆ لەهیچ شوێنێکدا تەعریف ناکرێی و کاتێك پرس بەتۆ ناکرێ و بەشداریت پێناکرێ، ڕێگات لێتێك دەچێ و بەناچاری ئەو ڕێگایە هەڵدەبژێری کە نەخۆت بە دڵتە و نە ڕێگایەکیشە بەو ئامانجانەت دەگەیەنێت کە کۆمەڵگا دەستخۆشانەت لێبکا. لاوەکانی ئێمە تەنانەت بە سووتاوی و موعتادی و مەعلوولیش

لۆمە دەکرێن و ڕوویان دەشکێنرێ و کۆمەڵگا لە تێڕوانینیدا بۆ لاوەکان ئەو بارودۆخە بابەتیەی بیر دەچێ کە هەر بۆخۆی خولقاندوویەتی و ڕۆژگاری لاوەکانی بەو دەردە بردووە. بۆیە من پێموایە ئامادەیی نەرێت و بنەماکانی نەرێتپەرستی لە کایەی سیاسی و دینی و ئەخلاقی و کۆمەڵایەتییەکانی ئێمەدا ڕێگرێکی سەرەکییە لەبەردەم دروستبوونی زدینییەتێکی نوێ و گوتارێکی لاوانەدا. ئەو کایانە چەندە لەبەینی خۆیاندا دژایەتیان هەیە، بۆ نموونە لەنێوان سیاسییەکی سێکۆلاری (علمانی) و ئاینیەکی سەلەفیدا چەندە دژایەتی هەیە، بەڵام لە لێدانیاندا لە لاوەکان و لە دووبارەکردنەوەی میکانیزمەکانی دیدی نەرێتگەرایانەدا، ئەوانە لە دژی لاوەکان یەکدەگرن. ئەمەش وایکردووە ئەوڕۆکە لاوەکان بەرەیەکی تەنیا و بێکەس و بێگوتار بن و لە هەموو لایەکەوە هێرشیان دەکرێتە سەر. کەمتەرخەمی ئەوانیش لە داڕشتنی گوتارێکی تایبەت و. ستراتیژێکی خەبات و لاوازییان لە بواری تیۆریزەکردنی کێشەکانی خۆیاندا، هێندەی تر قەیرانی لاوەکانی خەستکردۆتەوە.

***غەفووری: لەلایەکەوە کە لاوانی دوێنێ کەباوکانی ئەمڕۆکەن و لەلایەکی دیکەیشەوە وادەکەن کە لاوەکان پەیڕەوەی هەندەمران بن و ئەوێ بەجەنەتێك دادەنێن کەبەمەیلی خۆیان ئارەزوو و خەونەکانیان بخەنەکار و میوایەتەکانیان بێتە دی. ئایا لاو چۆن دەتوانێ لەباوکی نەچێ و نەبێتە ئەو باوکەی دوێنی کە خەریکی چەوساندنەوە بوو؟ هۆکاری ئەوەی کەمن لە باوکم نەچم چیە؟***

سیوەیلی: با لەوێوە دەستپێبکەم ئەوگەنجەی پێیوایە کە جەننەت لەدەرەوەی ئەوکەش و زەمینە کۆمەڵایەتیەیە کە خۆی تێیدا دەژی، ئەوا بەهەڵەدا چووە. بەبڕوای من جەننەت لەسەر زەوی نییە و مەفهومیکی ئایینیە و مژدەیەکە لە زۆربەی ئایینەکاندا بەمرۆڤ دراوە، ***ناشوێنیکە*** لەدەرەوەی دنیای ماتەریاڵی وەدەرەوەی ئەم جیهانە، کە لە ڕوانگەی ئایینیەوە جیهانێکی فانی و بێمانایە و جیهانێکە بۆ تاقیکردنەوەی بەندەکای یەزدان. کەواتە ئەو کەسەی ئێرە بەجێدێڵێ لەدۆزەخەوە ناچێ بۆ بەهەشت بە قەدەرئەوەی لەشوێنێکی جوگرافییەوە دەچێت بۆ شوێنێکی جوگرافیی دیکە. ئەشێ هەندێ گۆڕان و جیاوازیی لە مابەینی دووشوێندا هەبێ و

ئەوەش دیسان زۆر ئاساییە کە مرۆڤ حەز بەسەفەر و شوێنگۆڕکێ بکا، چونکە ئەمە بەشێکە لەو خەسڵەتەی کە نەك هەر لەگەڵ مرۆڤدایە، بەڵکو حەیواناتیش بەردەوام لە شوێنگۆڕکێ و گەرمیان و کوێستاندان. بۆیە نابێ ئێمە لۆمەی ئەوکەسە بکەین کە ئێرە بەجێدێڵێ و وابزانین کەسێکی خراپ و بێ ئینتیمایە. بەڵام ئەگەر ئێرە بەجێ بێڵێ بەو نیازەی ئێرە دۆزەخە و پێیوابێ دەچێ بۆ شوێنێکی بەهەشتی، ئەوە بەهەڵەدا چووە. *بەڕای من (ئەمەش لە ئەزموونەوە دەڵێم)، ئەگەر نیشتیمان ناخۆشترین دۆزەخ بێت، خۆشترە لەو بەهەشتەی کە پێتوایە لە وڵاتێکی تردا بۆت دەڕەخسێ.*

سەبارەت بەوەی چۆن بەباوکەکانمان نەچین، بەڕاستی من هیچ پێشنووسێکم لەو بارەیەوە لەبەر دەستدا نییە. باوکانی ئێمە ئەگەر مەبەستمان لە باوکە بایەلۆجیەکان بێ شتێکە و ئەگەر مەبەستیشمان باوکی ڕەمزیی بێت، ئەوە شتێکی ترە. لەگەڵ ئەوەشدا چەمکی باوك لە وڵاتی ئێمەدا زۆر خراپی بەسەر هاتووە: لەڕوویەکەوە باوکانی بایۆلۆژی خۆمان دەبینین هەندێکیان میهرەبانن و هەندێکیان نامیهرەبانن و هەندێکیان شەهیدکراون و هەندێکیشیان ئەنفال و کیمیایی بارانکراون و تەنیا لە یادوەری خێزانەکانیاندا زیندوون، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی کەباس لەباوك دەکرێ باس لە نامیهرەبانیەکەیەتی و ئەمەش پەیوەستە بەبارودۆخی خێزانییەوە. کەواتە ئەوەی ئێمەی هەراسانکردووە باوکی ڕەمزییە، یان باوکە وەك ڕەمزی دەسەڵات و باڵادەستی. بۆ ئەوەی لەو باوکە نەچین باشتر ئەوەیەکە لە شوێنێکەوە دەستپێبکەین، ئەویش ئەوەیە لە خۆمان بپرسین: چ خەسڵەت و دەسەڵاتێکی سیمبولیك لەودا هەیە کە من نامهەوێ دووبارەی بکەمەوە؟ بەلای منەوە گرنگە لاوەکان کە دەیانەوێ نوێنەرایەتی بزاڤێك بکەن و پەیوەندییەکان بگۆڕن، لەپێش هەموو شتێکدا هەوڵبدەن نوێنەری خۆیان بن و هەوڵبدەن لەخۆتێگەیشتن و خودناسی بکەنە بەرنامەی ژیانی خۆیان. ڕاستە خودناسی چەمکێکی نەختێ عیرفانیە، بەڵام لە خۆ تێگەیشتن مەبدەئیکە و دەستپێکێکە بۆ ئەوەی ئێمە لەڕێگە تێگەیشتن لە خۆمانەوە لە کەسانی دەوروبەرمان تێبگەین و ئەمەش پەیوەندی بە هوشیاری

ڕۆشنبیری ئێمەوە هەیە. واتە چەندە ئێمە لە خۆڕۆشەنبیرکردندا قاڵ ببینەوە بەبڕوای من ئەوەندە هەنگاومان ناوە بەرەو لەخۆتێگەیشتنمان. مرۆڤیش کە لەخۆی تێدەگات مرۆڤیکە ئۆرگیناڵ و یونیك و دانسقەیە و مرۆڤێکە نە تەقلیدی کەس و نە پەیڕەوی لە کەس دەکات. کێشەیەکی گەورەی گەنجەکانی ئێمە ئەوەیە کە نازانن ***دانسقەییبوون*** و ***تاکبوون*** ڕێگایەکە بەرەو نەریتشکێنی و خۆبەدوورگرتن لە لاساییکردنەوە. باوکانی ئێمە لە شوێنێکدا باوکانێکی خراپ و توندڕەوون، لەبەر ئەوەش نەیانتوانیەوە لەو چوارچێوەیە دەرباز بن کە نەریت چاوەڕێی کردووە ***باوك*** تیایدا پراکتیزەی دەسەڵاتی خۆی بکات. بەڵام لە شوێنێکدا کە تۆ هەم باوکی و هەم ڕەمزی دەسەڵاتی وەلێ نەریتشکێنی دەکەی ئەوە توانیوتە هەم گۆڕزێك لەو نیزامی باوکبوونە بووەشێنی و هەم لەو زەمینەیەش ڕزگار ببیت کە باوکانی پێشوو تێدا چەقیبوون. لێرەوە خۆناسین دەبێتە پرۆژەیەك بۆ لاوەکان و تاکەکان کە هەنگاوی یەکەمی سەرکەوتنی ئەو پرۆژەیە ئەوەیە لە کەسیتر نەچین و دانسقەییبوونی خودی خۆمان بەدەستبهێنینەوە. کولتووری گەنجانە ئا لەم هەنگاوەوە دروستدەبێت.

***غەفووری: بۆچی منی لاو بێ ئینتیمام سەبارەت بە نیشتمان و خاکەکەم؟***

سیوەیلی: ئەمە قسەی ئەو گوتارەیە کە ترسی هەیە لە لاوەکان و دەیەوێ بەم تۆمەتە ڕووشکێن و بێدەنگیان بکات. بەلای منەوە ئینتیما و پابەندێتی لەسەر چەند بنەما و قۆناغێکەوەیە. یەکەمجار کە چاو ئەکەیتەوە ئەشێ لە ناو ماڵێکدا بێت یان لە گوند و گەڕەك و شارێکدا بێت. بایی ئەوەندەی ئەو چاوکردنەوەیە ڕێگامان دەدات ئەوەندەش ئینتیمامان هەیە بۆ ئەو شوێنە، ئەمەش ئاستێکی بۆ ماوەیی ئینتیمایە. ئاستێکی دیکەی ئینتیما بریتیە لە ئینتیما بۆ وڵاتێك و ژیانی هاوبەش و سێمبوولە نەتەوەییەکان. ئەمە پەیوەندیی هەیە بە هوشیاریی نەتەوەییەوە و ئەگەر لەمەدا لاوەکان ئینتیمایان لاوازە، ئەوە هەر بەتەنیا بۆخۆیان لێی بەرپرسیار نین. ئەگەر ئەو ئینتیمایە بە قەولی جەنابت لەلای لاوەکان نییە، ئەوە لەبەر ئەوە نیە کە ئەوان ناتوانن و نایانەوێ هەیانبێ. لەبەر ئەوەیە کە ئەو زەمینانەیان بۆ نەڕەخساوە تا وەکو هوشیارییەك لەلایان سەر هەڵبدات و لەوێوە بتوانێ وەك لاوێکی خاوەن ئینتیما

بە نیشتیمانی خۆیەوە، وجودی خۆی بسەلمێنێ. واتە پێویستە هۆکارە بابەتیەکانی لاوازبوونی ئینتیمای لاوەکان لەبیر نەکەین، کە بەشێکی پەیوەندی هەیە بە ئاکامەکانی شەڕی نێوخۆ و نەبوونی پێگە بۆ لاوەکان لە گوتاری سیاسیدا و بەکارهێنانی گەنجەکان لەو ململانێیانەدا کە ململانێی ئەوان نین. بەشێکی دیکەیشی پەیوەندی هەیە بە مێژووی دوور و نزیکی ئێمەوە. ئێمە لە وڵاتێکدا دەژین کە یا داگیرکراوین یان ئەو دەرسانە فێرکراوین و ئەکرێین کە باس لە وڵاتی ئێمە ناکەن. تۆ دەبێ لەگەڵ زمانی زگماکی خۆتدا زمانێکی دیکە فێر ببی و بەمەش زمانی تۆ لە پەراوێزدا دەمێنێتەوە. تۆ مێژوویەك ناخوێنیت کە مێژوویەك بێ پەیوەستی بکەیەوە بە ئێستای خۆتەوە، تۆ مێژووی خەڵکانێك دەخوێنی کە مێژووی تۆ نیە و مێژوویەکە جیاوازترە لە ڕابردووی نەتەوەیی خۆت، بۆیە لاوەکان ناتوانن لەسەر بنەمای مێژوویشەوە کەسانێکی بێ ئینتیما بن. بۆ ئەوەی تۆ وەك لاو ئینتیمات هەبێ پێویستە ڕۆشنبیرییەکی سیاسی ڕەواجی پێبدرێ کە بتبەستێ وڵات و مێژووی هاوبەش و زمان و ڕەمزە هاوبەشەکانەوە و ئەمەش بەشێوەیەکی بێلایەنانە فێر ببیت، نەك هەر ڕۆژە ناچارت بکەن لە گەرووی ئەم حیزب و ئەو گەرایشی سیاسییەوە قوتبدرێیت و یەق بکرێییتەوە. نەبوونی پرۆژەیەکی رۆشنبیری هەمەلایەن تا بیخەیتە بەردەم تاکەکان، وادەکات کە وابەستەبوونی ئێمە بە کۆمەڵگا و نیشتمانەوە زۆر لاواز بێ و لێرەشەوە دەڵێم مەسەلەی ئینتیما شتێك نییە هەبێت و لە جەستە و ڕۆحماندا چێنرابێت. شتێکە دەبێ تۆ ئیشی بۆ بکەی و بیچەسپێنی. بۆنموونە سەبارەت بە گەنجێ کە لە قۆناغی زانکۆدایە، پێویستە وەك دامەزراوە کاری لەسەر بکەیت تاکو زانستی خۆش بوێت، ئەگەر کارت بۆ ئەمە نەکرد چۆن داوای لێدەکەیت زانستیانە بیربکاتەوە و چۆن ڕێگە بەخۆت دەدەیت کە ڕخنەی لێبگری بەوەی کە ئینتیمای نییە. هەروەها سەبارەت بە ئینتیمای نەتەوەییش دەتوانین بڵێین کاتێ بەدرێژایی چەندین شۆڕش و ڕاپەڕین کار نەکراوە بۆئەوەی هەستی نەتەوایەتی لاوەکان بەرز بکرێتەوە و ئینتیمای حیزبایەتیت خستە سەرەوە و بەناوی نەتەوەوە جۆرەها گەمەت کردبێ، چۆن گەنجێ ئینتما دەکات بە نیشتمانەوە؟ تۆ بەو

کردەوانەت گەنجێکت بەرهەمهێناوە ئامادەیە لەهەر ساتەوەختێکدا لەپێناوی بەرژەوەندیە شەخسییەکانی خۆیدا، بەرژەوەندیە گشتییەکان وەلاوە بنێ و لەهەر ساتەوەختێکدا خیانەت بکا و لەهەر ساتەوەختێکدا بەشداری شەڕە حیزبیەکان بکات و لەهەر ساتەوەختێکدا تێگەیشتنێکی هیومانیستانە و مرۆڤدۆستانە بگۆڕێ بۆ تێگەیشتنێکی فاشیانە و ستەمکارانە.. کەواتە نەبوونی پرۆژەیەك بۆ دروستکردن و تێگەیشتنی نەتەوە وایکردووە کە گەنجەکانی ئێمە ئەمڕۆ تەنانەت تاوانبار بکرێن. ئەمەش هێندەی ئەوەی ڕووی گەنجەکان دەگرێتەوە زیاتر بەرەو ڕووی ئەو دەسەلاتانە دەبێتەوە کە لە کۆمەڵگادا ئیشیان نەکردوە.

***غەفووری: غەریزە ئەگەر لە لایەك لە لاودا سەرکووت بکرێ ڕەنگە تووشی کێشەی رۆحی ببێ بەلام لە لایەکی تریشەوە ئەگەر سەرکووت نەکرێ ئەوا بە کەسێکی کافر و لەرێ لادەر لە قەڵەم دەدرێ، بە تایبەت لە لایەن کۆمەڵگای تەقلیدی و نەریتپارێز و دینیەکانەوە، تۆ چۆن دەڕوانیتە ئەو مەسەلەیە؟***

سیوەیلی: لە کۆمەڵگایەکی وەکو ئەوەی ئێمەدا کە هەر گۆڕانێك بەرەو ئازادبوون بە خیانەت لە ئاستی خۆیدا لە قەڵەم دەدات و بە دەستدرێژییەکی دەزانێت بۆسەر پیرۆزیەکانی، لە کۆمەڵگایەکدا کە پیرپەرەست و لە کۆمەڵگایەکدا کە نەریتە نەنووسراوەکانی لە یاسا نووسراوەکان بەلاوە مۆدێرنترە، لە کۆمەڵگایەکدا کە کار لەسەر یادەوەرییەکی بەپیرۆزکراو دەکات، غەریزە یەکێکە لە چەپێنراوەکان. لەوجۆرە کۆمەڵگا تەقلیدیانەدا زۆر هەوڵدەدرێ کە غەریزە بخرێتە ژێر کۆنترۆڵی میکانیزمێکەوە کە ئەشێ ناوی بنێین میکانیزمی ڕێوڕەسمەکان. هەموو ڕێوڕەسمە کۆمەلایەتییەکان جۆرێکن یا شێوازێکن لە کۆنترۆلکردنی غەریزەکان، غەریزە وەك ئەوەی کە دەبێ بەرجەستە ببێ لە کۆمەڵگای نەریتخواز و داخراودا، نەفرەت بەرهەم دەهێنێ. هێزێکی شەڕانیە ئێمە لە شەیتان و لە ئیبلیس و لەدەجال و هەموو شتە ناشیرینەکان نزیکدەخاتەوە. بۆیە دەبێ غەریزە وەك هێزێك کۆنترۆڵ بکرێ. بەلام کۆمەڵگای تەقلیدی چۆن کۆنترۆڵی غەریزە دەکا؟ بێگومان لە ڕێگەی ڕەوایەتیدان بە ڕێوڕەسمەکانەوە. ڕێوڕەسمەکان ئەو میکانیزمی پەیوەندیانەن یا ئەو شێوازانەی

پێوەندین کە بەجەستەکراون و جەستە ناچار دەکەن بەپێی بەرژەوەندییەکانی نەریت بچێت بەڕێوە. ئالێرەدایە دەبێت ئێمە ئەو پرسیارە بکەین کە بۆچی ئەوەندە ڕێوڕەسممان هەیە؟ ئایا ئەم هەموو مەراسیمەی ئێمە لە ژیانی ڕۆژانەی خۆماندا هەمانن، بەڵگە نین بۆ ئەوەی ئێمە لە کۆمەڵگایەکی تەقلیدیدایین و بەبێ ئەوەی بە خۆمان بزانین هەر لە ڕێگای ڕێوڕەسمەکانەوە دێین خۆمان دووبارە دەکەینەوە. بۆ نمونە تۆ دەبێ لەئاست گەورەکاندا شەرم بتگرێ. شەرم هەمیشە بەشێك بووە لە دەسەڵاتی بەجەستەبووی نەریت و هەوڵی دزینی خودێتی مرۆڤی داوە بۆ ئەوەی ملکەچی بکات و هیچ وەختێکیش خودێکی ملکەچ خودێکی کامڵ و سەربەخۆ نیە. کەواتە لە سادەترین ڕەفتای ڕۆژانەمانەوە ڕێوڕەسم جێبەجێ دەکەین کە تیایاندا نە ڕەچاوی دروستبوونی خۆمان وەك تاکەکەس، بەڵکو ڕەچاوی بەرژەوەندیی نەریتە کۆمەڵایەتیەکانی کۆمەڵگا دەکەین. ئەمەش وایکردوە کە غەریزە وەك یاساخێك دەربکەوێ و بەهەڕەشەیەك بۆسەر کۆمەڵگا لێکبدرێتەوە، کەواتە پێویستە بچەپێنرێ و بێگومان چەپاندنی غەریزەش نەخۆشی دەروونی و ڕەفتارپشێوی بەرهەم دەهێنێ. دیارە لەوانەش مەترسیدارتر ئەوەیە کە چەپاندنی غەریزە هۆکارێکی ڕاستەوخۆی بەرهەمهێنانی توندڕەویشە بەتایبەتی لەلای لاوەکان. ئەوانەی لەسەر ئازادکردنی غەریزە تۆمەت دەدەنە پاڵ لاوەکان، جگەلەوەی لەئاست بەشێکی گەورەی مافی ژیانی مرۆڤدا نابینان، ئەوە دەستیان بەو خوێنەش سوورە کە توندڕەویی بەرهەمی دەهێنێ. قسەنەکردن و نەبوونی ڕۆشنبیرییەکی جەستەیی و سێکسی لە سیستەمی پەروەردەیی ئێمەشدا هەر توندڕەوی بەرهەم دەهێنێ. بۆیە ئەو هێزە سیاسی و کۆمەڵایەتیانەی کە ناهێڵن جەستە و غەریزەکان ئازاد بن، بۆخۆیان ڕۆڵێکی ئاشکرایان هەیە لە ئاراستەکردنی لاوەکاندا بەرەو جۆرەکانی توندڕەوی و بەبڕوای من بەرلەوەی لاوەکان تاوانباربکرێن، پێویستە ئەو هێزانە ڕیسوا بکرێن کە زەمینەی توندڕەوی لە کۆمەڵگادا دەسازێنن، ئەویش بەوەی کە ناهێڵن کۆمەڵگا لە داخران ڕزگاری ببێت و بەرەو کرانەوە و ئازادکردنی خۆی بڕوات.

# خۆپیشاندان لە نێوان نۆرم و مۆڕاڵدا

(جیاکارییەك بۆ خۆپیشاندانی مەدەنی و کاری ئاژاوەگێڕی )

## گفتوگۆی: گۆران شێخ مستەفا

{ئایا ئەوەی لە هەڵەبجە ڕوویدا ئاژاوەگێڕیی لاوەکان بوو بە فیتی ***دەستێکی نادیاری رەش***؟ بۆچی ئەو بۆچوونە هەڵەیە؟ خۆپیشاندان وەك یەکگرتنی دەنگەکان لە کۆدەنگیدا. کێ ئاژاوەگێڕە و کێ خۆپیشاندەرە؟ توندوتیژی و خۆپیشاندان. خۆپیشاندان وەك دەرکەوتەی هووشیاریی مەدەنی. ململانێی نەوەکان و بەرجەستەبوونی لە خۆپیشاندانەکاندا}.

***گۆران: ئەم خۆپیشاندانانەی کوردستان چۆن دەبینی؟ لە کاتێکدا لەلایەن دەسەڵاتەوە تێکڕای خۆپیشاندانەکان بە بوونی دەستێکی تر تاوان بارکراوە و لێکدراوەتەوە، واتە بۆتە کولتوور، ئایا گۆڕانی ئەم کولتوورە لە لای سیاسیەکان کەی بەرەو کولتوورێکی دیموکرات و کراوە دەچێت؟***

ڕێبوار: دیارترین فۆرمی ئەم خۆپیشاندانانەی لە کوردستان دەیانبینین ئەوەیە بێئەوەی پێش زەمینەیەکیان بۆ بڕەخسێ ڕوویانداوە، بە گریمانەیەکی زۆریش بۆ زۆربەیان هەوڵدراوە مۆڵەت وەربگیرێ. ئەم فۆڕمە لە خۆپیشاندان شتێکە لە هەموو جیهاندا باوە: گرووپە جیاوازەکانی کۆمەڵگا کە لەجیاوازیدان لەگەڵ ئەو بەها سیاسی و کۆمەلایەتی و هەلومەرجە ژیانیانەی لەئارادان و چاوەڕوانیەکی تایبەتیان لە

دەسەڵات هەیە بۆ ئەوەی هەستێ بە گۆڕانکاری، هەڵدەستێ بە ڕێکخستنی ئەمجۆرە خۆپێشاندانانە، کە لەبنەمادا ئامانج لێیان بریتیە لە یەکخستنی تاکە دەنگەکان لە دەنگێکی گەورەتردا و پێکهێنانی کۆدەنگی لەسەر کێشەیەك کە پەیوەندی بە گوزەران و بیروڕای ئەوانەوە هەیە. بەم مانایە خۆپیشاندان هیچ نییە جگە لەوەی تۆ دەتەوێ بە دەنگێکی بەرز گفتگوگۆ لەگەڵ دەسەڵاتدا بکەیت. واتە هەوڵدەدەی ئەو شتەی کە مەبەستتەو لەئاستی تاکەکەسیدا کەس گوێت لێ ناگرێت، لە چوارچێوەی گوتارێکی دەستەجەمعیدا بەرجەستە دەکەیت و لە فۆرمی خۆپێشاندانداندا دەریدەبڕیت. ***خۆپیشاندان*** وەك لەمانای ئەم دەستەواژەیەدا دیارە، ئاشکراکەری هەبوونی ئەو (خود)انەیە کە دەیانەوێ لە یەکەیەکی گەورەتردا خۆیان ئاشکرا بکەن و دەربکەون. (خود) کاتێ بیەوێ دەربکەوێ و ئیرادەی خۆی ئاشکرا بکات، خۆی پیشاندەدات و خۆپیشاندان دەبێتە شێوازێکی خۆدەربڕین کە ئامانجێکی سیاسی لەپشتەوەیە و ئەویش بریتیە لەهەوڵدان بۆ گفتوگۆکردنێکی مەدەنیانە لەگەڵ دەسەڵاتدا، بریتیە لە بێدارکردنەوەی دەسەڵات لە ئاست بوونی خۆیدا، بریتیە لە دەروەستکردنی دەسەڵات لە بەرامبەر مانەوەی خۆیدا. فۆرمی خۆپیشاندان لە بنەمادا هەوڵدانی خودە کۆمەڵایەتی و گونجاو و ناڕازییەکانە بۆئەوەی دەسەڵات لەو نارەزایەتیانە هووشیار بکاتەوە، کە لە کۆمەڵگادا دروستبوون. بەم مانایەش خۆپیشاندان، پیشاندانی هێزێکی ناکۆکە لەناو کۆمەڵگادا، نەك خۆدەرخستنی هێزێکی دژ و دووژمن بە کۆمەڵگا. ئەوانەی لە ئاست کۆمەڵگا و سیستەمی سیاسیدا خۆیان پیشاندەدەن، زۆرجیاوازن لەوانەی لە تاریکاییەکانی کۆمەڵگادا نەخشە و پیلانی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵگا و سیستەمە سیاسییەکەی دەکێشن. ئەگەر دەسەڵات لەم ڕوانگەیەوە تەماشای خۆپیشاندانەکانی کرد، ئەوە بێگومان نوێنەری خۆی دەنێرێتە لای خۆپیشاندەران بۆئەوەی گوێ لە داخوازییە ڕەواکانیان بگرێ و پەیمانیان پێدەدات کە بەدواداچوون بۆ داواکارییەکانیان بکرێ، یان دەمودەست جێبەجێ بکرێن. لێرەوە خۆپیشاندانەکە پەیامی خۆی دەگەیەنێ و خۆپیشاندەران

لەڕووی دەروونییەوە دەچنە قۆناغی چاوەڕوانیکردنەوە و خۆپیشاندانەکە کۆتایی پێدێت.

ئەگەر چاوێ بەو خۆپیشاندانانەی لە ماوەی شەش ساڵی رابردوودا لەم دەڤەرەی ئێمەدا ڕوویانداوە بخشێنین، دەبینین لە بنەمادا ئامانیجیان بەرهەمهێنانی توندوتیژی نەبووە، خۆپیشاندانی دووژمنانە نەبووە، هێندەی ئەوەی ئامانجیان قسەکردن بووە لەگەڵ دەسەلات. بەڵام بۆچی خەریکە گوتارێکی نەیار بەم فۆرمەی خۆپیشاندان بەرهەمدەهێنرێ، کە لە هەوڵی سیماگۆڕی و شێواندنی نییەتمەندیی خۆپیشاندەراندایە؟ بۆچی ئەم گوتارە کە لەلایەن ڕاگەیاندن و قسەکەرە ڕەسمییەکانی حیزب و حکومەتەوە گەڵاڵە دەکرێ، خۆپیشاندەران بە خەڵکانی توندوتیژ و ئاژاوەگێر پێناسە دەکات، لە کاتێکدا یەکەم، مەرج نیە ئەوانەی لە خۆپیشاندانەکاندا توندوتیژانە هەڵسوکەوت دەکەن، ئەو توندوتیژیە مەبەستیان بێت، هێندەی ئەوەی پەرچەکردارییانە. دووەم، مەرج نییە هەموو توندوتیژییەك ئاژاوەگێڕانە بێت و سێیەم، مەرجیش نییە ئاژاوەگێڕان یەکسان بێت بە خۆپیشاندان چونکە خۆپیشاندان فۆرمێکی خۆدەربڕینی باش نییە بەلای ئاژەوەگێڕانەوە؟!.

بەبڕوای من هۆکاری ئەو تەفسیرەی لایەنی ڕەسمی بۆ خۆپیشاندانەکانی دەکات، بەپلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ ماهییەتی ئەوەی لە وڵاتی ئێمەدا بە (دەسەڵات) ناوی دەبەین و لە بنەمادا (هێز)ە. هەتا حیزب لەسەرووی هەموو شتێکەوە بێت، هێز ناتوانێت ببێت بە دەسەڵات. ماهییەتی هێز بریتیە لە بردنەوە، سڕینەوە، تۆڵەکردنەوە و خەزنکردنی لایەنی بەرامبەر لە نەستدا. لەکاتێکدا ماهییەتی دەسەڵات، بریتیە لە گەمەکردن، ئیعتیرافکردن، خۆگونجاندن و دانوستان لەگەڵ ئەویتر بۆ ئەوەی هەستیارانە ڕووبەڕووی ببێتەوە. بەپلەی دووەم ئەو تەفسیرە ماهییەتی داخراویی ئەو هێزانەمان بۆ ئاشکرا دەکات، کە لە پانتایی سیاسیی ئێمەدا دەیانەوێ کراوە و دیموکرات و مەدەنی و عیلمانی خۆیان بناسێنن، بەڵام لە جەوهەردا داخراو، ستەمکار، نادیموکرات و تاسەر ئێسقان ئایدیۆلۆژیستن. بەپلەی سێیەم هۆکاری ئەو جۆرە تەفسیرە دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی نەریتێکی ئازادانەی

خۆپیشاندان لە کۆمەڵگای ئێمەدا و لە کولتووری سیاسیماندا و هەروەها بۆ نەبوونی دەرکێکی دەسەڵاتمەندانە بۆ ئەو چالاکییە کۆمەڵایەتیانەی تاك و گرووپەکان پێیان هەڵدەستن و پێویستە نرخیان بۆ دابنرێ. ئەگەر باسی ئەو زیانە گەورەیەش بکەین کە لە ئەنجامی ئەمەوە دەکەوێتەوە، پێویستە ئاماژە بۆ دروستبوونی ئەو بۆشاییە فراوانە بکەین کە لەنێوان حکومەت و خەڵکدا دروستدەبێت و دەبێتە هۆکاری سەرەکیی بێمتمانەبوونی خەڵك بە دامودەزگاکان.

لە ڕاستیدا هەرکەسانێك ئەم بۆشاییە دروستدەکەن، گێرەشێوێن و توندوتیژکار ئەوانن. ناکۆکیەکە لێرە دایە، خۆبینینەوەی گروپەکان لە نێو خۆپیشاندانی جەماوەری فراواندا نیشانەی کرانەوەی دەسەڵاتێکە، کە ڕێگە بە خەڵك دەدات نەك لەئاستی تاکەکەسیدا، بەڵکو لەئاستی دەستەجەمعیشدا ڕووبەڕووی دەسەڵات ببنەوەو ناچاری بکەن گوێیان بۆ بگرێت. ئەمە خزمەتێکی گەورەیە  بە دەسەڵات، واتە خەڵك و گرووپەکان لێی ڕائەبینین کە بەگشتی و بە کۆیی بچینە بەردەمی و چاوەڕوانیان لێی هەیە کێشە و داخوازییەکانیان بۆ چارەسەر بکات.. ئەگەر سیاسەت ماهییەتێکی دەسەڵاتمەندانەی هەبێ، دەتوانێ ئەم پێناسەیە بەسەرخۆیدا بسەپێنێت کە دەسەڵاتێکی گفتوگۆکەرە و ئەتوانێ تێبگات و هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەکان و وەدیهێنانی داخوازییەکان دەدات، ئێمە لێرەدایە کە ماهیەتی ئیداریانەی ئەو دەسەڵاتەمان بۆ دەردەکەوێت. بەڵام ئەگەر دەسەڵات هەوڵیدا نییەتی گفتوگۆکەرانەی خۆپیشاندان و چالاکیی گرووپەکان بشێوێنێ و بەرگێکی دیکەیان بەبەردا بکات، ماهییەتی هێزخوازانەی خۆی ئاشکرا دەکاتەوە و ئەوەی لە نەستی خۆیدا بەرامبەر ئەوانیتر شاردوێتییەوە، لە گوتارێکی هەڕەشەئامێزدا ئاشکرا دەکات. سرووشتی هێز ئەوەیە کە ئەوانیتر وەك هێزی نەیار لەبەرامبەر خۆیدا دەبینێ و ناتوانێت بڕیاری عەقڵانییان لەبارەوە بدات و ناتوانێت قەبووڵی هێزێکی دیکە لەبەرامبەر خۆیدا بکات. هەر هێزێکی تر لە بەرامبەر خۆیدا وەك هێزێکی تر دەبینێ کە هاتووە ئەم بڕوخێنی، بۆیە عەقڵیەتی سیاسەتمەدارو برێك لە ئیداریەکانی ئێمە دوای خۆپیشاندانەکان بەوجۆرە شرۆڤەی ئەم بەجەماوەربوونەی خەڵك دەکەن، کەگوایە نیەتیان

ئاژاوەگێرییە، لەکاتێکدا خۆپیشاندانەکانی وڵاتی ئێمە دەیانەوێ دەسەڵات بنرخێنن و لێی ڕادەبینن کە بەو شێوەیە ڕووبەڕووی ببنەوە و پرۆڤەی ژیان لەناو وڵاتێك و سیستەمێکی سیاسیدا دەکەن کە گوایە دیموکراسییە و کراوەیە، بەڵام بەردەوام تووشی شۆکی ئەو ناکۆکییە دەبن کە هێزە سیاسییەکان لە نێوان قسە و کرداردا بەرجەستەی دەکەنەوە: من دیموکراسیم تا ئەوکاتەی خۆپیشاندان ناکەیت، کە خۆت پیشاندا، تەقەت لێدەکەم!

تاوانبارکردنی خۆپیشاندەران بە بوونی دەست لەپشتیانەوە ئەگەر بوبێتە کولتوور، کولتوورێکی خراپە و دەسەڵات بەرهەمیهێناوە، پێشئەوەی بنەمایەکی ڕاستەقینەی لە واقیعدا هەبێ. بە بڕوای من ئەمە بۆتە کۆنسێپتێك، یان تێگەیشتنێك، کە عەقڵییەتی سیاسی لە ئەنجامی شینەکردنەوە و گوێنەدان بەوەی کە چی لەئاستە (میکرۆ و ماکرۆ) بچووك و گەورەکانی ئەم کۆمەڵگەیەدا لەئارادایە. ئیتر کاتێك ئەو عەقڵییەتە خۆپیشاندان و نارەزایەتییەکان دەبینێ، یەکسەر ئەم کۆنسێپتە بەکار دەهێنێ بۆ سەلماندنی حوکمێکی پێشینە کە جەخت دەکاتەوە سەرئەوەی دەستێکی بێگانە لە پشت خۆپیشاندانەوەیە! لە مێژووی هزری مرۆڤەوە فێربووین، کە هەموو کۆمەڵگا داخراوەکان و هەموو سیستەمە سیاسییە هاوشێوەکانیان یەك ڕاستی دەسەلمێنن: (سیستەمێکی سیاسی داخراو، یان عەقڵێکی سیاسی داخراو لەهەر شوێنێك هەبوو، ئەوا شوێنەکانی دەرەوەی خۆی دەکا بە دوژمن، واتە وێنەی دوژمنیان پێ دەبەخشی). بەپێی لۆژیکی ئەم بیرکردنەوەیە، هەرشتێك لە ناوەوە ڕوودەدات دەستی *دەرەوەی* تیایە، دەرەوە هەمیشە هەڕەشەیەکە لەسەر ناوەوە. بۆیە ئەگەر ئەم تێگەیشتنە لەکۆمەڵگای ئێمە لەلای سیاسیەکان بوبێتە کەلتورێك، کولتوورێکی زۆر لاوازەو تێگەیشتنێکی زۆر ساکاری لە پشتە کە دورە لە دەستنیشانکردن و تێبینیکردنی هۆکارەکانی دروستبوونی ئەو جۆرە بزوتنەوە و خۆپیشاندانانەی لەم کۆمەڵگایەدا سەرهەڵدەدەن. بە مانایەکیتر، ئێمە لەمەشدا دەسەڵاتێکی سیاسیمان بۆ دەرناکەوێ کە بۆ تێگەیشتن لە کۆمەڵگای خۆی پشت بە زانست و شیکردنەوەی

زانستی و توێژینەوە ببەستێ، بەڵکو دەسەڵاتێکی هەڕەمەکیمان بۆ دەردەکەوێ کە پشت بە ئیجتیهاداتی شەخسی و گریمانەی گومانلێکراو دەبەستێ..

**گۆران: ناساندنی خۆپیشاندەران بە ئاژاوەچی و گێرەشێوێن بەرامبەر بە ڕووداوی هەڵەبجە، لە نێو گوتاری دەسەڵاتدابوو، پێناسەی ئێوە بۆ ئاژاوەچی یان گێرەشێوێن چیە؟**

ڕێبوار: ئاژاوەچی کەسێکە پلان دادەنێ بۆ ئەوەی نۆرمە هاوبەشەکانی ناو پانتایی ژیانی کۆمەڵایەتی بشێوێنێ، بەجۆرێ کە ئەو شێواندنە زیانبگەیەنێ بە یەکبەیەکمان. بەبڕوای من پێناسەی ئاژاوەچی و گێرەشێوێن، بەسەر ئەو گەنجانەدا ناسەپێنرێ کە خۆپیشاندانی ڕۆژی (٢٠٠٦/٣/١٦)یان لە هەڵەبجە سازدا و ئەو ڕووداوە ناخۆشانەی لێکەوتەوە. لە هیچکام لەو خۆپیشاندانانەی لە شەش ساڵی ڕابردووشدا ئەنجامدراون، خەسڵەتی ئاژاوەگێڕی نابینینەوە. ئەوەی پێی دەگوترێ ئاژاوە، ئەنجام و بەرئەنجامی ئەو داپڵۆسین و نارەوایەتیەیە لە بەکارهێنانی دەسەڵاتی پۆلیس و ئاسایشدا کە ڕووبەڕووی ئەم خۆپیشاندانانە بوونەتەوە.

ئێمە باس لەو خۆپیشاندانانە ناکەین کە دەسەڵات خۆی لە بۆنەکاندا، بە مۆڵەتی خۆی خەڵکی بۆ هانداون، ئێمە تەنها باس لەو خۆپیشاندانانە دەکەین کە گروپە ناکۆکەکان بە هەندێ بۆچونی سیاسی، هەڵدەستن بە خۆپیشاندان. ئەمانە هیچی بە نائاشکرایی خۆپیشاندانیان نەکردووە، هیچیان لە پڕو لە ناکاو نەبون، بەڵکو پێشتر قسەیان لەسەر کراوە و ڕێکخراوبوون، دەسەڵات ئاگاداریان بووە، ئەگەر ئاگادار نەبووە و فۆرمی مۆڵەتخواستنیش نەخرابێتە بەردەم وەزارەتی ناوخۆکان، بەڵکو دەسەڵات لە ڕێگەی نفوز و دەستەدرێژکراوەکانی خۆیەوە زۆر باش ئاگاداربووە لەوەی کە لە فلانە ڕۆژدا و فلانە گرووپ هەڵدەستن بە خۆپیشاندان. جیاوازی هەیە لە نێوان خۆپیشاندانێك بۆ خۆپیشاندانێکی تر، ئەوەی لەم شەش ساڵەی دواییدا کراوە و بەزۆری گروپی گەنجان و قوتابیان و کوردەکانی ئاوارەی خۆرهەڵات تیایدا بەشداربوون، لەپێناوی خۆشکردن و وەدەستهێنانی کۆمەڵێك داخوازیدا ئەنجامدراوە، نەك بە مەبەستێکی دیکە. بۆ نموونە خۆپیشاندانی قوتابیان لە ناو

بەشەناوخۆییەکاندا لەبەر ئەو کێشانە بووە کە ئەو گرووپە کۆمەڵایەتیە لەگەڵ ئیدارەی زانکۆدا هەیەتی. تەنانەت ئەو خۆپیشاندانەی سلێمانیش کە لە دژی بڵاوبوونەوەی کتێبەکەی مەریوان هەڵەبجەیی کرا، ناچێتە خانەی توندوتیژی و ئاژاوەگێرییەوە، بەڵکو دەچێتە خانەی دەرخستنی جۆرێك لە ناکۆکی و دژبوون لە ئاست بیروبۆچوونێکی تردا، تا ئەوکاتەی ئاڵای وڵاتێکی تێدا دەسوتێنی و بۆی هەیە ئەمە جۆرێ لە شکاندنی نۆرمی هاوبەش بێت و کاریگەریی هەبێت لەسەر پەیوەندی دوو میللەت و دوو وڵات پێکەوە. خۆپیشاندانەکانی وڵاتی ئێمە هەوڵدانی گرووپەکان بوون بۆ چاکسازی لەم کۆمەڵگایەدا و لەو هەلومەرجانەدا کە پەیوەندی بە ژیانی ئەوانەوە هەیە. بۆیە هیچ کام لەم خۆپیشاندانانە نەچوونەتە خانەی توندوتیژیەوە، تەفسیری توندوتیژانە بۆ ئەم جۆرە لە خۆپیشاندانەکان، تەفسیرێکی یەکلاییە و هی کەسانێکە نایانەوێت ڕۆڵی چۆنێتی مامەڵەی دەزگا و هێزەکانی کۆنترۆڵکردن لە دروستکردنی پەرچەکرداری توندوتیژانە لەلای خۆپیشاندەرەکان، ببینن. بەڕاستی ئەو کەسانە لەمانای مەدەنیانەی خۆپیشاندان تێناگەن.

**گۆران: خۆپیشاندان ڕێگایەکی ئاشتیانەیە بۆ داواکردنی مافەکان، بەڵام پێتوانییە گرفتی میکانیزمی سیاسی و کۆمەڵایەتی لە گرتنەبەری خۆپیشاندانەکاندا هەبێت، یاخود ئەمە بوونی هزری توندوتیژیە لەلای خەڵك و لەلای دەسەڵات؟**

ڕێبوار: لە وڵاتی ئێمەدا عەقڵیەتی سیاسی هەمیشە بەوجۆرە ئیشیکردووە کە ئێمە پیرۆزین و ئەوانیتر خراپ و پۆخڵ. هەموو بۆنە سیاسیەکان ئەو بۆنانەن کە تیایاندا (ئێمە) دەبینە قوربانییەکی پاکژی بێگوناه، ئەوانیتر کە مەرج نیە بێگانە بن بە ئێمە، یان بەئێمەی کورد، لەوانەیە حزبی سیاسی بەرامبەر بێت، یان خەڵکی شار و دەڤەرێکیتر.. ئەم میکانیزمی ئیشکردنە وایکردووە لە هەموو بۆنەکاندا گوتاری حیزبی و سیاسیی ئێمە جەخت بکاتەوە سەرهەمان شت: ئەوان بێ گوناهن و هەڵە ناکەن، ئەوان هۆکاری ئەو ڕووداوو کەموکوڕیانە نین کە لەم وڵاتەدا ڕوودەدەن.، لەو کاتەوەی کە کارەساتی گەورەی سەدان قوربانیی هەولێر رویدا، ئیش لەسەر ئەوە دەکرێ کە ئەم ڕووداوانە دەستێکی بێگانەیە لە کۆمەڵگای ئێمەدا. وەکئەوەی

کۆمەڵگای ئێمە، کۆمەڵگایەکی زۆر بێکەموکوڕی بێت و خۆی نەتوانێ بەرهەمهێنەری ئەو توندوتیژی و ناکۆکیانە بێت و هۆکارەکان هەمیشە لە دەرەوەی کۆمەڵگای ئێمەبن، ستراتیجیەتی ئەم عەقڵیەتە سیاسیە گەڕانە بەدوای دوژمنێکی هاوبەشدا و کۆکردنەوەی ئەندامانێتی لە دەورەی خۆی.

دەسەڵاتی ئێمە بەوەی کە دەڵێ دەستێکی بێگانەی لە پشتەوەیە و ئەمە دەسیسەیە، هیچ ناڵێ جگە لەوەی وتویەتی من دەسەڵاتێکی سادە ئەندێشم و بە شێوەیەکی زانستیانە و دیراسەکراو ئاگادرای کۆمەڵگای خۆم نیم و زانستێکی هەڕەمەکیانەم هەیە لەسەر ئەم کۆمەڵگایە وەك ئەو زانستەی زۆربەی کۆمەڵگا داخراوەکان پێکیانهێناوە لەسەر ئەوانیتر. ئەوانیتر هەمیشە دوژمنی گریمانەکراوی ئێمەن، ئێمەیەك وەك ئەوەی کە خۆی هیچ ناکۆکیەکی نییە، (ئێمە)یەکی تۆکمەی یەککگرتووە و هیچ دژێك لە ناویدا نییە و ئێمەیەکی پاکژە، ئێمەیەك تەنانەت پیرۆزە. بۆیە هەرشتێك ڕوویدات لە ناو ئەم ڕووبەرەدا کە ئێمەی تیا ئەژین دەسیسەی ئەوانیترە، ئەمەش میکانیزمێکە هەموو کۆمەڵگا داخراوەکان و هەموو سیستمە تۆتالیتاریەکان ئیشیان پێکردووە.

بۆ گۆڕینی ئەم میکانیزمەش واچاکە ئەم پەیوەندیە نایەکسانیە کە لەسەر بڕیاری پێشینە بەرامبەر ئەوانیتر دروستبووە، هەڵگێڕینەوە بۆ پەیوەندیەك کە بتوانین تیایدا خۆمان دروستبکەین لە ئەنجامی بەراووردکردنی خۆمان بە ئەوانیتر، نەك هەوڵدان بۆ سڕینەوەیان. ئەو بۆچوونە داخراوەی یەکەم کە هەمیشە تەرکیز لەوە دەکات ئێمە عەیبمان نیەو عەیب لەئەوانیتردایە، ئێمە ئاژاوەمان تیانیە و ئەوانیتر ئاژاوەمان تێدا دروست دەکەن و دەستێکی ڕەشمان بۆ دەنێرنە ناوەوە، پێویستە هەڵگێڕینەوە و گۆڕان دروستبکەین.

کاتێك گۆڕان دروستدەبێت کە ئیش بکەیت بۆ ئەوەی ئەوانیتر بناسییت و لەبەر ڕۆشنایی ناسینی ئەوانیترو بەراووردکردنی بە خۆت، ئینجا باس لەخۆت بکەیت، ئیشکردن لە خۆتدا ببێتە پرۆژەیەك، ئیشکردنێکی بابەتیانە کە تۆ خۆت ببینیت وەك

ئەوەی کە هەیت لەبەرامبەر و لەگەڵ ئەوانیتر، نەوەك ئەوەی کە ئەتەوێ ببیت، یان ئەوەی کە ئایدیالێکیت یان نمونەیەکی بەرزبیت.

ئێمە پێویستمان بە تێگەیشتنێکی وردتر لە کۆمەڵگای خۆمان و لە گروپە کۆمەلآیەتیەکان هەیە، دابرانێکی زۆر هەست پێدەکەم لە نێوان سیاسی و کۆمەڵگا خۆیدا. لەمڕۆی کوردستاندا ناکۆکیەك هەیە کە گوتاری خەڵك بۆ سیاسەت زۆر جیاوازە لە گوتاری سیاسیەکان بۆ سیاسەت، واتە ئەوەی سیاسیەکان لە سیاسەت دەیانەوێ، شتێکەو ئەوەی خەڵك دەیەوێ لە سیاسەت شتێکی ترە. ئەمڕۆ کۆمەڵگای کوردی بە تەواوی خۆی لە پەراوێزی کۆمەڵگای عێراقیدا دەبینێ، وێڕای بە عێراقیبوونەوەیەکی بەزۆر، لە دوای پرۆسەی رزگاری عێراقەوە، ئەمە بۆتە گوشارێکی دەرونیی و لە ئاستی میللیدا کاریگەریشی هەبووە لەسەر بەشەکانیتری کوردستان. هەروەها سیاسەتمەدار و رەمزە سیاسیەکانی ئێمە بەشێکی زۆری کاتی خۆیان لەو پۆستانەدا بردەسەر کە لە بەغدان و، بەشێکی وزەی خۆیان لە چارەسەرکردن و رێگریکردن لەو کێشانەدا خەرج دەکەن کە کێشەن بۆ کۆمەڵگایەك، کە کوردستان نیە. لەم نێوەندەشدا گۆمەڵگای کوردستانی هەست بە جۆرێك لە پەراوێزیی دەکا، هەمیشە هەستکردن بە پەراوێز بەرەو ناخی خۆمان دەباتەوەو لەوانەیە ویژدانێکی نارەحەت دروست بکات، ویژدانێك کە دواجار بیر لەوەش دەکاتەوە تۆڵەی خۆی بکاتەوە. ئەمانە ئاماژەن بۆ ئەوەی کە سیاسیی ئێمە دەبێت لە بیری ئەوەدا بێ کە گوتاری خۆی بۆ سیاسەت لەگەڵ گوتاری ئەو کۆمەڵگایە لەناویدا دەژی بۆ سیاسەت، یەك بخاتەوە، چونکە دوو گوتاری سیاسی جیاواز لە یەك کۆمەڵگا دا بەدوو ئاماجی جیاواز و بەبێ گفتوگۆکردن، جگە لە پێکدادان هیچی دیکە بەرهەم ناهێنێ.

**گۆران: گواستنەوەی خۆپیشاندانەکان لە شارێکەوە بۆ شارێکیتر و لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر، بۆ نمونە لە رانیەوە بۆ ئاکرێ و لەوێوە بۆ کەلار و دواتر بۆ هەڵەبجە، ئەمە چی بەرهەم دەهێنێ؟ ئایا ئەمە کاریگەری شار نیە لەسەر شارێکی تر؟ یاخود چۆنی دەبینی؟**

ڕێبوار: ئەگەر خۆپیشاندان بە جۆرێك لە گواستنەوەی هوشیاری مەدەنیانەی خەڵك یان گروپە کۆمەڵایەتیەکان تێ بگەین، ئەوا دەری دەخا گواستنەوەی خۆپیشاندانەکان لە شارێکەوە بۆ شارێکیتر بەرهەمی ئەو هوشیاریەیە. لە ماوەی ئەم چەند ساڵەی رابوردودا، حزبی سیاسی هەر مەرامێکی هەبوبێ بەجوگرافیای کوردستان و بەکۆمەڵگای کوردی و بە دابەشکردنێکی دی ئەم کۆمەڵگایە لە رێی بەخشینی ئیمتیازات بە گروپگەلێك و خستنەبەردەمی پارەی زۆر و بەپۆلیسکردنی کۆمەڵگا و تەرویجی سیاسی و هەموو ئەو پرۆسانەی کە پێی هەڵساوە، بۆ ئەوە بووە کە میللەتی ئێمە والێ بکات چوارچێوەیەکی (یەکێتی/ پارتی)یانەی پێ ببەخشێ. ئەگەر واتێ بگەین خۆپیشاندانەکان ئاستێکی هوشیاری مەدەنیانەی خەڵکن، ئەوا بۆمان رووندەبێتەوە، ئەو سیاسەتە نەیتوانیوە بردنەوە بەدەستبهێنێ، چونکە شارەکان و ناوچە جیاوازەکان خۆیان نادەن بەدەست ئەو پرۆسەیەوە و ئەمرۆ هەوڵدانێکی سەرەتاییانەی ناوچە و شارەکان لە ئارادایە بۆ یەکگرتنەوەیان و خۆداپچڕاندن لە گوتاری دووکەرتکەری حیزبی. شارەکان خەریکن شوناسی خۆیان لەسەر دەرد و قەیرانی هاوبەشەوە بەرهەمدەهێننەوە، نەك جیابوونەوەی حیزبی و ئایدیۆلۆژی. ئەم خۆپیشاندان و دەنگ هەڵبڕینە مەدەنیانە تا رادەیەك بونەتە کەلتورێك کە لەهەموو ئاستەکانی گروپی کۆمەڵایەتی ولاتی ئێمەدا بەدیدەکرێ. کەواتە ئەو هەوڵانەی حزبی سیاسی بۆ دابەشکردنی کۆمەڵگا بەسەر خۆیاندا، فەشەلیانهێناوە، ئەمە دیسانەوە ماندانێکە بۆ حزبی سیاسی کە بە خۆیدا بچێتەوە چونکە ئەو نەیتوانیوە بە خستنەگەری ئەو ماشێنە زۆرەی تەنکنیك و پارەو ئیمکانیاتیش میللەتی کورد یان هوشیاری گروپە کۆمەڵایەتیەکان بەلای خۆیدا رابکێشێت. چونکە گروپە کۆمەڵایەتیەکان وێڕای جیاوازی نێوخۆیشیان، جیاوازی دابەش بوونیان بەسەر تەکەتولاتی سیاسی هەمەجۆردا، لە خەباتی مەدەنیاندا هاوبەشن. ئەمەش زەنگێکی زۆر باشە بۆ ئەوەی دەسەڵاتی سیاسی بەخۆیدا بچێتەوە و هەوڵبدات پەیوەندی دروستبکاتەوە لەگەڵ کۆمەڵگای کوردیدا. بۆیە گواستنەوەی خۆپیشاندان لە شوێنەکەوە بۆ شوێنێکیتر هیچ نیە جگە لەوەی پێمان دەڵێ ئاستی خەباتی ئێمەو

ئاستی هوشیاری گروپە کۆمەڵایەتیەکان بە تایبەتی گەنجان و قوتابیان وێڕای دابەش بوونیان لە ئاستی سیاسیدا، بەسەر (خوێندکار) و (قوتابی)، کەچی لە هوشیاری مەدەنیدا هەمان ئاستیان هەیەو ئەمەش جێی دڵخۆشیە کە گروپە کۆمەڵایەتیەکانی ئێمە، بەتایبەتی گەنجان لە پەرچەکرداریاندا بۆ مێژوویەك کە پێیدا تێپەریون، ئیش ناکەن، چونکە مرۆڤ ناتوانێت مەدەنیانە رەفتار بکات ئەگەر بەرچەکردارییانە هەنگاو بنێت، ئێمە لەبەردەم کردەیەکی کۆمەڵایەتی عەقڵانیداین و ئامانجی خۆی هەیە، لە هەمانکاتیشدا مەدەنیانەیە چونکە ئامانجەکانیان بریتی نین لە توندو تیژی.

**گۆران: لە نێوان گوتاری حکومەت و گوتاری بەرگریی خەڵکدا کامە گوتاریان روبەرێکی فراوانتری سیاسی و کۆمەڵایەتی هەیە؟ یاخود گوتاری یادەوەری حکومەت لە رووی سیاسیەوە و گوتاری بەرگری خەڵك لە رووی کۆمەڵایەتی یەوە چ پێکدادانێك دروست دەکات؟**

ڕێبوار: من پێموایە ئەوەی حکومەت و حزب و سیاسەتی لە پشتە، ئەمە گوتاری یادەوەری نییە، ئەمە گوتاری موناسەبەیە. واتە حزب هەمیشە لە چوارچێوەی موناسەبەکاندا یادی تراژیدیاو ئەو بۆنانەی کردۆتەوە کە پەیوەندیان بە یادەوەری خەڵکەوە هەیە، یان خەڵك یادەوەری لەگەڵ ئەو ئەزموون و تراژیدیا و خۆشی و ناخۆشیانەدا هەیە،کە حکومەت دەیەوێ لە موناسەبەیەکدا بچوکیان بکاتەوە. هەموو بەدەنگەوەهاتنێکی خەڵك، یان گرووپە کۆمەڵایەتیەکان لەو شوێنانەدا بریتیە لە بەرگریکردن لە یادەوەریەکان بۆ ئەوەی نەبن بە موناسەبە.. عەقڵی موناسەبەیی عەقڵێکە لە پشتیەوە بردنەوە ئامانجێکە. هیچ موناسەبەیەکی سیاسیمان نیە بانگەشە بۆ ئەوە نەکرابێ ژمارەی شەهیدەکانی ئێمە و ژمارەی سەرکەوتنەکانی ئێمە و ژمارەی هەیبەت و دەسکەوتەکانی ئێمە لە دەسکەوتەکانی ئەوانیتر زیاتر بوون. ئەمە تەقلیدگەراییە و دابەزاندنە لە چۆنایەتییەوە بۆ چەندایەتی. واتە یادەوەریەکی هاوبەش هەیە کە حزب دێت وەك موناسەبەیەك مامەڵەی لەگەڵ دەکات بۆ ئەوەی تیایدا باس لە شکۆمەندی و ژمارەی شکۆمەندی و دەسکەوتو شەهیدەکانی خۆی بکات، لە کاتێکدا یادەوەری لەلای خەڵك بریتیە لە جۆرێك لە بەدەنگهێنانەوەی

رابردوو و جۆرێك لە بەدەنگهێنانی ویژدانی ئێستا، تاوەك رابردوو لە بیر نەچێت. رابردوویەك هەیە لەوێ چاوەڕوانی ئێمەیە. میللەت کە یادەوەری بەرز ڕادەگرێ، جگە لە یادکردنەوەی ئەو قوربانیانەی لە پێناوی ئێستادا گیانی خۆیان بەخت کردووە، دەیەوێت ئەوەش بڵێت بۆچی ئەم ئێستایە، ئێستایەکی بەختەوەرانە نیە. بەدەنگهاتنی خەڵك لەکاتێکدایە دەسەڵاتی حزبی سیاسی زۆر ئیشی لەسەر ئەوە کردووە کە هەموو شتێکی هاوبەش یان هەموو یادەوەریەك بکات بە موناسەبەیەك، پارتی و یەکێتی زۆر لەسەر ئەمە ئیشیان کردووە کە کۆی مێژووی کورد یەکسان بکەن بە مێژووی حزبەکەی خۆیان، کۆی رووداوە تراژیدیا نەتەوەییەکانی کە لە ماوەی مێژووی عێراقدا بەسەر ئێمەدا هاتوون بیانکەن بە رووداوگەلێك لە شوێنێکدا پەیوەندیان بەو دوو حزبەوە هەیە، یان کەسایەتی ئەو دووحزبە ڕۆڵی گەورەیان تیابینیوە. لێرەدا هەندێ رەمزی نەتەوەیی و میللی ئازادیخوازانەمان هەیە، ئەم سێمبولانە لە ئاستە نەتەوەیی و ئازادیخوازانەکەی خۆیانەوە دادەبەزێنرێن و ئینتمایەکی حیزبیان پێ دەبەخشرێت. واتە مانای ئەو سێمبولانە بچوك دەکەینەوە، ئێمە لەگەڵ کەسایەتیەکی وەك شێخ مەحموددا ئەم ئیشەمان کردووە لە رەمزێکی نەتەوەییەوە زۆرجار دای دەبەزێنین بۆ رەمزێك کە تەنها ئاماژەیە بۆ شاری سلێمانی، ئێمە لەگەڵ قازی محەمەدیشدا ئەم کارەمان کردووە لە رەمزێکی گەورە بۆ بەرگری بەرامبەر رژێمێکی لۆکاڵی، دەیکەین بە (پێشەوا)ی حزبێکی سیاسی کە حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانە، ئێمە لەگەڵ کەسایەتیەکی وەك مەلا مستەفای بارزانیشدا هەمان کارمان کردووە، ئەو کەسێکە لە قۆناغێکی مێژوویدا ئەتوانێ کۆی کۆمەڵگای کوردی هەروەها گروپە کۆمەڵایەتیەکان بە ناکۆکیەکانی خۆشیانەوە لە رووی سیاسیەوە ئاڕاستە بکات، بە هۆی خەسڵەتی تایبەتی کەسایەتییەکەیەوە، توانیویەتی رۆحی شۆڕشگێرانە و بەرگریی بکاتە گوتارێکی بەرجەستەکراو، بەڵام لە قۆناغێکی دیکەدا پارتی دیموکراتی کوردستان ئەم مانافراوانە لە مەلا مستەفا وەردەگرێتەوە و دەیکات بە رەمزی حیزبیانەی خۆی. لێرەدا مانای رەمز بەو

ئاراستەیەدا کە بەرهەمهێنەری یادەوەرییە بە ئاراستەی ئەوەدا دەگۆڕێ کە بەرهەمهێنەری موناسەبەیە.

**گۆران: کۆی خۆپیشاندانەکانی کوردستان لە چوارچێوەی داواکاریەکان بچنە دەرەوە، واتە کەسەکان وەریگرین، پێت وانیە ئەمە جۆرێك بێت لە ململانێی نێوان نەسلەکان، واتە ستۆپێك بێت بۆ عەقڵی پیر و دەسەڵاتی پیر؟ ئایا سنوربەزاندنێك لەلای ئەم گەنجانە هەبووە لە کاتێکدا حکومەت بە کوشتن و گرتن وەڵامی داونەتەوە؟**

ڕێبوار: ململانێی نێوان نەوەکان لە کوردستاندا واقیعیەتێکە، هەر ئەو گەنجەی کە لە ناو ماڵ و خێزاندا کێشە و گرفتی لەگەڵ دەسەڵاتی باوکیدا هەیە، هەر ئەو نەوەیەی لە قوتابخانەکان و زانکۆکاندا کێشەیان لەگەڵ عەقڵیەتی ئیداری و پەروەردەیی و فێرکای ئەو دامەزراوانەدا هەیە، هەمان نەوەیشە کێشەی لەگەڵ عەقڵیەتی سیاسیدا هەیە. ئەم عەقڵیەتە سیاسیە کەمتر گوێ لەم نەوە نوێیە دەگرێت لە بەرئەوەی ئیش لەسەر ئەوە دەکات کە ئەم رابردوویەکی خەباتکارانەی هەیە و ئەم نەوەیە نییەتی و لەبەر ئەوە ڕەتیاندەکاتەوە. ئەمەش تەنها ململانێیە لە نەوەی گەنجەوە بەرامبەر نەوەی پێشوو. بەڵام ئەگەر پێمانوابێ ئەمە شەڕی گەنجەکانە لەگەڵ پیرەکان، ئەمە تەنها ململانێیەو شەڕ نیە، بۆیە ئێمە پێویستیمان بە یەکتری هەیە بۆ ئەوەی بتوانین کێشەکانمان چارەسەر بکەین، چارەسەری کێشەکانی منی (نەوەی نوێ) پەیوەستە بە تۆی نەوەی پێشوترەوە (کۆن)، کە گوێم لێ بگری و ڕێزی بیروبۆچوونەکانم بگیرێت و هەڵەکانم بۆ ڕاستبکرێتەوەو لە ئەزموونەکانی ئەوانیترەوە فێر ببم. ئەم نەوەیە شەڕی ڕانەگەیاندوە بەڵکو گفتوگۆیەکی مەدەنیانەی ڕاگەیاندووە، بۆیە ئەگەر نەوەی پێشوو چ لە ئاستی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئیداریدا گوێ لەم گفتوگۆیە نەگرێت، بێگومان ئەم هەوڵە بۆ ململانێ، توانایەکی شاراوەی تێدایە تا ببێتە جۆرێ لە شەڕی نێوان نەوەکان، چونکە سروشتی ئەم نەوە گەنجەیە کە خاوەنی گەورەیی و عیزەتی نەفس و لە خۆڕازی بوون و زۆرجار ئیگۆیزمیشە. واتە زۆر خۆی خۆش ئەوێ، بۆیە ئەوکاتەی کە ڕێگری ئەبینێ لەبەردەمیدا پەرچەکردار ئەنوێنێ بۆ پارێزگاریکردن لەو

بەهایانەی کە هەیەتی، زۆرجار ئەم پەرچەکردارە گەورەترە لەوەی کە پێویستە، گەر خۆپیشاندانی هەڵەبجە بۆ نمونە وەربگرین، دەریدەخات ئەم نەوەیە چەندە نەوەیەکی عەقڵانیەو ئەیەوێت بە مەدەنیانە کاربکات بەڵام ئەوەندەش ئەتوانێت عەفەوی بێت و، لە ساتەوەختێکدا رەفتارگەلێك بنوێنیێ کە ئێمە ناعەقڵانیەتێکی زۆری تیا ئەبینینەوە تا ئەو رادەیەی کە توندوتیژیەکی عەفەوی بێت. توندوتیژی عەفەویش چۆن لە پڕ سەرهەڵدەدات ئاواش لەپڕ کپ دەبێتەوە.. ئەگەر لەم ڕوانگەیەوە تەماشای ڕووداوەکانی هەڵەبجەمانکرد، دەبینین کە توندوتیژی زیادەڕۆییەك نیە لە کاراکتەری نەوەی نوێدا، بەڵکو پەیوەندی بەو حاڵەتی عەفەویبوونەوە هەیە کە لەپەرچەکردارەکاندا دەردەکەوێ. هیچکام لە خۆپیشاندانەکان بۆ ئەوە نەکراون بڵێ: بڕوخێ حکومەتی هەرێمی کوردستان، یان گەنجی ئێمە دەستی بچێتە ئەوەی پلان دابنێ لە دژی ئاسایش و پۆلیس و قەتڵوعامیان بکات، یان پەنای بردبێتە بەر هێزێکی نادیاری ڕەش و ئامانجەکانی ئەم هێزە لەم کۆمەڵگایەدا بهێننەدی.. گەنجەکان لەوە وشیارترن کە خۆیان تەسلیمی ئەم هێزە ڕەشانە بکەن، راستە لەوانەیە درێژکراوەی هێزگەلێکی تربن کە لەو ناوچەیەدا دەژین، یاخود کەوتبنە ژێر کارگەرییانەوە، بەڵام گەنجەکان هێشتا لەچوارچێوەیەکی مەدەنیانەدا چالاکییەکانیان دەنوێنن و پێویستە نەهێڵین بەتەواوی لەم کۆمەڵگایە بتۆرێن. قسەکردن و ڕێگاچارەکانی هەندێ لە بەرپرسەکانی ئیدارەی سلێمانی بۆ ئەم مەسەلەیە زۆر چاوەڕواننەکراو بوون، زۆر توندوتیژی ڕەمزییان پێوە بوو. دەبا ئەوان بیانگوتبا ئێمە کێشەیەك لەماڵەکەماندا پەیدابووە، ئەوانەی هەستاون بەمکارە ئەندامی شەرعیی ئەم کۆمەڵگایەن. چی بکرێ بۆ ئەوەی کێشەکەیان بۆچارەسەر بکەین.. ئەوان یەکسەر ڕووبەڕووی گەنجەکان بوونەوە و توندوتیژییەکی ڕەمزیانەی زۆر مەترسیداریان لەدژ نواندن، تەنانەت نەیانهێشت لە کەلار و شوێنەکانی دی بۆ یادی ئەنفال خۆپیشاندان بکرێ و کەوتنە بەرهەمهێنانی گوتارێك لەسەر گەنجەکان بۆ ئەوەی لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە ڕیسوا و چاوشکێنیان بکەن. بە شەڕخواز و گێرەشێوێن ناویان بردن. بەڕاستی ئێمە لەمەوە تێگەیشتین کە نەوەی پێشوو،

بەتایبەتی هەڵبژاردەی سیاسی لە وڵاتی ئێمەدا زۆر هەژارە بەرامبەر بە تێگەیشتن لە دۆخی ئێستای کۆمەڵگاکەمان. ئەوان نایانەوێ تێبگەن کۆمەڵگای ئێمە بە حوکمی بەرژەوەندی و خواستی جیاواز، کۆمەڵگایەکی پڕ لە ململانێیە، هوشیارییەکی زیاتر لە ئارادایە بۆ بەدەنگ هاتن لەسەر مافەکان و دروستکردنی ناسنامەی سیاسیی و کۆمەڵایەتی و کولتووری. کۆمەڵگای ئێمە چیدی کۆمەڵگایەکی یەکدەست نییە و چیدی بە گوتاری ناسیۆنالیستانەی سۆزگەرایانەی ناعەقڵانی و کاریزماپەروەری خەڵکی دابین و ئارام نابنەوە. من تێدەگەم بۆچی نوخبەی سیاسی بەوجۆرە گوتاری ناڕەوا لەسەر بزووتنەوە کۆمەڵایەتی و چالاکیی گرووپەکان بەرهەم دەهێنێ، چونکە نەوەی کۆن لەناو تەماعەکانی خۆیدا، لە ژێر گووشاری غەریزەیدا بۆ بردنەوەی بەردەوام و لەتاو هەڵاوساندنی ئابوورییانەی گیرفانی خۆی، کۆمەڵگای بیر چۆتەوە.

ئەمڕۆ نیشانەیەکی دیار لە کۆمەڵگای ئێمەدا بریتییە لەسەرهەڵدانی نەوەیەکی نوێ کە ئێمەی تووشی ڕاچەنینێکی کولتووری گەنجانە کردووە: بۆ یەکەمجارە لە مێژووی ئێمەدا هێزێکی کۆمەڵایەتی گەورە لە گەنجان دەبینی، بەڵام ئەمانە وەك بێگانە خۆیان ئەبیننەوە، وەك دەستێکی ناحەز کە لە لایەن دوژمنانەوە هاندراون، تەماشایان دەکرێ و وەك بەشێك لە خۆمان نایانبینین. هەر بۆیەش وەك بەشێك لە خۆمان مامەڵەیان لەگەڵ ناکەین، بەڵام ئەمە شۆکێکە بۆ نەوەی پێشوو، پێویستە تێبگات ئەم هێزە کۆمەڵایەتیە لەم کۆمەڵگایەوە سەریان هەڵداوەو خواست و بەرژەوەندی و شێوازی تەواو جیاوازیان هەیە. ئەمەش بەمانای ئەوە نیە پیرۆزن و هیچ هەڵەیەکیان نیە، وەلێ نەوەیەکن هەن و بوونیان تا ئێستا بوونێکی مەدەنیانە بووە، بوونێکی شەڕانگێزانە نەبووە. ناتوانین بڵێین ئەوان توانای نواندنی توندوتیژییان نییە، ناتوانین بڵێین هەرچی کردوویانە ئاساییە و سرووشتییە. بەڵام نابێت ئەو بارودۆخەش لەبیر بکەین، کە توانای توندوتیژی لە مرۆڤدا گەشەپێدەدات. بۆیە چەندە گوشار لەسەر گەنجەکان لە ئاستی فیزیکی بە لێدانی ڕاستەوخۆ و لە ئاستی مەعنەوی بە شکاندنیان وەك نەوەیەك و لە ئاستی دەروونی بە خراپ باسکردنیان، زیاتر بکەینو وردەکولتووری ئەوان ڕەتبکەینەوە، ئەوەندەش ئەوان هاندەدەین کە

پەرچەکرداری توندوتیژانە بنوێنن. چەندە وازمان هێنا لە کولتووری چاودێریکردن و سزادان و ئیشمان کرد بە میکانیزمێك کە پەیوەندی خۆمان لەگەڵ گەنجەکان لەسەر ئەوە دروست بکەین چاودێریان بکەین بۆ ئەوەی پاداشتیان بکەین، ئەوەندە توندوتیژی کەمدەکەینەوە. یانی ئەو توندوتیژیە لە تواناییەوە نابێتە توندوتیژیەکی کردەیی. ئەوەی لە هەڵەبجە بینیمان ناتوانین بڵێین ئەوە توندوتیژیەکە بەرنامە بۆ دارێژراو بووە، هێندەی ئەوەی چۆن لە پڕ سەری هەڵدا، ئاواش کپ بۆوە، بەڵام ئەو ساتەوەختەی خۆی بەدیاردەخات ساتەوەختێکی ترسناك بوو. ئەو دیمەنەی لە ڕووداوی هەڵەبجەدا لەسەر گەنجەکان زەق دەکرێتەوە پێش هەموو شتێك ڕووداوێکی ڕاگەیاندنەو دەبێ لێکۆڵینەوەی لەبارەوە بکرێت، چونکە ئێمە لە دونیایەکی ئەفلاتونیدا دەژین زۆر جار ئەوەی دەیبینین حەقیقەت نیە بەڵکو سێبەری حەقیقەتە. بەڵام ئەگەر ئەوەی لە ڕاگەیاندندا بینیمان وەها تەماشا بکەین کە ئەوە حەقیقەتە، ئەوە زۆر مەترسیدارە.

# گرووپی شێخ زانا:
## شێوازێکی نوێی تیرۆر

**گفتوگۆی: بێستوون نووری**

**{نێربازی و تیرۆر و سێکس. جەستە وەك بارمتە. تیرۆریستبوون و ڕیزپەڕبوون. ئایا گرووپی شێخزانا لەسەر ئایین حسابن؟ ئایین و توندوتیژی و سێکسکردن. شایەتمانهێنان لە مەترسیدا. زانکۆ و مزگەوت و تیرۆر. تۆقاندن لەڕێگەی تەلەفزیۆنەوە.}**

**٭ گرووپی ناسراو بە "گرووپی تیرۆریستی شێخ زانا"، کە لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن کردەوەکانیان نیشان درا، پێتوایە ئەوانە تیرۆریستن، یان شەوازن؟**

– دەکرێ بڵێین هەردووکیانن، هەم تیرۆریستن، هەم بەبەراوورد بە کۆی مرۆڤەکانی وڵاتی ئێمە ڕیزپەڕیشن. گرووپی شێخ زاناو ئەندامەکانی ئەو گروپە تیرۆریستن بەو مانایەی کە ئەو کارەی دەیکەن دەستدرێژییەکی جەستەیی، رووحی، مەعنەوی، ئەخلاقیە بۆ سەر قوربانییەکان و ژیانی هاوبەشی هەمووماان بەهۆی وەگەڕخستنی شەپۆلێ لە ترس و تۆقاندن کە شیرازەی ئاسایی ژیان دەشێوێنێ. بەڵام ئەمانە ڕیزپەڕیشن چونکە وەکو گروپێك، کە چەند بەهایەکی ناوەکی بۆخۆیان دروستدەکەن و پەیوەندییەکانی خۆیان لە ڕێگەیانەوە ڕێکدەخەن تا بتوانن لە ڕێگەیەوە خۆیان پابەندی یەکتر بکەن و خۆیان بەیەکترەوە هەڵوگیربکەن، ئەمەش تا ئەندازەیەکی

زۆر بۆ ڕێگرتن لەئاشکرا بوونیان. لێرەدا سێکس دەبێتە فاکتەرێك بۆ ئەوەی ئەوان هەریەکەیان ئەوانیتر بکاتە بارمتەی خۆی و هیچیان نەتوانێ ببێتە هۆکاری ئاشکراکردنی ئەوانی دیکە، چونکە هەرکەسە بەجۆرێ ئەتککراوە و کراوەتە بارمتە، کە هەموو ئاشکراردنێکی (دەستی بکوژی) ئەوانیتر دەبێتە هۆی ئاشکرابوونی (قووندەری) خۆیشی!. لەراستیدا لێرەدا سێکس بۆخۆی ئامانج نییە، بەقەدەر ئەوەی هۆکارێکە بۆ هەڵەوگیرکردن و پابەندبوونی ئەندامانی گروپ بەیەکترەوە لەپێناوی ئەنجامدانی کاری تیرۆریستیدا. کەواتە ئەوەی ئامانجە (تیرۆر) و تۆقاندنە بەبێ ئەوەی ئەم تۆقاندنە ئامانجێکی سیاسیی ڕووتی هەبێت. سێکس بەو مانایە هۆکارێکی ڕووشکاندنە، چونکە ئێمە لە کۆمەڵگایەکدا دەژین کە تا ڕادەیەکی زۆر کوشتن قەبووڵ دەکات و بکوژ لە کۆتاییدا (ئازا) و (بوێر) و (چاونەترسە). ئەدەبیاتی فۆلکلۆریی ئێمە پڕە لە ستایشکردنی بکوژ و چەتە و ڕمب و خەنجەر وەشێن. زۆریشن ئەو پیاوکوژانەی دوێنێ کە لەئەمڕۆدا وەك مرۆڤی نیشتیمانپەروەر و ڕێزلێگیراو ئەم و ئەو دەبینن. بەڵام سێکسکردن بەو تێگەیشتنەی لە کۆمەڵگای ئێمەدا باوە، ئابڕووچوونی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی بەدواوەیە. جا بۆیە ئاساییە گرووپی شێخ زانا بەردەوام ئەوەیان بۆ گرنگتر بووە کە وەك (قوندەر) ئاشکرا نەبن، نەك وەك (بکوژ). لێرەوە ئەوان (قوون)ی خۆیان کردۆتە بارمتەی (دەست)ی خۆیان، کە هەروەکچۆن دەستێکی شایەتمان هێنەرە، ئاواش دەستێکی بکوژە و دەستێکی ئاماژەکەریشە و لە کاتی ئاشکرابوونیدا ئاماژە دەکات بۆ قوونی ئەوانیتر تا ڕیسوایان بکات. ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات کە بکەر لەم تیرۆرەدا قسەکەری یەکەمی نێرینەیە و یەکەم قسەیشی لەکاتی کەشفبوونیدا ئەوەیە کە دەڵێت: (ئەگەر من بکوژ بم، ئەوان قوندەرن).. بەمەش بۆ ماوەیەکی کاتی، (تا ئەوکاتەی قسەکەرێکی دی باس لە بکووژیی خۆی و قوندەری ئەم دەکات)، هەم قوندەریی خۆی دەشارێتەوە، هەم سووکە متمانە و شانازییەکیش بە بکووژیی خۆیەوە دەکات و دەشزانێت کۆمەڵگا نرخێکی زیاتر بۆ بکوژ دادەنێ تا قووندەر. لێرەوە دەتوانین باشتر لە ئەو متمانەیەی شێخ زانا تێبگەین کە لە کاتی قسەکردندا پێوەی دیاربوو. چونکە ئەو نەیزانیوە کاتێ

ئەوان بە قوندەر و خۆی بە بکوژ لەقەڵەم دەدات، ئەوانیش هەمان شت بەرامبەر بە ئەو دەکەن و ئاشکرای دەکەن کە هەم بکوژی گەورە و هەم قوندەری مەزن بۆخۆیەتی! کەواتە ئەم گرووپە بەهۆی ئەتککردنی سێکسیانەی یەکترەوە، ویستویانە رێبگرن لەوەی هیچ یەکێ لەو ئەندامانە بیر لەوە نەکاتەوە ببێتە هۆکاری کەشفبوونی ئەوانیتر. ئەمەش لەبەر ئەوەی ئێمە لەکۆمەڵگایەکدا دەژین کەکاری سێکسی لادەرانە تێپەڕاندنە لەسنوورێکی ئەخلاقی، بەتایبەتی ئەگەر رەگەزەکان هاورەگەز بن، نێر و نێر، یان مێ و مێ. مرۆڤ بەوەی کە لێی ئاشکرابێ کاری سێکسی و شەوازی ئەنجامداوە، حەیاچوون و ئابڕووچونێکی کۆمەڵایەتی گەورەی بەدواوەیە، بۆیە دێت ئەم جۆرە لە نزیکبوونەوەی جەستەیی بەکاردێنێ بۆ ئەوەی رێ لەو ئابڕووچوونە بگرێ. کەواتە گرووپەکەی شێخ زانا هەردووکیانن، بەلام ئامانجەکەیان تیرۆرە و ئەوانە بەپلەی یەکەم تیرۆریستن، لە ناو مێژوویەکیشدا سەریانهەڵداوە و کوردن و برای خوێنی و دینیی راستەقینەی ئێمەن.. بەلام ئەوان تیرۆریستن، بەو مانایەی کە هوشیارن بەرامبەر بەو کارەی کە دەیکەن و کردویانە، رێگر و چەتە و گیرفانبڕی گێل نین، خەڵکانێك نین کە نەزانن چی دەکەن، دەزانن چۆن زۆرترین تۆقین و ترس دروست بکەن لەم کۆمەڵگایەدا. ئەوانە بەناو کۆمەڵێ پەیوەندیی تایبەتیدا دیدار و سەروکاریان لەگەڵ کەسانێکی زۆر هەبووە، زوو کوشتنیان هەموو ئەم شتانە بۆ ماوەیەکی کەم دادەپۆشێ.. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان وریابوون بەرامبەر بەساتەوەختی ئابڕووچوون و ئاشکرابوون، بۆیە لەرێگەی رووشکاندنی یەکترەوە هەر یەکەیان ئەویدیکەی کردۆتە بارمتەی خۆی، بۆ ئەوەی رێ بگرێ لەوەی کەخۆی و گروپەکەش کاشکرا ببێ. دیارە ئەمەش پیشەی مرۆڤی ترسنۆکە. شێخ زانا و گرووپەکەی لە ریزی هەموو کۆنە بەعسی و جاش و موستەشار و خیانەتکارەکانیتری دیکەی نەتەوەی ئێمەدان و ئەوانەش لە زوومرەی ترسنۆکترین و شەرمەزارترین مرۆیەکانی ئەم کۆمەڵگایەن.

**★ ساڵانێکە کردەوەی تیرۆریستی لە وڵاتی ئێمەدا روو دەدات، هەمیشە دەگوترا ئەنجامدەرانی کردەوەکان عەرەبن، یان خەڵکانێکن لە دەرەوەڕا دێن، تۆ لەدوای**

**رووداى يەكى شوبات لە كۆڕێكى هاوبەشدا لە سەنتەرى ئاڵا، گوتت: (تيرۆر لە ناوەوەيە و تيرۆريستەكان خەڵكى ئەم وڵاتەن)، ئێستا لە ئاشكراكردنى گروپى شێخ زانا و گروپەكانى ديكە دەركەوت كە ئەندامەكانى ئەو گروپانە كوردن، پێتوايە زەمينەى تيرۆر و توندوتيژى لە كوردستان ئەوەندە قووڵ بێت؟**

– هەموو نيشانەكانى دواى تەقينەوەى يەكى شوبات، هەموو نيشانەيەكى ئەو شوێندەستانەى كە ئەمانە بەجێيان هێشتن، شوێندەستى كەسانێك بوون شارەزا بەم شارە و تا ئەندازەيەكى زۆر بەناوچە جياوازەكانى ئەم وڵاتەى ئێمە. ئەو ڕێژەيەى كەرەستەى تەقەمەنى كە بەكاريان دەهێنا، ڕێژەيەك نەبوو ئێمە بڵێين لەدەرەوە دێ، چونكە تۆ ئەگەر لەدەرەوەى سنوورى كوردستان كەلوپەلى تەقينەوە بهێنى، دەتوانى هەرجارەى بڕێكى زۆر كەم بهێنى و ئەوەش لە ماوەيەكى دووروودرێژدا. ڕاستە ئەوان سەردەمى لێدان و ڕمانى بەعسييەكان، (كە زۆربەى هێزەكانى ئێمە سەرقاڵى فڕكان فڕكانى سەيارە و تاڵانكردن بوون لە موسڵ و كەركووك و بەغدا)، بە هەلێكى زێڕين زانيوە و بەئارەزووى خۆيان وڵاتيان پڕكردووە لە تەقەمەنى، بەڵام ئەو بڕەى ئەوان لەتەقينەوەكانياندا بەكاريانده‌هێنا و پێيانەوە گيران، ئەو شوێندەستانەى جێيان دەهێشتن، ئەو شوێنانەى بۆ تەقاندنەوە دەستنيشانيان دەكردن، هەر هەموويان بەڵگەى ئەوەيان بەدەستەوەدا كە ئەوانە خەڵكى ئەم وڵاتەن، خەڵكى ئەمشارەن، هاوزمانى ئێمەن و براى ئێمەن. لەواقيعدا كەسمان ناتوانين بڵێين ئەوان برا و هاوزمانى ئێمە نين، ئەگەر چەمكى (برايەتى) بەديوێكدا چەمكى كۆمەڵگايەكى خێڵەكى بێت، ئەوە شێخ و گرووپەكەى برا و ئەندامى خێڵەكەى ئێمەن. بەڵام بەپێى لۆژيكى خێڵايەتى باشييەكەى لەوەدايە كە هەم بكووژ و هەم قوندەر لە خۆمانن و بێگانە ئەمەى لەگەڵ نەكردووين..

لەلايەكيترەوە، ناتوانين هەموو ئەو توندوتيژيانەى لەكۆمەڵگاى كوردى و لەمێژووى كورددا روويانداوە بكەين بەپێشزەمينە بۆ دروستبوونى ئەوانە، توندوتيژى و شەڕانييەت بەشێكە لە تەبعى مرۆڤ و ئاژەڵ و سرووشت و لە قۆناغى ژيانى كۆمەڵگاكاندا لەناو پەيوەندييەكان و كارەساتە سروشتييەكانەوە دروستدەبێت. بەڵام

تیرۆر تەنیا کاری مرۆڤگەلێکە کە بەپێی پلانێکی تایبەت و بەبەرنامە، دەستدەخەنە ناو هەموو هاوسەنگییەکی ڕێژەیی و ئاسوودەییەکی کاتیانەی کۆمەڵگاکانەوە. بۆیەش دەڵێم هاوسەنگی ڕێژەیی و ئاسوودەیی کاتی، چونکە لە جیهاندا هیچ کۆمەڵگایەکی هاوسەنگ و ئاسوودەی ڕەهامان نیە. گرووپی دەستگەمەی شێخ زانا تیرۆریستن بەمانایەکی جیاواز: کۆمەڵگای ئێمە بەدرێژایی مێژوویەکی زۆر، بەتایبەتی هەر لە ئەمارەتەکانەوە، بەدەر و خاڵیی نەبووە لەشێوازەکانی توندوتیژی، هەتا دەگاتە سەردەمی شێخ مەحمودی حەفید، کۆماری مەهاباد، ئاگری داغ، سمکۆی شکاک، بەکەمێ جیاوازییەوە سەردەمی بارزانی بەتایبەتی سەبارەت بە قەدەغەکردنی ڕاوی ئاژەڵە کێوییەکان، ئەمجا سەردەمی هەردوو شۆڕشی چەکداری و ڕزگاریخوازی نوێ، هەتا دەگاتە سالانی شەڕی ناوخۆیی و سالانی دوای ڕاپەڕین و ئاشتبوونەوە و یەکخستنەوەی هەردوو ئیدارە، نیشتەجێکردنەوەی ئاوارەکان لە سلێمانی و هەولێر، داگیرکردنی زەویوزار و خانووەکانیان، پاشان ئەو جۆرەی تیرۆر کە من ناومناوە (تیرۆری شاراوە)، کە زیاتر لەناو پەیوەندییە ئیدارییەکانی ئەم پازدەساڵەی دواییدا پیادە دەکرێ، هەموو ئەمانە بەبێ توندوتیژی مەیسەر نەبوون و نابن. توندوتیژی بەشێکی سەرەکی بووە لەپێکهاتەی کۆمەڵگای ئێمە، مرۆڤی ئێمە بەر لەهەر شتێك مرۆڤێکی توندوتیژە، ئەمەش بەو مانایە نییە کۆمەڵگای ئێمە خاڵییە لەهەموو لێبوردەییەك، بەلام لەڕاستیدا زۆر ئاسانە تۆ لەناو ئەم مێژووەدا داهێنان لە توندوتیژیدا بکەی. چونکە بەشێك لەجەستەی تۆ ڕاهاتووە لەسەر توندوتیژی و ئەم وزەیە لە هابیتۆس و خووی جەستەیی ئێمەدا بەسرووشتیی بووە. هەر لە بڕینەوەی درەختەوە تاکوشتنی بۆق و قرژاڵ و چۆلەکە و سزادانی هەموو ئەو ئاژەلانەی وەك کەر و هێستر و مانگا و بزن و مەڕ، کە پێش هاتنی کورد بۆ ئەم ناوچەیە لێرە بوون و لە دەوروبەرمانن، قوربانیی ئەم توندوتیژییەن. لەبەرامبەر ئەمەشدا ئێمە بە درێژایی مێژوو، هەتا سەردەمی (نالی)، (شێخ ڕەزا) و (ڕەشید نەجیب) و تا (مەحمود زامدار) و (شێرزاد حەسەن)، هیچ پرسیارێکمان نییە سەبارەت بە ناتوندوتیژی و لەسەر ئەوەی بۆچی ئەو ئاژەڵ و درەختانە سزا دەدرێن و دەکوژرێن. بۆ بێچووە پشیلەیەك

دێتـە ماڵمانـەوە، بـەر لـەوەی بمانـەوێ هـەر شـتێکی دیکـەی لێ بکـەین، دەمانـەوێ بیکوژین.. لە سەردەمی شۆڕشی چەکداریدا چـەندە فیـشەکمان نـاوە بـە دووژمنـەوە ئەوەنـدەش تەقـە لـە ئـاژەڵی کێـوی، مارمێلکـە و کۆترەباریکـە و کـەو و سوێـسکە و کیسەڵ و حاجی لەقلەق و ماسیخۆرە کراوە. ئێمە ماسی بە (قومبەلە) و ($T.N.T$) ڕاو دەکـەین. (لـووغم) بـۆ ڕێـوی و دەڵـەك و چـوالوو دەنێینـەوە. ئێمـە (شـێرەی سـەگ کوژین) و بەیانیان زوو بەسـەر شـەقامی دەرەکـی سلێمانی تاسڵووجە و سـەدمەتری هەولێردا برۆ بزانە نیشانەی چ مرۆڤگەلێ بەجێماوە و چ قەسـابخانەیەك هـەڵخراوە بـۆ بۆ سەگ و پشیلە کە تـەنیا گوناهیـان ئەوەیـە لـەم بـەری شـەقامەڕێوە بپەڕنـەوە بـۆ ئەوبەر! ئەم مرۆڤانەی ئەو تاوانانە دەکەن هەر ئەوانەن کە خۆیان بە خودا پەرست و مسوڵمان و کوردی ڕاستەقینە دادەنێن و هـەر ئەوانەشـن کـە لـە چێشتخانەکاندا، بـە چوار شیش کەباب و قۆزی و لاتەڕاف تێر ناخۆن. لەبیرت نەچێ کە لە هیچ شـوێنێکی دنیادا وەکئەوەی ناو چێشتخانەکانی ئێمە، بەرماوە نامێنێتەوە. گـەورەترین تـاوان و توندوتیـژیی ئێمـە لـە وەزارەتـی تەندروسـتی و قەسـابخانەکان و چێـشتخانەکانەوە بەرامبـەر بـە سـامانی ئـاژەڵ و باڵنـدەکان دەسـتپێدەکات. ***لـە دوای بەعـسییەکان، نـەبوونی سیاسـەتێك بـۆ خـواردن گـەورەترین دووژمنـی ئێمەیـە***. بـرادەر، ئێمـە لـە قوتابخانـەدا یـەك دێـڕ لەسـەر ناتوندوتیـژی و لێبـووردەیی نـاخوێنین. توندوتیـژی لەکۆمـەڵگای ئێمـەدا نەبۆتـە پرسـیار، ڕۆشـنبیرییەکمان نـەبووە کـە بەرپەرچـی توندوتیـژی بداتـەوە و ناتوندوتیـژی لـەم کۆمەڵگایـەدا ڕەواج پێبـدات. بـەڵام ئـەو توندوتیژی و تیرۆرەی گروپـی شـێخ زانـا، جۆرێکـە لەتوندوتیـژی تایبـەت، دەتـوانین بڵێین ئەگەر توندوتیژییەکی سروشـتیی لـەلای مـرۆڤ و لـە کۆمەڵگاکانـدا هـەبێ، ئـەوە توندوتیژیـەك کـە گروپـی شـێخ زانـا و هاوشـێوەکانی بەرهـەمیان هێنـاوە، بەتـەنیا سروشتیی نییە، هێندەی ئەوەی توندوتیژیەکی بەرنامە بۆ دارێـژراوی عەقڵانییـە و لـە پشتییەوە ئابووریەکی گەورە هەیە، پارەیـەکی زۆر هەیـە، سیـستەمێکی ئیـدارەکردن هەیـە، کۆمـەڵێك پەیوەنـدی هەیـە، ئاسـانکاری هەیـە، و لەسـەر هـەموو ئەمانەشـەوە پرۆسەیەك هەیە بۆ بەئایدیۆلۆژیکردنی ئاین و بەکارهێنانی.. هەموو ئەمانـە ڕێگـەمان

لێدەگرن کە بڵێین: ئەمجۆرە لەتوندوتیژی و تیرۆر درێژکراوەی ئەو توندوتیژییە کە لەکۆمەڵگای ئێمەدا هەبووە، ڕاستە لەکۆمەڵگای ئێمەدا توندوتیژی هەیە، بەڵام ئەم توندوتیژییەی شێخ زانا بەرجەستەی کرد و لەمەدا تەلەفزیۆن بۆی نومایشکرد، تەواو جیاوازە بە لەبەرچاوگرتنی هەموو ئەو پەیوەندیانەی کە شێخ لەگەڵ کەسانێکدا هەیبووە و پێناسەی ئەو توندوتیژیە تەواو دەکەن، کە بەداخەوە بەشێکی زۆر کەمیان تا ئێستا بۆ ئێمە ئاشکرا بووە. گروپی شێخ زانا لە کۆمەڵگایەکدا سەری هەڵداوە کە بۆخۆی گیرۆدە بووە لەناو توندوتیژیدا بەهۆی ململانێی هێزە سیاسیەکانەوە، بەهۆی کرانەوەی سنوورەکان بۆ دەستی بێگانە و دزەکردنیان بەناو ئەو درز و بۆشاییەی کە لەکات و لە پێش و لەپاش شەڕی ناوخۆیی و پرۆسەی ئاشتبوونەوەشدا دەزگا ئەمنیەکانی ئێمەیان بەخۆیانەوە سەرقاڵکردبوو. ئەوەندەی ئەو دەزگایانە هەوڵیاندا لە هەولێر و سلێمانی بەدوای ئەوەی کە ئەوان پێیدەڵێن (جەلالی و مەلایی)دا بگەڕێن، ئەوەندە هەوڵیان نەدا، بزانن دەستی بێگانە چۆن مرۆڤی کورد دەکڕێ و بەکاری دەهێنێ و هێلانەی خۆی لەناو کۆمەڵگای ئێمە چێدەکا.

**★ گوتت لە پشتیەوە بەئایدیۆلۆژیکردنی ئایین هەیە، ئایا ئەو کردەوانەی ئەو گروپە لە ئاییندا جێگای دەبێتەوە؟**

– ئایین، بەتایبەتی ئایینی ئیسلام لەتوندوتیژی بەدەر نییە، ئایینی ئیسلام چ لە دەقە ئاینیەکاندا، چ لە مێژووی ئەم ئایینە خۆیدا، هەر لەسەردەمی خەلافەتەوە مێژووی ئیسلام مێژوویەکە خاڵی نەبووە لە توندوتیژی و لە نواندنی یان دروستکردنی جۆرێك لەتۆقین و ترس. بەڵام (گوتار)ی ئەم ئایینە لە هەموو کاتێکدا ئیشی لەسەر ئەم ڕەهەندە نەکردووە. سەردەمی ئیسپانیا و پێکەوەژیانی مسوڵمانان و مەسیحیی و ئەوانیتر بۆ ماوەی سێسەدساڵ، نمونەی ڕەهەندی ئارامیی و لێبووردەیی ئایینی ئیسلامە. کەواتە کۆی مێژووی ئەم ئایینە هەموو کات ئامانجی ئەم ئایینە نەبووە. ئایین هەمیشە ئامانجی خۆی لەدروستکردنی توندوتیژیدا سەقامگیر نەکردووە، ئایین پەیامێکی هەیە کە دەیەوێ ڕێکخستنێك لە نێوان تاکە بڕوادار و یەزداندا دروست بکات. ئەمە پەیامی سەرەکیی زۆربەی ئایینەکانە، دەکرێ ئەم پەیامە بەهۆی

کەسانێکەوە کە هەم یەزدان بەگرنگ وەردەگرن و هەم مرۆڤ، تەفسیرێکی نەرم و نیانی بۆ بکرێ و ئایین ببێتە دروستکەری سەکۆیەك بۆ ناساندنی یەزدان بەمرۆڤ و بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێ لە یەزدانی خۆی نزیکببێتەوە. لەلای حەلاج و ئیبن عەرەبی و مەحوی و مەولەوی خۆمان، ئەم ڕەهەندەی ئایین دەناسینەوە، ئەگەرچی لەلایەن هاوسەردەمەکانی خۆیانەوە بەشێوەی جۆراوجۆریش سزا دەدرێن. بەڵام ئەگەر ئەم پەیامە ئاینییە کەوتە دەست کەسانێك، یان زەمینە و زەمان ئەو بوارەی ڕەخساند خەڵکانێك بتوانن ئایین بەکاربهێنن بەو شێوەیەی بۆخۆیان دەیانەوێ، ئەوە چ مەرج نییە ئایین بێتە ڕێکخەری پەیوەندیی نێوان مرۆڤی بڕوادار و یەزدان. لەوکاتەدا دەکرێ ئایین بکرێتە ئامرازێك، بکرێتە ئایدیۆلۆژیا و مەرامێکی تایبەت کە بەدەرنەبێ لە میزاجی شەخسیی ئەو کەسانە و بەکاری بهێنن بۆ ئەو ئامانجەی کە خۆیان هەیانە. ئەمە ئەو دۆخی قەیرانەیە کە ئایین تێیدەکەوێت و تیایدا هێندەی ئەوەی ئایین لە هەوڵی ئەوەدایە مرۆڤی بڕوادار دروستبکات، مرۆڤ هەڵدەستێ ئایین لە سوودی بیروڕاکانی خۆی بەکار دەهێنێ و لە ئەنجامی ئەمەشەوە هەم خۆی و هەم خودای بیردەچێتەوە. ئێمە ئێستا لەسەردەمێکی وەهادا دەژین. بەلایکەمەوە شێخ زانا و هەندێ لە مەلاکانی هەولێر ئەوەیان سەلماند. بۆیە دەبێت ئێمە پرسیار بکەین، ئایا *بۆچی لەسەردەمانێکدا کە لە هەموو سەنتەرەکانی جیهانی ئیسلامدا، لە قورتوبەوە بۆ هیندستان و لە بوخاراوە بۆ شارەزوور و دینەوەر و بەغدا و کوفە و حەبەشە، سەد مزگەوتت نییە، وەلێ بە هەزاران مسوڵمان و عاریف و سۆفی و ڕاڤەکار و شاعیری گەورەی مسوڵمانت هەیە، کەچی لە هەولێرێکدا کە بەتەنیا سێ سەد و ئەوەندە مزگەوتت دروستکردووە، جگە لە کەسانێك کە بەناوی ئایینەوە قیژەقیژیانە بەسەر ئەو خەڵکە هەژارەوە، بەدەگمەن گوێت لەدەنگی بڕوادارانی ڕاستەقینە دەبێت.* بۆیە سەردەمی ئێمە سەردەمی ئیسلام نییە وەك ئایین، بەڵکو سەردەمی ئیسلامیستەکانە و ئەمانیش پەیوەندیی نێوان بڕواداران و یەزدانیان بەجۆرێ شێواندووە، مرۆڤ ناتوانێ جیاوازیی نێوان مزگەوت وەك شوێنی تەقییە و عیبادەت و مزگەوت وەك مەعسکەری پەروەردەکردنی مرۆڤکوژان بکات. بە تێکچوونی پەیوەندیی نێوان بڕواداران و یەزدان

و لـەبیرکردنی یـەزدان لەلایـەن مرۆڤـەوە، تیرۆریـست و شـەڕانییەکان دەتـوانن ژیـانی هاوبەش بشێوێنن. بۆیە ناکرێ ئایین وەك ئایین تاوانبـار بکـەین، بـەڵام لـە شـوێنێکدا ئاینـدارەکان، بڕوادارەکـان و ئـەهلی مزگـەوت و عیبـادەت، مەسـئولیەتێکیان هاتۆتـە سەرشـان: شـێخ زانـا بەرلـەوەی چـەقۆ بـەملی کـوڕە گـەنجێکی گوڵەبەرۆژەفرۆشـدا بهێنێ، ڕستەیەکی ئایینیی پێ تەڵقین دەکا کە بریتییە لەڕستەی شایەتمانهێنان، واتە ئەو ڕستەیەی کە پەیمانی ناخ و نیەتمەنـدی مـرۆڤ بـە یـەزدان ڕادەگەیـەنێ: (**أشهدُ**): بەهۆی پیتی ئەلیفەکەیەوە کە لە قـووڵاییڕا گۆدەکرێ و هەناسـەی ڕۆح لەگـەڵ خـۆی دەهێنێتەدەرێ و دەیکاتە پەیژەیەك بۆ سەرکەوتن و گەیانـدنی دەنگـی خـۆی بـۆ لای پـەروەردگار، هـەم دەنگـی ناخـە و هـەم ئامـادەیی بێواسـیتەی تاکەکەسـی بـڕوادارە لەبەرامبەر یەزداندا. مسوڵمان بەهۆی ئەم لە ناخەوە هاتنە گۆیەیـەتی کـە خـۆی وەك بڕوادارێـك دەسـەلمێنێ و خـۆی دەکاتـە شـاهید بەسـەر بـوونی یەزدانـەوە و یـەزدان دەهێنێتە ناو ناخی خۆیـەوە. مرۆڤـی بـڕوادار هـەمان تاکەسـی خۆڕزگـار کـردووە لـە ئەشـکەوتی ئـەفلاتوونی کـە بەچـاوی دڵ حەقیقـەت دەبینـێ و لـە شـایەتماندا ئـەم ڕاستییە بەرجەستە دەکات: (أشهدُ أن لا اله الا ألله و أشهدُ أن محمدا رسول الله.) *لـە دوای بەکارهێنانی شێخ زاناوە بۆ ئەم ڕستەیە، ئێمە لەبەردەم ئـەو پرسـیارەداین: یا ئەوەتا دەبێ ئیماندارەکانی ئەم وڵاتە بیسەلمێنن ئەم ڕستەیە پەیوەنـدی بە ئـایینی ئیسلامەوە نییە، یان ئەوەتا دەبێ پەیمانمان پێ بدەن کەجارێکی دیکە ڕێگە بە هـیچ کەسێك، یان تیرۆریستێك نەدەن ئەو ڕستەیە بـەکاربهێنێ و لـەدوای بەکارهێناکەشـی خەڵکمان بۆ سەرببڕێ.* بۆیە ئالێرەدا ***بڕوادارانی ئەم وڵاتە بەرپرسیارییەکی گەورەیان کەوتۆتە سەرشان، ئەوان ئەگەر بڕوایان بەو شەهادەیە هەیە، دەبێ ئەو شـەهادەیە لەو گوناهە پاکبکەنەوە کەشێخ زانا لەسایەیدا کردی.*** *ئەگەر ئەمە بـەگرنگ نـەگرن و گوێ نەدەن بەوەی هەر کەسێ چۆن بیەوێ ئـەم شـەهادەیە بـەکاربێنێ، مانـای وایـە دەرگایان ئاوەڵاکرد بۆ ئەوەی ئەم کۆمەڵگایە ببێتە کۆمەڵگایەکی شێخ زانـایی و هـەر* کەسێ بتوانێ هەر پەیامێکی ئایینی بەو جۆرەی کەخۆی دەیـەوێ و لـە بەرژەوەنـدی مەرامەکانێتی ڕاڤە بکات و بەناوی ئایینەوە تەوجیهی بکـات. هیـچمان ئینکـاری ئـەوە

ناکەین کە شێخ زانا دەڵێ من موسڵمانم، بەڵام ئەوەی دەبێ لەلایەن ئیمانداران و ئەوانەی کە پاکانە بۆ ئەم تاوانانە دەکەن و بەرگریی لە ئاین دەکەن، پێمان بڵێن ڕاستە ئەم ڕستەیە، ڕستەی ئایینە، بەڵام لێرەدا ئاین تاوانبار نییە بەقەدەر ئەوەی شێخ زانایەك، یا گروپێك، یان کەسانێك کە لەدروستکردنی گروپی شێخ زانادا دەستیان هەبووە، لە خراپ بەکارهێنانیدا تاوانبارن. چیدی ناکرێ مسوڵمان بن و لە ئاست ئەم شێواندنە گەورەیەی شێخ زانادا بۆ ڕستەی شەهادەت بێهەڵوێست بن. شێخ زانا بەهەموو مانایەك پەروەردەبووی ناو سیستەمی ئاینی ئەم وڵاتەیە، یان پەروەردەی ئاراستەیەکی زۆر توندڕەوە لە پەروەردەی ئایینی ئەم وڵاتەدا، کە لە مزگەوتەکانەوە سەرچاوە دەگرێ. بۆیە ئەوە هەڵوێستێکی ئەخلاقی و مەبدەئیە، دەبێ بڕوادارانی ئەم وڵاتە بەرگریی لەو ڕستەیە بکەن، چونکە لەدوای گۆکردنی ئەو ڕستەیە قەتڵی مرۆڤێك ڕوویدا و لەگەڵیدا هەموو نەفسی مرۆڤایەتی بە کوشت چوو. ناکرێ لەمەودوا مسوڵمان شایەتمان بهێنێت و ئەم قەتڵەی بیربچێتەوە. ئایا ئێمە بیانوو بۆ ئەو قەتڵە دەهێنینەوە کەقەتڵێکی خراپە، یاخود بەرگریی لەو ڕستەیە دەکەین کەهیچ بەستنەوەیەك لە نێوان ئەو ڕستەیە و ئەو کردەوەیەدا نییە. بۆیە هەر بەوەندە ناوەستینەوە کە مەلاکان و وەزارەتی ئەوقاف لەسەر تەلەڤزیۆن، یاخود گروپە ئیسلامیەکان بەیاننامەیەکمان بۆ دەربکەن و بڵێن: ئەوە کردەوەیەکی تیرۆریستانەیە و پەیوەندیی بە ئایینی ئیسلامەوە نییە. ئەوان دەتوانن بڵێن هەڵنەستانەوە بۆ ڕێزلێنان لە گیانی شەهیدان و سروودی نیشتیمانی لە پەرلەمان و گوێنەدانە بەها هاوبەشەکان، پەیوەندیی بە ئیسلام و شەرعەوە نیە، بەڵام بۆ ڕستەیەك کە بەهۆیەوە مرۆڤ شەهادەی پێدەهێنێ، ئەم پاساوە ناخوات. ***ڕستەیەك کەسەرەتای شەهادەتهێنانە بەئایینی ئیسلام کەوتۆتە خەتەرەوە، کەواتە کۆی ئاین لەمەترسیدایە. بۆیە ئەگەر ئەوان ئەوە فەرامۆش بکەن، واتە دەرگایان کردەوە لەسەر شێخ زاناکانی دیکە، بۆ ئەوەی هەمیشە بتوانن ڕستە بنەماییەکانی ئاین بەکاربهێنن و لەسایەیدا ئەو قەتڵانە بکەن.***

**★ جگه لەو ڕستەیە، شتێکی دیکەش هەیە کەخەڵك پرسیاری لێی هەیە، ئەوان ئایینیان کردۆتە ئامرازێك، بەڵام ئایا ئایین هیچ پەیوەندییەکی هەیە لەگەڵ نێربازی و سێکسدا؟**

– دیسانەوە مێژووی ئیسلام، مێژوویەك نییە تیایدا سێکس قسەی لەسەر نەکرابێ، هەڵبەتە من پسپۆڕ نیم لەمێژووی ئیسلامدا، بەڵام سەرچاوەگەلێکی زۆرمان هەن کەباس لە گوتارگەلێکی زۆر ئاشکرا دەکەن لەئایینی ئیسلامدا سەبارەت بە (حەرەمی جنسی)، (خرۆشانی جنسی)، سنووری نێوان (نێر و مێ و نێرەمووك)، پەیوەندی نێوان (ئەوەی پیرۆزە و ئەوەی جنسییە)، سۆزانێتی و خەتەنە و جوتبوون، جیماع و شەیتانیبوون... لەلایەن موسڵمانەکانەوە قسەگەلێکی زۆر کراوە لەسەر سێکس، ئەمە بەدرێژایی مێژووی ئیسلام تا ئەو کاتەی ئەم ئایینە دەبێتە ئاینێکی زۆر داخراو لە سەدەی هەژدە و نۆزدەدا، چونکە پێشتر ئەم ئایینە لەقۆناغی جیاوازدا کرانەوەی زۆری لەوبارەیەوە بەخۆیەوە بینیوە. هەر هەوڵدانی ئەوەی کەئیسلام دەیەوێ کاری سێکسی پیاوێك لەگەڵ چوار ئافرەتیشدا بەشەرعی بکا، ئەمە بۆ خۆی لەئەنجامی ئەو ترسەوە بووە کە لە سێکسکردن لەناو ئەم ئاینەدا، هەیە. دوای ئەوانە ئێمە لە مێژووی ئیسلامدا کەسانێکی وەکو (شێخ ئەلنەفزاوی)مان هەیە بە خۆی و بە کتێبی (الروض العاطر في نزهة الخاطر)، کە لە سەدەی شازدەیەمی زاییندا لە تونس نوسیویەتی. لەو کتێبەدا ئەو وەکو موسڵمانێك، وەکو قازییەك ئیش لەسەر تەفسیرکردنێکی پزیشکیانە و تەندروستانەی کاری سێکسی دەکا و بۆ ئەمەش سوپاسگوزاری پەروەردگارە: (بسم الله الرحمن الرحيم. الحمدوا لله الذى جعل لذة الكبرى للرجال في فروج النساء و جعلها للنساء في ايور الرجال، فلا يرتاح الفرج الا اذا دخله الاير ولا الأير الآ بالفرج). بەدیوێکی تردا سێکس و توندڕەوی پەیوەندییەکی زۆریان بەیەکەوە هەیە، هەموو کارێکی سێکسی خۆی لەخۆیدا ئامانجێکی توندڕەوانەی لە پشتە، سێکس کردن بریتیە لە داگیرکردنی جەستەیی نێر بۆ ئەویتر لەڕێی جوتبوونی جنسیەوە، کە ئەمە جیاوازە لە (ئیرۆتیکا)، کە بریتیە لە بەشداربوونی دوو کەس لەڕێی تەسلیمبوونیان بەیەکتر لەکاری جوتبووندا.

بەراستی پەیوەندییەك هەیە لە نێوان ئایین و نێربازیدا، وەكئەوەی لە كاری ئەم گرووپەدا بینیمان. ئەمەش پەیوەندیی بەدوو حاڵەتەوە هەیە، یەكەم شاری هەولێر وەك شارێكی تایبەتمەند بەدرێژایی مێژووی خۆی دابڕ نەبووە لەكردەی نێربازی، نێربازی لە هەولێردا كولتوورێكی دوورودرێژە. دووەم مەسەلەی سێكسكردن وەكو گوتم بریتییە لەدەسەڵاتگرتنە دەستی كەسێك بەسەر كەسێكی دیكەدا لە ڕێگای سێكسیەوە. ئەمكارە تەنیا نێرینە دەتوانێ پێی هەستێ و تەنیا ئەو بەم مانایە (سێكس) دەكات. ئەمەش حاڵەتێكە ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێ كە ئەو پیاوانەی دووچاری نەبوونی متمانەی تەواو بەپیاوەتی خۆیان بوون، دەچنە گەمەیەكی سادۆماسۆشییەوە، كە تیایدا هەم دەتوانن ئازاری ئەوانیتر بدەن و هەم بۆخۆشیان ئازار بدرێن. لێرەدا ئامانجی جوتبوون بریتی نیە لە چێژ وەرگرتن، بەقەدەر ئەوەی بریتییە لە ئازاربەخشی و ئازاردان. وشەی (سێكسووس) كە لە یۆنانیەوە هاتووە، ئاماژەیە بەئەندامی نێرینە. ئەندامی نێرینەیی لە كۆی جەستە دابڕ دەكرێ و دەكرێتە چەكێك و بەكاردەهێنرێ بۆ دەستدرێژیكردن و سەركوتكردن و داگیركردنی جەستەی ئەویتر. لەمكارەدا نێرینە نایەوێ بە ئەویتر بگات، نایەوێ پەیوەندیی سۆزگەرایی قووڵ دروست بكات و (دەستگەمە)ش تەنیا پێشەكییەكە بۆ داگیركردن و چوونە ناو ئەویترەوە. لەبەر ئەوە زۆر ئاساییە وەختێك تۆ كۆمەڵێك خەڵكی ئاوات هەیە و ئەمانە بێ متمانەن بەخۆیان، هەموو ڕێگایەك بەكاردەهێنن بۆ ئەوەی ئەو متمانەیە بۆ خۆیان بگێڕینەوە. شێخ زانا بە ئاشكرا باسی لەوە دەكرد كە ئەوان پێویستە (شوجاع) و (بوێر) و (چاونەترس) بن و دەستیان لە هەموو شت ڕابێت و چییان پێگوترا وەكخۆی جێبەجێی بكەن، چونكە بەپێی ڕاڤەی ئەو بۆ ئایین، مرۆڤی موجاهید پێویستە لە پێناوی خوادا هەمووشتێ بكات. لێرەدایە كە ڕاڤەیەكی تایبەت بۆ دین، پەیوەندی لە نێوان سێكس و ئایین و نێرایەتیدا دروستدەكات. لەكاتێكدا ڕاڤەی حافزی شیرازی و مەولەوی تاوەگوزیی و مەنسووری حەلاج و ئەوانیتر پەیوەندییەكی نەرم لە نێوان ئایین و مێینەیی و چێژ و توانەوەدا دروستدەكات..

**★ با بێینە سەر بابەتێکی دیکە: زۆربەی ئەندامانی گروپی شێخ زانا دەرچووی زانکۆی سەلاحەددینن و یەکێکیان مامۆستایە لەو زانکۆیەدا، بۆچی خەڵك لە زانکۆی ئێمەدا دەبێتە بکوژ و سەربڕ؟**

– برام، لەبەر ئەوەی زانکۆی ئێمەش دروستبووی ناو ئەم کۆمەڵگایەیە، زانکۆی ئێمە لە مێژووی خۆیدا بۆ یەك سات نەیتوانی نمونەی کۆمەڵگایەکی دیکە بخاتە پێش چاو. زانکۆی ئێمە وەکو سیاسەتی ئێمە هەڵگری گوتارێکە هێندەی دەیەوێ کۆمەڵگا کۆپی بکاتەوە و عەقڵیەتە دەستەڵاتدارەکانی کۆمەڵگا، لە زانکۆشدا بینەوە بەدەستەڵاتدار، هێندە نایەوێت عەقڵانیەتێکی دژ و ڕەخنەیی بەرهەم بهێنێ. بۆیە ئەم زانکۆیە لە ناهوشیارییەکی قوڵدایە بەرامبەر پێگەی خۆی لەم کۆمەڵگایەدا. زانکۆیەك کە ناهۆشیارە بەرامبەر بە ڕۆڵی خۆی لە کۆمەڵگادا، زانکۆیەکە نەك هەر دەست دەخاتە ناو دەستی هێزە تەقلیدی و کۆنەخوازەکانی ئەم وڵاتەوە، بەڵکو خۆشی وەك درێژکراوەیەکی ئەو هێزانە دەبینێ. ئەمە جگە لەوەی گرنگییەکی زۆریش دەدا بە دروستکردنەوەی هەموو ئەو سەنتەرە کۆنەخوازانەی لەکۆمەڵگادا هەن. زانکۆ هیچ وەختێك بوێریی ئەوەی نەبووە ستایلێکی دیکەی ژیان بۆ کۆمەڵگای کوردی پێشکەش بکا. وەختێ لەزانکۆیەکدا بەدرێژایی چەندین ساڵ هیچ تازەبوونەوەیەکی مەنهەجی و زانستیی ڕوو نادات، وەختێك ئەو پێوەرانەی کە لە ڕێگایەوە مامۆستا و قوتابی وەردەگیرێن، پێوەری لە سەدا سەد زانستی نین، وەختێك زانکۆ دەبێتە مزگەوتێکی دیکە، وەختێك بەشەکانی وەك عەرەبی و دیراساتی ئیسلامی دەبنە ئەو بەشانەی کە تێیدا ململانێی ئایدیۆلۆژی و ئایینی جێگەی ململانێی زانستی دەگرێتەوە، کاتێك پەیوەندییەکان لە پەیوەندی زانستیەوە دەبنە پەیوەندی ئایدیۆلۆژی و ئایینی و هتد، بێگومان ئەم زانکۆیە زەمینەسازییەکی باش دەکا بۆ بەرهەمهێنانەوەی توندڕەوی. بۆیە هەروەك چۆن پێویستە حیزبەکانی ئێمە، لەپێش هەموویانەوە پارتی و یەکێتی، ئیدارەی حکومەت، حیزبەکانی دەرەوەی ئۆپۆزسیۆن، ئەهلی مزگەوت، ڕۆشنبیران، دەزگای ئاسایش و ناوخۆ و ڕاگەیاندنەکان لە دوای ئەم کارەساتەوە بە خۆیاندا بچنەوە، ئاواش زانکۆ ناتوانێ بەبێ پێداچوونەوە و

چاوگێڕانەوە بەو هۆیانەی کە بۆچی زانکۆ لە پێشکەشکردنی ئەم دیاردەیەدا دەستی هەبووە، بەردەوامبێ لەوەی هەر ستایشی خۆی بکا و سوێند بە قوتابیەکانی بخوات بەبێ ئەوەی چاودێریی و لێپێچینەوەی هەبێ لەسەر ئەو بەڵێن وەرگرتنە. ئەمڕۆ چەندە لایەنی دینی، سیاسی و ئیدارە و دەزگاکانی ڕاگەیاندن لەقوڕاوێکدا گیریان خواردووە، کە شێخ زانا و گروپەکەی بۆی دروستکردوون و پێویستە لەڕێی پێداچوونەوەیەکی ڕەخنەییانە بەکۆی پەیوەندییەکانیاندا خۆیانی لێڕزگار بکەن، ئاواش زانکۆ لە هەمان قوڕاوادایە و پێویستە پێداچوونەوەیەکی خۆی بکات. ئەمڕۆ زۆر پێویست بوو، زانکۆ دەستپێشخەری بکات بۆ دامەزراندنی سەنتەرێکی توێژینەوە و داوای کۆی ئەو دۆکیۆمەنتانەی گرووپی شێخ زانا و گرووپە توندڕەوەکانیتر بکات و توێژینەوەیان لەسەر بکات. بەتایبەتی لە بەشی مێژوو، کۆمەڵناسی، پەروەردەی دەروونشیکاری. گرنگە بەشی مێژوو لەمەودوا چەندین باسی ماستەر و دکتۆرای خۆی لەسەر مێژووی توندڕەوی لە ناو مێژووی سیاسیی کوردا، پێشکەش بکا، دیراسەیان بکات و هۆکارەکانی دروستبوونی و شێوازەکانی توندڕەوی لەم کۆمەڵگایەدا ڕوونبکاتەوە. پێویستە بەشی مێژوو ئەو بیرۆکەیە تووڕ هەڵدات کە هزریی مێژوویی و زانستی مێژووی لە وڵاتی ئێمەدا بەخۆیەوە گیرداوە و ئەویش ئەوەیە کە دەڵێ: گوایە تەنیا ئەو شتە مێژووە، کە پەنجاساڵ و پتر کاتی بەسەردا تێپەڕیوە. شێخ زانا مێژووی هەنووکەی ئێمەیە و پێویستە لە زەمینەی دروستبوونی تێبگەین و ئەمەش کاری پسۆڕانی مێژووە. گرنگە بەشی کۆمەڵناسی لەو خەوە دۆگماییەی خۆی بێدار بێتەوە و چیدی بە (مەعریفەی کەمپووتی)یەوە ڕووبەڕووی گرووپی تاوانباران نەبێتەوە، کە گوایە هەردەم لەناو هەژاران و نەخوێندەوارانـدا ڕێژەی تاوان زیاترە. پێویستە ئەم بەشە بەوردی دیراسەی کۆمەڵێ دیاردە و پەیوەندی بکات کە لە کۆمەڵگادا ڕەواجیان هەیە و جگە لەتوندوتیژی وتۆقین زیاتر ناتوانن هیچ شتێکی دیکە بەرهەم بهێنن. لەمەودوا بەشی کۆمەڵناسی ئەگەر بەرنامەی نەبێت بۆ توێژینەوەی حاڵەت و ژیانی هەریەك لە شێخ زانا، وەستا فاریق، ئەژی، مەریوان و کارزان و ئەوانیتر، بەمانای ئەوەیە وەك بەشێکی زانستی لەسەردەمەکەی خۆی

دواکەوتووە. ئەوە کاری بەشی دەروونزانییە کە تاکو چەند ساڵێ دیراسەی کەسایەتی و شوناسی هەریەك لەو تیرۆریستانە بکات. بەهەمان شێوە پێویست بوو وەزارەتی پەروەردە زۆر بەجدی لەسەر ئەو مەنهەجی خوێندن و شێوازی وانە گوتنەوە و پەیوەندیی نێوان مامۆستا و قوتابی، بوەستابایە، کەجگە لە تورەکردن و ترساندن و تۆڵەکردنەوە و دواجار کەسانی وەك شێخ زانا شتێکی دیکە بەرهەم ناهێنێ. شێخ زاناو گرووپەکەی هەر تەنیا زانکۆ بەرهەمی نەهێناون، شێخ زانا لە یەکی سەرەتاییەوە نەچووە بۆ یەکی زانکۆ بۆ ئەوەی بروانامەی هەندەسە بێنێ، شێخ زانا لەناو خانەوادەیەکی کوردی و لە توێژێکی پێگەدیاری کۆمەڵایەتییەوە، سەریهەڵداوە و بە زنجیرەیەك پرۆسەدا تێپەڕیوە کەسیستەمی کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی ئێمە لێی بەرپرسیارە. بۆیە زانکۆش وەك دوا قۆناغێك کەبروانامەی بەمانە بەخشیووە، پێویستی بەچاوگێڕانەوەیەکی جدی هەیە بەخۆیدا.

**★ لەناو هەندێك لەکۆلیژەکانی زانکۆدا، مزگەوتی بچووك هەیە، ئەمە چۆن لێکدەدەیەوە، ئایا بۆچی زانکۆ مزگەوت لەناو کۆلیژدا دروستدەکا؟**

– هەڵبەت دیاردەی مزگەوت دروستکردن لەناو زانکۆدا، دیاردەیەکی تەواو خۆر هەڵاتی و کوردستانیانەیە. لەجیهاندا زانکۆ و کەنیسە، زانکۆ و پەرستگا و تێمپل، کەدەبنە زانکۆ و مزگەوت لەلای ئێمە، دوو دامەزراوەی جیاوازن. دوو جیهانبینی و دوو مەنهەجی جیاوازی پەروەردەکردنیشیان هەیە: زانکۆ شوێنێکە بۆ کۆکردنەوەی ئەو کەسانەی کەبەدوای زانیندا دەگەڕێن، یان زانین ئامانجی یەکەمی زانکۆیە تا بەپێی هەندێ دیسیپلینی عەقڵانی کە هەر لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە مشتومڕیان لەسەرە، فێری قوتابیەکانی خۆی بکات. لە کاتێکدا مزگەوت ڕێکخەری پەیوەندیی تاکە کەسە بە یەزدانەوە بەهۆی (بڕوا)وە و ئەو ڕێنماییانەی پێویستە تاکە کەس بیزانێ لەسەر ئەو ئایینەی بڕوای پێهێناوە. خاڵێکی دی، کە بەلای منەوە زۆر جەوهەرییە ئەوەیە کە ئایین لەناو زانکۆی ئێمەدا وەك مادەیەك بۆ زانست

بکا. ئەو کەسێك نییە لە دەرەوەی بابەتی دیراسەکەی، بەڵکو پەیڕەوکارێکی ئایینیە. ئەمەش خاڵێکی زۆر دەردناکە بۆ زانکۆ، کەدەزگایەکە ئاراستەکردنی زانستیانە ئامانجی بنەماییەتی. لێرەدایە ئێمە تێدەگەین کە زانکۆ شوێنی خۆیداوە بە مزگەوت، یاخود بابڵێین دەیەوێ تەقلیدی مزگەوت بکاتەوە. خاڵێکی دیکە ئەوەیە زەمەنی دیراسەکردن لە زانکۆدا، هەمیشە زەمەنی دیراسەکردنی زانست نییە، بەڵکو زۆرجار ئەم زەمەنە، دەبێتە زەمەنێکی ئایینی: لەکاتی نوێژکردنەکاندا دەوام زۆرجار دوا دەخرێ، لەبەرئەوەی سەرۆك بەش، یان مامۆستا دەچێ نوێژەکەی دەکا، لە بەرنامەدانانی زانکۆدا هەمیشە حیساب بۆ موناسەبە ئایینەکان دەکرێ. بۆیە تۆ دەبینی لەو کاتانەدا پێویستت بەوەیە زانکۆ کراوەتر بێ لەکۆمەڵگا، بۆ نموونە لە ڕەمەزاناندا، دەبینی زانکۆ داخراوترە لە کۆمەڵگا. ئەگەر لەبازاڕدا بەپێی مۆڵەتی بازێرڤانی هەندێ دوکان بۆیان هەبێ، لە ڕەمەزاندا بە ڕۆژ بکەنەوە و کەل و پەلی خۆیان بفرۆشن، لەزانکۆدا دەبێ هەوڵی زۆر بدەی تا کافتریاکانی قوتابیان و مامۆستایان بکرێنەوە.. کەواتە ئێمە زیاد لە بەڵگەیەکمان بەدەستەوەیە ئاشکرای دەکەن زانکۆ تەسلیم بەعەقڵییەتێکی تەقلیدی بووە و ئەمەش وایکردووە ئەو شتەی کە لەکۆمەڵگادا هەیە لەزانکۆشدا دووبارە ببێتەوە. زانکۆ هەرگیز بەدوای دروستکردنی خاڵی جیاوازیی لەنێوان خۆیو کۆمەڵگادا نەگەڕاوە، هێندەی ویستوویەتی کۆمەڵگا لەخۆی ڕازی بکا و ئەمەش بەڵگەیە بۆ پرسیارەکەی جەنابت..

**★ دیارە چەندساڵێکە گردەی تیرۆریستی لەکوردستان بەتایبەت لە هەولێر ڕوو دەدا، چەند ساڵێك پێش ئێستا تۆ پرۆژەیەکت بۆ حکومەت و دەزگاکانی ئاسایش پێشکەش کرد، وەڵامی ئەو لایەنانە بۆ پرۆژەکەت چی بوو؟**

— ئەم پرۆژەیە لەدوای ڕووداوی یەکی شوباتەوە، دوای ئەوەی کەچەند سیمینارێکمان گرت و تەئکیدمان لەوە کردەوە کەچیدی نابێ بۆ دۆزینەوەی، یا بۆ تێگەیشتن و بەدواداچوونی دیاردەی تیرۆر، پەنا بۆ فیکرەی پلان گێڕی ببەین، بەڵکو ئەم دەستە ڕەشە لەناوەوەیە. ئەوە بوو بە هاوکاریی چەند مامۆستایەك هەستاین بەپێشکەشکردنی پرۆژەیەك بۆ سەرۆکایەتی زانکۆی سەلاحەددین، ئەو پرۆژەیە لەوێ

پشتگیری کراو کۆنفرانسێکی لەسەر گیرا، بەئاگاداربوونی هەموو لایەنە پەیوەندیدارەکان، بە ڕاگەیاندن و وەزارەتی ناوخۆ و وەزارەتی پەروەردەوە لەو کۆنفرانسەدا ئامادە بوون. پرۆژەکە بەباشی پەسەندکرا و بڕیاردرا بەرز بکرێتەوە بۆ سەرۆکایەتی حکومەت. ئەوەندەی بزانم لەو کاتەوە بەڕەسمیی ئاگادار نەکراینەوە کە ئەو پرۆژەیە چارەنووسی بەچی گەیشتووە. تەنیا شتێك کە ئێمە لەپرۆژەکەدا باسمان نەکردبوو، بەئیلهام وەرگرتن لەپرۆژەکە کرا، بریتی بوو لە خەندەقێك بەدەوری شاری هەولێردا، کە ئێمە بەهیچ شێوەیەك باسی ئەوەمان نەکردبوو. بۆچی بەتەنگ ئەو پرۆژەیە و پرۆژەی هاوشێوەی دیکەی نەهاتن، ئەمە بۆ من پرسیارێکە. بەڵام ئێستا ئێمە زۆر شتمان بۆ روون دەبێتەوە و تێدەگەین دەبوو ئەم جۆرە پرۆژانە فەرامۆش بکرێن، چونکە ئەم پرۆژانە داوایان دەکرد کە دەزگاکانی ئاسایش بەبەشداری پێکردنی هاوولاتیان بتوانن پێداچوونەوەیەك بە بەرنامەی کاری خۆیاندا بکەن. ئێمە چەندین پێشنیاری کۆنکرێتیمان خستبووە ڕوو: ئێمە شێلگیرانە داوای ئەوەمان کردبوو پێویستە متمانە لەنێوان خەڵك و دەزگاکانی ئاسایش دروست ببێ، ئەویش بەهۆی بەشدارییپێکردنی خەڵکەوە، ئەمە نەکرا. ئێمە داوای ئەوەمان کردبوو ئەو شورابەندکردنی شار و کردنی بەقەلایەکی داخراو پێویستە کۆتایی پێ بێت، بەڵام بۆ ئەمە دەبوو کارگەی ئەو دیواردروستکردنانە ئیفلاس بکات! بۆیە ئەوەی کرا بریتی بوو لەڕەنگکردنی ئەو دیوارە چیمەنتۆییانە. ئێمە داوای کەمکردنەوەی ئەو هەموو پرسگانەی ناوشارمان کردبوو کە هەم قەڵەباڵغی دروستدەکەن، هەم ئەو متمانەیەی کە پێویستە لە نێوان هاوولاتیان و لایەنە بەرپرسەکاندا هەبێ، کەم دەکەنەوە. ئەوانە زیادیان کرد و توندوتیژی ئەوانە بۆ سەر خەڵك زیادی کرد، ئەمەش هەمووی بووە هۆی ئەوەی کەخەڵك لەبەتەنگەوە چوونی دەزگای ئاسایشدا، بەدانپێدانانی ئەو دەزگایانە خۆیان، هاوکارییەکی ئەوتۆی نەکەن.

**★ ڕێوشوێنەکانی کە دەزگای ئاسایش لەماوەی چەند ساڵی ڕابردوو گرتوویانەتە بەر، چ کاریگەرییەکی لەسەر کەمکردنەوەی ئەو دیاردەیەدا هەبووە؟**

– بەبڕوای من ڕێوشوێنەکانی ئاسایش گرتنیە بەر نەیانتوانی ببنە هۆی ئەوەی کەخەڵك ئەم مەسەلەیە، بەمەسەلەی خۆی بزانێ. ئەمە کێشەیەکی زۆر گەورەیە تا ئەم ساتەوەختە. بۆیە زۆر گرنگە ئەو ڕێوشوێنانە بگۆڕێن، پێویستە ئەم شێوازی مامەڵەکردنە لەگەڵ خەڵك بگۆڕێ، واچاکە ئەم سەردەمی باوەشێنکردنە کۆتایی بێت و سەردەمی قسەکردن و گێڕانەوەی متمانە دەستپێبکات. ئێستا هاوکێشەکە بووە بەوەی کە هەموو خەڵك تاوانبارە و ئەم جۆرە وەستاندنەی لەسەر جادە بۆ ئەوەیە بیرت بێنێتەوە تۆ تاوانباری و من ئاگام لێتە. بەڵام ئەم خاڵی پشکنینانەی ناو شار جگە لە هەڵکفاندنی دەروونی خەڵکی و خۆماندووکردنیان، دەستکەوتێکی ئەوتۆیان نەبووە. ئەگەر بەردەوامیش بن دڵنیام لەوە زیاتر هیچ ئەنجامێکی نابێ، جا بۆیە ئاسایش پێویستە بەخۆیدا بچێتەوە، ئەم ڕووداوە ڕووداوێك نەبوو ئاسایش دروستی کردبێ، ئەمە گەنجێکی قوربانی بەهۆی ڕێکەوتێکەوە، یان هەر حیکایەتێکی ترەوە کە ئێمە ڕاستیەکەیمان نەزانیوە، خۆی لەدەستی ڕەشی شێخ زانا و گروپەکەی ڕزگار کرد. ئێستا مەسەلەکە بۆتە ئەوەی کە ئەمە دەسکەوتێکی گەورەی ئاسایشە، ئێمە لەمەودوا دەبێ بەوە دەستپێبکەین و بڵێین: دەستتان خۆش و سەلامەت بن بۆ ئەو کارەی کردتان. کاکەگیان هەزارجار دەستتان خۆش و ئەو دەسکەوتە بۆ ئێوە، بەڵام چۆن ئیشی لەسەر دەکەی، چۆن لەڕێی ئەو دەسکەوتەتەوە متمانەی خەڵك بۆ خۆت دەگێڕیتەوە. تۆ کێشەی گەورەت هەیە، داوای هاوکاری بکە، کەس دوژمنت نییە، هەمووی هاوکاریت دەکەن، بەمەرجێ تۆ لەو قەڵای خۆ بەهەمووشتزانی و دابڕانەت لە خەڵك، بێیتە خوارەوە.

**★ لە وتارێکی (دنیای شتەبچووکەکاندا) باسی ڕۆڵی تەلەفزیۆن دەکەیت لەبەرهەمهێنانی زەبروزەنگدا. ئایا بە لەبەرچاوگرتنی نومایشەکانی گرووپی شێخ زانا، پاش سیازدە ساڵ لە نووسینی ئەو وتارە، چۆن ڕۆڵی تەلەفزیۆن هەڵدەسەنگێنی؟**

– ئەمە بۆ من ڕاستییەکی دەردناکە.. پیشاندانی ئەو دیمەنانە لە کەناڵێکی ڕەسمییەوە، بەبێ پێشبینیکردنی دوورترین دەرەئەنجامە جۆربەجۆرەکانی و تەنیا

لەبەر ئەوەی گوایە ئەم تیرۆریستانە (وەك خۆیان) بە خەڵك بناسێنن، ئەخلاقی ڕاگەیاندنی خستە قۆناغێکی دیکەوە. ئەمکارە وایکرد کە تێبگەین بەڕاستی تەلەفزیۆن وەکو ژان بۆدریار گوتویەتی (دێوێکی شەڕانیە) و ئەگەر نەتوانرێ بە دروستی بەکار بهێنرێ، ئەوە زیاتر لەهەر میدیایەکی دی دەتوانێت لە کۆمەڵگادا توندوتیژی و زەبروزەنگ بەرهەم بهێنێ و وەك شتێکی سرووشتی نمایشی دەکات.
ئەم مەترسییەمان پێش زیاتر لە دوازدە ساڵ هەستپێکردبوو، بەتایبەتی کە دوای ڕاپەڕین بینیمان شەپۆلێك هاتنی بەرهەمە تەکنیکییەکان بۆ کوردستان بەڕێوەیە بەبێ ئەوەی تێگەیشتن و لۆژیکێك هەبێت بۆ چۆنێتی سوود وەرگرتن لەو تەکنیکانە.
ئێمە ئەوکاتە بەڵگەمان خستە ڕوو، کەچۆن تەلەفزیۆن دەتوانێت ڕۆڵێکی نێگەتیڤ بگێڕێ و دەستپێشخەری بکات لە بەرهەمهێنانی توندڕەوی و ئاسایکردنەوەی زەبروزەنگ و قووڵکردنەوەی ناکۆکییەکانی ناو کۆمەڵگادا. لە ئێستاشدا ئەم ڕووداوە چەندە ڕووداوێکی سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئایینی و ئەخلاقی و ویژدانیە، ئەوەندەش کارەساتە لە جیهانی میدیا و ڕاگەیاندنی کوردیدا. هەروەها پیشاندانی ئەم دیمەنانە ئاشکرای کرد کە هەرچەندە ڕاگەیاندنی ئێمە لەڕووی تەکنیکی و ئامێر و کەلوپەلەوە دەوڵەمەند و هاوچەرخ و مۆدێرنیزەبوو بێت، هێشتا پێویستی بە عەقڵێکی ڕۆشنگەر و وردبین هەیە بۆ بەکارهێنان و کاراکردنی ئەو ئامێرانە و سوود لێوەرگرتنیان بە ئاراستەی پتەوکردنی ژیانی هاوبەشدا. (تەکنیك) بەبێ دەرککردنی ئەو (لۆژیکەی) بەرهەمی هێناوە و بەبێ بوونی لۆژیکێك بۆ دروست بەکارهێنانی، کارەساتی گەورە دروستدەکات. ئەمەش دیاردەی باوی ئەو کۆمەڵگا دواکەوتوانەی وەك کوردستانە کە کەڵەکەبوونی سەرمایە و مەسرەفکردنی بەرهەمە تەکنەلۆژییەکان هاوشان نییە بە دروستبوونی کولتوورێك و تێگەیشتنێکی مۆدێرن لەو بەرهەمانە و کاریگەرییان بۆسەر ژیانی مرۆڤ. بەداخەوە دەڵێی ئەو وتارە لەگەڵ هەموو کەموکوڕییەکانیشیدا، بۆ ئێستا نووسراوە، ئەمەش هیچ مایەی دڵخۆشیی نیە..

# ئایین و بڕوا

## گفتوگۆی: فەیسەڵ محەمەد

{ململانێی نێوان ئاراستەیەکی تایبەتی ئایینی و ڕۆشنبیران، نەك ئایین و ڕۆشنبیران. (ئێمە)ی گەورەی یەزدان و (من)ی بچووکی مرۆڤ. وشە لە ئاییندا. لە توندڕەوی ئایینییەوە بۆ توندوتیژی باوەڕداران. بۆ تێگەیشتن لە ئایین تەنیا بڕواهێنان بەس نییە. دەریچەیەك بۆ ئاشتبوونەوە}

**فەیسەڵ: بەدرێژایی مێژوو ململانێ و کێبڕکێیەکی بەردەوامو ئالۆزیکیانە لەنێوان نوسەرانو ڕووناکبیرانو گروپە ئایدۆلۆژیو ئایینییەکاندا هەبووەو هەیە، لەم وڵاتەداو لەئەنجامی نوسینەوە، تورەبوونو خۆپیشاندانو هوتاف کێشانو نارەزاییو ئیمزاکۆکردنەوەو حەماسەتو هەڵچونێکی زۆری لێدەکەوێتەوە، لەمێژوودا لەم نمونانەمان زۆرە کە لەژێر هەڕەشەو فشاری تێڕوانینەکانی ئەوانیتردا بوون:**

سیوەیلی: پێموایە خاڵێك هەیە لەبیرمان نەچێت، ئەویش لەو مێژووە درێژە دا کە جەنابت لە پێشەکییەکەدا ئاماژەت پێدا هەمیشە ئەو ململانێیە ململانێ نییە لەنێوان ئایین بەشێوەیەکی گشتی و نوسەرو ڕۆشنبیران بە تایبەتی. بەڵکو ململانێیە لەنێوان ئاراستەیەکی تایبەت لە ئایین و ڕۆشنبیراندا، کە شێوە نوسینێکی تایبەتی پێ قبوڵ ناکرێت. زۆرینەی ڕۆشنبیرو ئەو کەسانەی کە ڕووبەڕووی هەڕەشەی ئایین بونەتەوە،

بۆخۆیان لەڕووی بیروباوەڕەوە کەسانی سەر بەئایینن. سپینۆزا نمونەیەکە لەوانە، تەنانەت سوکرات بەدەرنییە لەوەی کە بڕوایەکی تایبەتی هەبوو بەئایین، بەلاّم ئەم ئاراستەیە لە ئایین کە دژی نوسینە و دژی رۆشنبیریشە، ئاراستەیەکە لەئایین کە پێی وایە نوسین‌و رۆشنبیری هێزێکە بەرەو کرانەوە بەرامبەر بەژیان، لەکاتێکدا ئەم ئاراستە ئاینییە خۆی ئاراستەیەکی داخراوە بەرامبەر بەژیان. بۆیە بەلای منەوە، بە درێژایی مێژوو ئەگەر ئایین یا ئاراستەیەك لەئایین دژی رۆشنبیر کەوتبێتەوە، شتێکی سروشتی بووە، دەلالەت لەو دژو ناکۆکییە دەکات کە لە بەینی دوو تێڕوانینی جیاوازدا هەیە، تێڕاونینێکی ئایینی داخراو و یا ئاراستەیەکی ئایینی داخراو و تێڕوانینێکی رۆشنبیرانەی کراوەدا. لەهەموو ئاینەکانیشدا ئەم لقە هەیە، بۆ نمونە لەسەدەکانی ناوەڕاستدا ئەوە کۆی ئایینی مەسیحی نییە کە لەدژی رۆشنبیر و نوسەران دەوەستێتەوە، بەڵکو ئەوە باڵێکی زۆر توندڕەوە کە پێی وایە کتێبە پیرۆزەکانی دین قابیلی تەئویل کردن نین و زمان لەناو ئەو کتێبانەدا زمانێکی یەزدانییە، ئەم زمانە زمانێکی موقەدەسە، هەربۆیەشە کاتێ کەسانێکی جیاواز هاتوون قسە لەسەر تەئویلی جیاواز دەکەن بۆ فەرمانە ئاینییەکان، ئەوان بەوە دیفاع لەخۆیان دەکەن کە لەدژی شەخییەتی کەسەکان بوەستنەوە. لەڕاستیدا، بەتایبەتی لە هزری رۆژئاواییدا زۆربەی هەوڵدانە رۆشنبیرییەکان لەلایەن کەسانێکەوە دراون، کە لەڕووی بیروباوەڕەوە سەر بەئاینێك بوون. یانی ئەو ناسازییەی کە دروست بووە ناسازییەکە پەیوەندی بەوەوە هەیە کە گوتاری رۆشنبیری بۆ ساتێك دەستی هەڵنەگرتووە لەوەی کە جۆرێك لەئاشتبوونەوە لەنێوان رۆشنبیر و ژیاندا، لەنێوان فرەتەفسیری و فرەتەئویلیدا بکات لەگەڵ ژیانی مرۆڤدا، ئەم ئاراستە ئاینیانەش کە هەبوون‌و توندڕەوانە کاریان کردووە بڕوایان بەوە هەبووە کە لەبنەڕەتدا نابێ ئایین تەفسیر بکرێت. من دەمەوێ هەرئەوەندە بڵێم کە ئەوە هەموو ئایین نییە کە نە لەدرێژەی مێژووی خۆیداو نە لەئێستاشدا بەکوردستانی خۆشمانەوە، دژی گوتاری رۆشنبیری بێت. ئێمە تەواو لەناو ئەوانەشدا کە دەروەستن بە بەئایینەوە خەڵکانی رۆشنبیر و خەڵکانی کراوە دەبینینەوە. بەلاّم ئەوە ئاراستەیەکی تایبەتە لە ئایین یان

بەکارهێنانێکی تایبەتی ئایینە لەلایەن کەسانێکی دەستنیشانکراوەوە کە هەموو ئایین دەکەنە دژی رۆشنبیری، ئەگەرنا خۆی گوتاریی رۆشنبیریی مرۆڤایەتی، بەدەرنییە لەو بەخشندەییانەی کە مرۆڤە دینییەکان تیایدا بەشدارییەکی زۆرباشیان تێدا کردووە.

**فەیسەڵ: لێرەوە تێدەگەین کە ئایین خۆی وەکو مەرجەع، وەکو ئایینێکی ئاسمانی ناتەباو ناجۆر نییە لەگەڵ خیتابێکی رۆشنبیریدا ئەوەندەی مەزهەبو ئاینزایەك یان گروپێکی سیاسیو ئایدۆلۆژی دێن ئەم حاڵەتە ئەقۆزنەوە یان رێگا لەکرانەوەو ئازادی دەگرن.**

سیوەیلی: ئایین بۆ خۆی بەرجەستەبوونێکی رۆشنبیرییە کە پاساوەکانی خۆی بۆ گۆرینی جیهان بە ئامازەکردن بۆ دەسەڵاتی ئاسمانی دەهێنێتەوە. لەدەقی ئاینیدا، ویژدانی قسەکەر یان ئێمەی قسەکەر، کە ویژدانێکی یەزدانیانەی هەمووشتزانە (بکل شئ علیم)، من و ئێمەیەکی زۆر فراوانە و خاوەنی تێروانینێکی زۆر گشتییە بۆ کۆی بارودۆخەکانی گەردوون و جیهان. بەڵام وەختێ کەسانێك بەناوی دەقە دینییەکانەوە، بە (من)ە میزاجی و زۆر بەرتەسکەکەی خۆیانەوە رووبەرووی گۆرانە گەورەکانی دنیا دەبنەوە، دەیانەوێ دنیا راپێچ بکەن بۆ ژێر ئەو بیروباوەرەی کە خۆیان هەیانە، ئەوە ئەمانە ئەو (ئێمە) گەورەیە لە گوتاری ئایینی دەستێننەوە و تێگەیشتنی کۆسمۆلۆژیانەی، یان گەردووناسیانەی ئایین بچووکدەکەنەوە لەو تێگەیشتنە تاکەکەسیانەی خۆیاندا کە بەدەر نییە لە کاریگەریی بارودۆخە رۆژانەییەکان و بەرژەوەندیی تایبەت. لەکاتێکدا لە دەقە ئاینییەکاندا هەوڵدانی بەردەوام هەیە بۆ چارەسەرکردنی کێشە گەورەکانی بوونو مرۆڤ و پەیوەندی مرۆڤ بەسروشتو گیاندار و بێگیانەکانەوە، و ئەمەش ئەو پانتاییەیە کە میزاجی شەخسی ئەو کەسانەی (ئێمە)ی گەورەی ناو دەقە ئایینیەکان داگیر دەکەن، نایبینن و کاتێ بەناوی ئایینەوە قسە دەکەن، گوتاریی ئایینی دەبێتە رەنگدانەوەی سایکۆلۆژیای مرۆیی ئەوان، نەك رەنگدانەوەی جیهانبینی بێسنووری یەزدانیانە. ئەمانە بە ویژدانی شەخسیی خۆیان، بەمیزاجی شەخسی خۆیان قسە لەسەر دین دەکەن و دین بەرەو شوێنێکی زۆر

بەرتەسك دەبەن كە لەكۆتايدا بۆ ئەوەی بەرگریی لەم تێگەیشتنانەی خۆی بكات پێویستی بەتوندوتیژیو شەڕانییەت هەیە.

دەمەوێ بەمشێوەیە زیاتر مەبەستەكەمت بۆ ڕوون بكەمەوە: ئەگەر ئایین بەڕووبارێك بشوبهێنین، ئەوە كەسانێك كە بەناوی ئایینەوە قسە دەكەن، جۆگایەكی ئەم ڕووبارە بەپێی میزاجی تایبەتیی خۆیان هەڵدەبەستن و دەیانەوێ هەموو ئایین بەم جۆگایەدا تێپەڕێنن. لەكاتێكدا ئەمەیان تاسەر بۆ سەرناچێت و دەشیانەوێ قەناعەت بە خەڵكیش بكەن كە ئەوەی ئەوان لە ڕووبارە گەورەكە ڕایانبەستووە، ***هەموو ئایینە***. جۆگەلەكە ماوەیەك دەڕوات، بەڵام بە دووركەوتنەوەی لە سەرچاوە ڕەسەنەكەی، تادێت باریكدەبێتەوە و لە كۆتاییدا وشكاوی دایەت و مەحوو دەبێتەوە. كە وشكایی داهات، بكەرانی ئەم كارە، جگەلەوەی تاوانێكیان كردووە بەوەی كە لقێكیان لەم ڕووبارە لەسەرچاوەی خۆی لاداوە، ئاواش ئەوانە هیچ بوارێكیان لەبەردەمدا نامێنێت جگە لەوەی بەتوندڕەوی بیانەوێ لەو عەردە ڕەقە ئاو دەربهێنن! ئێمە ئێستا لەبەردەم ئەم مەترسییەداین: ئەو حیزبە سیاسیانەی بەشێوەیەكی گشتی دەیانەوێ ئایین مەرجەعی یەكەمیان بێت، ئەوە لای منەوە كەسانێكن كە پاچو بێڵێكی میزاجی شەخسی خۆیان بەدەستەوەیە و ئایین لەڕەوتە سروشتییەكەی خۆی لادەدەن، جۆگاكانی خۆیان هەڵدەبەستن و هەریەكە لەناو خۆیاندا جگە لەوەی بەیەكەوە ململانێیان هەیە، ئاواش كە بەوشكاو دەگەن، ئیتر دەیانەوێ سنورێك هەم بۆ ئایینو هەم بۆ پەیوەندیی ئایین بە مرۆڤ و كۆمەڵگاوە دابنێن و خۆشیان ئەڵتەرناتیڤێكیان پێنییە. بۆیە لەئەنجامدا توندڕەوی و میزاجی شەخسی یەكتر تەواو دەكەن و لەپڕ دەبینین بە ناوی ئایینەوە هەموو ئەو شتانە دەكرێن كە ڕۆژگارێ ئایین لێی قەدەخە كردبووین! . ئێمە لەبەردەم مەترسییەكی واداین، لەبەردەم مەترسی ئەوەدا نین كە ئایین وەكخۆی، ڕۆڵێكی خراپی لە كۆمەڵگای ئێمەدا هەیە، بەڵكو ئەوە ئاینیستەكان و ئەوانەن كە ئایین بەكاردەهێنن بەو ئاراستەیەی خۆیان دەیانەوێ تەفسیری دنیای پێبكەن، مەترسییان دروستكردووە.

فەیسەڵ: ئەگەر ئێمە ئایینی ئیسلام وەکو نمونە وەربگرین کە مەرجەعەکەی قورئانە، دەبینین لەقورئاندا (قەصاص) هەیە لەوێدا داوا لەموسڵمانان دەکات کە هەرشتێکیان بەرامبەر کرا ئەوانیش بەهەمانشێوە وەکوخۆی وەڵامی بدەنەوە کە دەڵێت: (السن بالسنو العینو بالعین) بەڵام ئەوانەی کە پراکتیزەی ئاینیان کردووە یاخود ئەوەی کە خۆت ئاماژەت پێکردن کە جۆگەیەکیان لەو ڕووبارە جیاکردۆتەوەو پێیانوایە ئەوە دواگوتارە کە ئەمە دواتێگەیشتنی ئاینییە، هەرگیز وایان نەکردووە کە نوسین بەنوسین وەڵام بدەنەوە؟!

سیوەیلی: من بۆخۆم نازانم، یان بەشێکی کەم دەزانم سەبارەت بەوەی کەبۆچی ئاراستەگەلێك بەناوی ئایینی ئیسلامەوە لە کوردستانی خۆماندا دژی نوسین ڕەفتار دەکەن، یاخود پەرچەکرداری زۆر توندڕەوانە لە دژی نوسین پیشان دەدەن و فەتوای کوشتنو خۆپیشاندان لەدژی نوسەر و هەڕەشەلێکردنو دروستکردنی دوژمنێکی هاوبەش لە رۆشنبیر دەکەنە پیشەی خۆیان؟ چونکە لە کولتووری ئیسلامی و لە ئایینی ئیسلامدا بەشێوەیەکی گشتی، وشە (کەلیمە) سەنتەریزمێکی رۆشنی هەیە. ئەم ئایینە جگەلەوەی وەکو سرووش (وەحی) و لە چوارچێوەی وشەدا بۆ مرۆڤ هاتۆتە خوارەوە، ئاواش رۆژگارێك کە دەماودەم برەوی سەندووەو مەترسیی هەبووە کە لەناو بچێت، یان بشێوێنرێ، ئەوە فەرمان دەرکراوە کە کۆبکرێتەوە و لە دەنگەوە بکرێتە وشە و لە وشەدا بەرجەستە بکرێت. وشە و زمان بە شێوەیەکی گشتی لێرەوە دەبێتە پارێزەری گوتاری یەزدانی. بەواتا ئەم ئایینە بۆخۆی لەدژی نوسین نییە و بگرە نووسین پارێزەری هەقیقەتی یەزدانیە بۆ مرۆڤ. بۆیە ئەم ئایینە لەخۆیدا بەڵگەیەکی بەدەستەوە نەداوە کە ئەگەر لەسەری نوسرا، بەغەیرە نووسین وەڵامبداتەوە، یان وەڵامی بۆ بدرێتەوە و بەرگریی لێبکرێت. وەختێك ئێمە لەکوردستان و لەهەندێ شوێنی جیهانی ئەمڕۆدا ڕووبەڕووی دیاردەیەکی وا دەبینەوە کە نوسین بەتفەنگ یان بەفیشەك و هەڕەشە و فەتوا، وەڵام دەدرێتەوە، ئەمە بەڵگەیەکە بۆئەوەی ئاشکرای بکات، کەسانێك لەوڵاتی ئێمەدا بەناوی دینەوە هەڕەشە و گورەشە لە ڕۆشنبیران و نووسەران دەکەن، کەسانێکن ئاگایان لەو

ستایشکردنە نییە کە لەخودی ئایینەکەدا هەیە سەبارەت بە ڕۆڵی وشـە و ڕۆڵـی زمـان لە کۆمەڵگادا. پاشان لەوە تێدەگەین کە ئەم کەسـانە نـاتوانن بەرهەمهێنـەری دەقێـك بن لەبەرامبەر ئەو دەقانەدا کە وەك ڕەخنە دەردەکەون. من تەمەننا دەکەم ئەوانـەی بە هەڕەشە و فەتوا دەرکردن بـەرگریی لـە ئـایینی ئیسلام دەکـەن، لەبەرامبـەر هـەر هەڵە و زیادەڕەوییەکدا کـە مـن و کەسـانیتر دەیکـەین، بهاتبانـا و هـەموو هەڵـچوونە سـایکۆلۆژیو ئایدۆلۆژییـەکانی خۆیـان لـە بەرهـەمهێنانی دەقێکـی جوانـدا تـەوزیف بکردایە، بۆ ئـەوەی ئەگـەر لەگەڵیـشتاندا هاوبۆچـوون نـەبووین، بمانگوتبـا: دەقێکـی جوان بەرهەمهاتووە. تۆ پێم بڵێ کێن ئەوانـەی لەزەمینـەی زمـانی کوردیـدا بـەرگریی لەئاینو ڕەخنە دژی ئەو ڕۆشنبیر و کەسایەتیانە دەنوسن کە ڕەخنەیان هەیە لەسـەر ئـاین؟! یـەکێك لەوانـەم پێبڵـێ کـە دەقێکـی جـوانی بـەم زمانـەی ئێمـە بەرهـەم هێنابێت؟. کەچی لەدەرەوەی حیزبـی ئـایینی ئێمـە خـاوەنی نـەریتێکین کـە زۆربـەی دەقە ڕەخنەییە جوانەکانی بەرهەمهێناوە و لەناو ئایینی ئیسلامیشدا کـاری کـردووە، لێکدانـــەوەی شـــاکارەکانی ئـــەدەبی کـــوردی بەقەڵـــەمی خوالێخۆشـــبوو (مەلاعەبدولکـەریمی مـودەریس)، کـە بۆخـۆی جگەلـەوەی سەرچـاوەیەکی ئـایینی بڕواپێکـراوی ناوچـەکەیە بۆیـەك سـات ئامـادە نـەبووە یـەك دانـە بەڵگەنامـەی توندڕەوانەمان بەناوی ئیسلامەوە بۆ بەجێبهێڵێت.. ئەمـە یـەك، دووەم ڕەنگدانـەوەی ئـەم گوتـارە مرۆییـە ئیـسلامییە، لەقەڵـەمی ئـەودا لەتەفـسیرکردنیدا بـۆ دیوانـە شـیعرییەکان ڕەنگیداوەتـەوە کـە ژیاندۆسـتی و مرۆڤدۆسـتی لێدەچـۆڕێ.. کـێ لـە ئەوانـەی بـەناوی ئیـسلامەوە ئـیش ئەکـەن، بەتایبـەتی لەحیزبـە تونـدڕەوە ئیـسلامییەکاندا، توانیویـەتی یـەك دەقـی جوانمـان لەسـەر هـەر بابـەتێك بـۆ بەرهـەم بهێنێت بەبێ ئەوەی گریوگۆڵی دەروونیـی تیابێـت، بـەبێ ئـەوەی ئـەحکامی ڕەهـای تیابێـت، بـەبێ ئـەوەی هانـدەری توندڕەوی نـەبووبێت.. یـەك دەقـم بـۆ بهێنـەرەوە، تابڵێم: لەبەرخاتری هیچ نا لەبەرخاتری ئەوەی ئەم نوسەرە سەر بەفلان حیزبە، ڕێزی لێدەگرم لەبەرئەوەی زمانەکەمی جوان بەکارهێناوە بۆ خستنەڕووی بەڵگەکانی خۆی، یەك دانەیانم بۆ بهێنەرەوە، ئەڵێم ئەوان پێویستە هیچیان نـەکردبێت بـەڵام تـۆ یـەك

دەقم پێ پیشان بدە کە ئەم ئیسلامیستانە نوسیبێتیان و شایانی بەراوردکردن بێت بە تەفسیری (نامی)، شیاوی بەراورد کردن بێت بە (یادی مەردان)، شایانی بەراورد کردن بێت بەو ئاراستە ڕەخنەییە رۆشنبیرییەی کە سەرچاوە ڕەخنەییەکەی بەلاغەی عەرەبییە و سەرچاوە ئایدۆلۆژییەکەی ئایینی ئیسلامە و هەر ئەم سەرچاوەیەشە تەفسیری شیعرەکانی نالی، مەولەوی‌و مەحوی پێکراوە.. یەك دەقم لەو دەقە نوێیانەی کە لە خەیاڵی نوسەرە حیزبیە ئیسلامییەکاندا بەرهەمهاتبێ و لەڕووی جوانکارییەوە و تەنیا لەئاستی زمانی کوردیدا شایانی بەراوورد کردن بێت بەو دەقانەی کە پێشتر لەچوارچێوەی ئایینی ئیسلامدا بە زمانی ئێمە نووسراون؟ ئێمە ئێستا ئەو پرسیارە دەکەین و دەڵێین: کە تۆ ناتوانی درێژکراوەی ئەو نەریتە بیت لەنوسیندا بەزمانی کوردی، کە هەر لەئایینی ئیسلامەوە سەرچاوەی گرتووە، بۆچی کۆمەڵە نوسینێك دەخەینە ئاراوە کە پڕە لەفەتواو توندوتیژی؟. تۆ کە ناتوانی درێژکراوەی نەریتی ئایینی خۆت بیت، کە بۆت گرنگ نییە بگەڕێیتەوە بۆ مەرجەعییەتی خۆت، دەبێ بۆمان بسەلمێنیت کە ئەو مەرجەعانە درۆ دەکەن، دەبێ تۆ بەڕەسمی پێمان بڵێی ئایا تۆ ئێستا مەلاعەبدولکەریمی مودەریس وەك موسڵمانێك‌و وەك فتوادەرێك‌و وەك بنوسێك ڕەتدەکەیتەوە و بەلاتەوە مسوڵمانێکی تەواو نەبووە، یان تۆ بە چ پێوەر و بەڵگەیەك ئاراستە ئایینیانەی خۆت بۆ من ڕووندەکەیتەوە کە پێش هەر شتێ ئایین بێت، ئەمجا تێگەیشتنی سنووردارانەی خۆت بۆ ئایین؟ ئەمە بۆ من زۆر گرنگە.

**فەیسەڵ: کەواتە دەتوانین بڵێین ئەو دیدە مەزهەبییە ئەو تێڕوانینە سیاسییەی کە لەناو ئاییندا بەم ئاراستەیە ئیش دەکات نەیتوانیوە خیتابێکی دانپێدانراو بەرهەم بهێنێت، باشە لەم حاڵەتەدا تۆ پێتوانییە ئەم خۆپیشاندان‌و ئیمزاکۆکردنەوەیە جۆرێکیتری تیرۆر بێت؟**

سیوەیلی: نەخێر، چونکە ئێمە تیرۆر بەکردەوەیەکی بەرنامەبۆدارێژراو پێناسە دەکەین، کە هیچ پاساوێکی عەقڵانی نیە. لەواقیعدا من کابرایەکم بڕوام بەئازادی

ڕادەربڕین هەیە، پێموایە زۆر ئاساییە بۆ کەسانێك کە هەست بکەن مافیان پێشێلکراوە یان بریندار کراون، گوێیان لێناگیرێ و خۆشیان ناتوانن لەو چرکەیەدا لەو ئانوساتەدا بەهەمان شێواز وەڵام بدەنەوە و بەڵگەکانیان بخەنەڕوو، (کە ئەمەیان ناقڵانەترە)، مافی ئەوەی هەیە بچێتە سەر جادە و خۆی دەربڕێ. بەتایبەت لەکاتێکدا کە تۆ لەم وڵاتەدا گوتوتە: مافی ئازادیی ڕادەربڕین هەیە. بۆیە من لەمڕووەوە سەرنجێکم نییە و پێموانییە کاتێ مسوڵمان بۆ تەعبیرکردن لەخۆی دەچێتە سەر شەقام، تاوانێکی کردبێ زیاتر لەوەی خوێندکاران و ژنان و چین و توێژەکانی دیکە دەیکەن. بەڵام کە تۆ دێیت ڕا دەردەبڕیت ئایا ڕا- کەی تۆ شیاوی گوێ لێگرتنە یان نا؟ ئایا من لەدوای ئەوەی ئەم شەقامانەی شاری سلێمانیو هەولێرو شارەکانیتر کە هێشتا زرنگانەوەی دەنگی مرۆڤی ئازادیخوازی تیادا ماوە، زرنگانەوەی دایکانی شەهیدو ئەنفالکراو بەکۆڵانەکانی هەر شارێك لەکوردستاندا ماوە، ئەگەر مرۆڤێ گوێی هەبێتو گوێبگرێت ڕەوایە تۆ بێی لەم کاتەدا خۆپیشاندان بکەیت لە دژی نوسەرێك و بڵێی: دەبێ بکوژرێ وە ئاڵای وڵاتێك کە تۆ پەیوەندییەکی مێژوویت لەگەڵیدا هەیە و بەلایەنی کەمەوە (٤٠-٥٠) هەزار موسڵمانی جێگا کردۆتەوە، مزگەوتو بنکەی ڕۆشنبیری بۆ داناون کە دانیمارکە، تۆ بێی ئاڵاکەی بسوتێنی، بێحورمەتی بکەی بەو پەیوەندییە کە دروست بووە؟ ئایا ئەم شەقامانە شایانی ئەوەن کە بێ حورمەتیان تیادا بکەین بەناوی ئەوەی کە ئێمە ڕا دەردەبڕین؟ ئەو ڕایانە نابێت شایەنی ئەوە بێت کە گوێی لێبگرین، نابێ گوێگر بۆخۆی پەیدا بکات. کێشەکە ئا لێرەدایە. ئەمە تیرۆر نییە، بەڵام لەگەڵ بیروڕا دەربڕیندا یەك ناگرێتەوە چونکە بیروڕای تیا نییە، چونکە پڕە لەهەڵچوون، بەهەمانشێوە کە تۆ ناتوانی بە وشە وەڵامی نوسەر بدەیتەوە، کە ئەمە ئەو نەرێتەیە کە لەئایینی ئیسلامدا پەیڕەو کراوە، بۆ نمونە تۆ سەیری بزاڤی فکریی- فەلسەفی بکە لەئایینی ئیسلامدا، فیکری فەلسەفەی ئیسلامی ئەو هەموو شاکارەی بەرهەمهاتوون لە دەرەنجامی گفتوگۆی بیریارانو کەلامییەکان و فەیلەسووفە جیاوازەکانە لەگەڵ یەکتردا، هەم لەگەڵ خۆرئاوادا. هەم لەناو خۆیاندا بەپێی تەفسیری جیاواز... هەر

خۆی بوونی چوار مەزهەبی جیاواز، چوار مەرجەع لەناو فیقهی سوننی ئیسلامدا، چوار مەرجەعی یاسایی بۆ ڕێکخستنی ژیانی کۆمەڵایەتی ( شافعی، حەنەفی، مالکی، ئەحمەدی) بۆخۆی دەریناخات کە یەك دانە تەفسیر لەئیسلامدا بۆ هیچ شتێك نییە و تەفسیری جیاواز هەیە؟ سێ سەدساڵ ئایینی ئیسلام لە ئیسپانیا چی کردووە؟ بێگومان شارستانییەتو گفتوگۆو پێکەوەژیانو مۆزیکی بەرز و بیناکاریی جوانی بەرهەمهێناوە، کە هەمووی ڕەنگدانەوەی ژیانێکی تەباو ئاسایشنو ئێستاش ئەو سەنتەرە لەئایینی ئیسلامدا هەیەو شوێنی ئاوڕلێدانەوەیەی فەیلەسوفو بیریارەکانە. کەواتە کێشەکە لەوەدایە ئێمە لەبەردەم ئاییندا نین وەك مەترسییەك، ئێمە لەبەردەم کەسانێکداین کە ئاین بەئارەزووی خۆیان تەفسیر دەکەن، وە ئەم کەسانە یەکەم شت کە تەلاقیان داوە ژیانی هاوبەشی کۆمەڵگاکەی خۆیانە، کە من وەکو چۆن قبوڵی ناکەم هیچ هێزێکی سیاسی بەهۆی ئەمریکا یا هەر دەسەلاتێکیترەوە دەستدرێژی بکاتە سەر مرۆڤی ئایینپەروەر لەم وڵاتەدا، جا لەهەڵەبجە بێت یان لەهەولێر یا لەهەر شوێنێکیتر، بەهەمانشێوەش لەئیسلامیستەکانی قبوڵ ناکەم دەستدرێژی بکەنە سەر ژیانی هاوبەشی ئەم کۆمەڵگایە بەهەر ناوێکەوە بێت، ئەوە قسەی منە.

**فەیسەڵ: لێرەوە تێدەگەین ئەم توندڕەوییو حەماسیبوونو خاڵیبوونەوەیە لەفیکر، وایکردووە ئەوان نەتوانن خیتابێکی باش بەرهەمبهێنن سەبارەت بەو نوسینو ڕەخنانەی لەمێژووی ئاین یاخود دەقە ئاینییەکانیتر دەگیردرێت. ئایا ئەمە بەڵگەیەك نییە لەسەر ئەوەی کە موسڵمانان نەیانتوانیوە ئەو نوسینو ڕەخنانە بخوێننەوە کە لەسەریان نوسراوە کە من بۆخۆم گومانم لەوە نییە زۆربەی موسڵمانانی دنیا ناوی ئەو کتێبە یاخود ئەو ڕۆمانەی (سەلمان روشدی) نوسیویەتی چییە؟، نەك نەیانخوێندۆتەوە بەڵکو تەنانەت ناوەکەشی نازانن!. تۆ پێتوانییە ئەوان کوێرانەو لەدوورەوە بڕیارو فتوای سۆزداریانە دەدەن دوور لەتێڕامانو وردبوونەوەو تێگەیشتن؟**

سیوەیلی: دیسانەوە با گشتگیریو گشتاندن نەکەین. لەناو حیزب و باڵە سیاسییەکاندا، خەڵکانێکی خوێندەوار هەیە و من لەبەرخاتری خوێندەوارییەکەیان

هەمیشە ڕێزی تایبەتیم هەیە بۆیان چونکە هەمیشە ئەو کەسەی لە پڕپیەوە بەرگری لەبۆچوونەکانی خۆی دەکات شایانی ڕێزە. بەڵام بەگوتەی تۆ کاتێك کەسێ بێئاگا بێت لەوەی کە چۆن قسە لەسەر ئایین کراوە و بۆ ئەمە خۆی تەییار بکات کە لە بری بەرگریی، یەکسەر بێت توندڕەوی یا هەڵچوون‌و ئینفیعال بکات. بەبڕوای من ئەمە کێشە دروستکەرە، ئێمە کێشەمان لەگەڵ ئەو کەسانە نییە کە بە بەڵگەوە ڕەخنە لەو بۆچوونە دەگرن سەبارەت بەو شتەی کە ئەمان بەهی خۆیانی دەزانن، ناڕاستە و دیارە لەوەشدا دەبێ بەهەڵەدا نەچین. کەس خاوەنی ئایین نییە بەتایبەتی لەوڵاتی ئێمەدا کە وڵاتێکی موسڵمانە هەموو ئیدیعاکردنێك بۆ ئەوەی ئێمە خاوەنی ئایینین و دەتوانین تەفسیری ڕاستەقینەی مەسەلە ئاینییەکان بکەین، خۆی وەستانەوەیە لەدژی ئایین وەك کولتوورێك لەوڵاتی ئێمەدا. لێرەوە تەمەننا دەکەم نمونەی ئەو کەسانەی کە لەدڵسۆزیانەوە کار بۆ ئایین دەکەن، لەو بوارەدا زۆربن. وە ئەو کەسانەی کە لاسایکەرەوەی ئاراستەیەکی بەئایدۆلۆژیکردنی ئایینن کە مەرجەعەکانیان پایتەختی وڵاتە عەرەبییەکان‌و وڵاتیترن و لەپشت ئەو بەرگریکردنەشیانەوە لە ئایین، جۆرێ لە شۆڤێنیزم، جۆرێك ڕق بوونەوە لەئەویتریش، جۆرێ بەبێبەهاکردنی بەهای مرۆڤیش دەبینرێ، نمونەیان کەم بێتەوە و بەخۆشیاندا بچنەوە. ئێمە هەموومان دەبێ بەخۆماندا بچینەوە، چونکە وڵاتی ئێمە تەحەمولی ئەو جۆرە بیروڕایانە ناکات کە ئایین بەئارەزووی خۆیان تەفسیر بکەن و خۆیان بکەن بەخاوەنی ئایین.. جوانترین ڕێزگرتن لەئایین ئەوەیە کە کەس خاوەنی نەبێت و سەرەتای بێحورمەتیکردتنیش بەئایین هەر لەوێوە دەست پێدەکات کە تۆ بۆ بەرگریکردن لەئایین پەنا بۆ توندڕەوی ببەیت. ئەمەش بەومانایە نییە کە لە ئایینەکاندا توندڕەوی بەشێوەیەکی ڕەها نییە، بەڵکو دەتوانم بڵێم لەئایینە تاك خودایەکاندا توندڕەوی بەشێکە لە پێکهاتەی ئەو ئایینە خۆی. قسەکردن لەسەر ئەمەش زۆری دەوێ. یەکەم چیرۆکی ئایین بەپێی ڕیوایەتی ئایینی ئیسلامیش، بەپێی تەوراتیش یەکەم چیرۆك بە (کوشتنی برایەك لەلایەن براکەیەوە) دەست پێدەکات، ئەمە بەسە بۆ ئەوەی نەڵێین: ئایین هیچ توندڕەوی تیادا نییە. ئایین

فرێدانەخوارەوەی یەکەم دوو بونەوەرە لەفەزای بەهەشتەوە بۆ سەر زەوی، جۆرێك لەتوندڕەوی یەزدانیانە لە ئاییندا هەیە. وەلێ توندڕەوی یەزدانیانە جیاوازە لە توندڕەوی مرۆییانە..، ئەمەش مانای ئەوە نییە کە ئێمە کوێ ئەم ئایینە لەو بۆتەیەدا بخوێنینەوە و ئایین هەڵواسین بە توندڕەوییەکەیدا و ڕەهەندەکانی دیکەی نەبینین. کێشەی کەسانێك لە وڵاتی ئێمەدا کە لەدەرەوەی ئایینن، ئەوەیە کە ئایینیان کردووە بە هەرشتێکیتر کە دەکرێ خاوەنی بین. ئایین شت نییە وە ئەمە خاڵێکە کە دەبێ ئێمە لەشەری بوەستین، هەرگیز ئیدیعای ئەوە ناکەین کە ئێمە بەقەدەر ئیسلامیستەکان ئایەتو حەدیسمان لەبەربێت، چونکە پێمانوانییە ئایین تەنها بەهۆی ئایینەوە تێدەگەین. بەڵکو بۆ تێگەیشتن لە ئایین پێویستیمان بە زانست و فەلسەفە و هونەر و ئەفسانەکانیش هەیە. ئایین بەشێکی شیعرییەتە و ڕەگێکی ئەفسانەییشی هەیە، بۆیە پێویستمان بەزانستەکانی وەك مێژوو، کۆمەڵناسیو دەرونزانی کۆمەڵایەتی و مرۆڤناسی و لاهووتیش هەیە بۆ تێگەیشتن لەئایین.. چونکە ئایین هەرخۆی وەك ئەوەی کە من بڕوام پێهێناوە، بەس نییە بۆ تێگەیشتن لەئایین خۆی، بڕواهێنان ڕێگە لە تێگەیشتنێکی بێلایەنانە دەگرێ. بۆیە ئەگەر بمانەوێ ئایین بەزیندوویی وەك کولتووری سەردەم بپارێزین، پێویستە بەجۆرێکی دیکە بکەوینە گفتوگۆکردن. پێویستیمان بە فرەیی لە بۆچووندا هەیە سەبارەت بە ئایین. ئەمەش ئەو ڕەهەندەیە کە لە هزری ئایینپەیرەوەکاندا ونە و دیار نییە و شارەزای نین، هەروەکو چۆن کەسانی دەرەوەی ئایینیش هێندەی ئەوان شارەزای ئایین نین و ئەمەش بە بڕوای من سەرچاوەی سەرەکیی لێکحاڵیی نەبوون و بەدحاڵیبوونە لە نێوانی ئەو دوو بۆچوونەدا لەسەر ئایین..

*سوپاس بۆ ئەم دەرفەتە.

# Man as Generous

Rebwar Siwayli

ئێمە هەمووومان پێشتر لە ئەفسانە و ئایین و حەکایەتەکاندا بەسەرهاتی خولوەند و قارەمان و پادشا و یەزدانی بەخشندەمان بیستووە. پادشا و میر و وەزیرەکانی دنیای کۆن ڕۆژانی وەك لەدایکبوونی منداڵەکانیان و چاکبوونەوەی شازن لە نەخۆشیی سوورەنەك، کە لەئەنجامی زۆرجووتبوونیان دەگەڵ خزمەتکار و دەستوپێوەندانەوە تووشی دەبوون، بە ڕۆژی بەخشندەیی ناوزەد دەکرد! لە زۆرینەی کۆمەڵگاکاندا کەسانێکی خاوەن سەرمایە، لەبواری دروستکردنی مزگەوت و تەعزیەخانە، هەتیوخانە و ڕێکخراوی خێرگوزاردا سەرمایەگوزاریانکردووە و ویستویانە ئەوەیان بە بەخشندەیی بۆ لەقەڵەم بدرێ و خۆیان لە باجی حکومەت بدزنەوە. هەرزەکارانی ئەمڕۆ تەنیا چەند ڕۆژێ بەر لە جەژنی لەدایکبوونیان گەمەی سۆزداری لەگەڵ دایکوباوك و باوانیاندا دەستپێدەکەنەوە و پشی پشییان بۆ دەکەن تاکو لەو ڕۆژەدا بەخشندەیی ئەوان بەلای خۆیاندا ڕابکێشن.. دەرۆزەکەران بۆ ئەوەی شەرمەزارمان بکەن و پێمان بسەلمێنن کە ئێمە بەڕاستی بەخشندەین، لە شوێنی جۆڵدا داوای پارەمان لێناکەن!

بەخشین و بەخشیش لە هەموو شوێنێکدا خۆیان بۆ لەبۆسە ناوین و بەخشندەیی و بەخشیش هیچ پەیوەندییان بە ڕەفتار و ئەخلاق و جیهانبینی مرۆڤەوە نەماوە، ئەمڕۆ بەخشین بەپلەی یەکەم پەیوەستە بە بەخشینی مادیی و پارەوە. ئەوەی پارەمان پێدەبەخشێ و لە نەسریەی فەرمانگە و کۆمپانیا و دیولخانانەی خۆی بێبەشمان ناکات، مرۆڤێکی پەسەندە..

بەڵام ئایا مرۆڤ دەتوانێ قارەمان و پادشا و وەزیر و دەسەڵاتدار و خاوەن کۆمپانیا و پرۆژە نەبێ و بەخشندەش بێت؟ ئایا ئێمە دەتوانین وەك مرۆڤ، وەك خودی سەربەخۆ، بێ ناونیشانی پۆست و ئیمتیازاتی دەسەڵات و خاوەن پلەوپایە و پێگەی جۆربەجۆر، بەخشندە بین؟ ئایا بەخشندەییەك هەیە مادیانە نەبێت و کامەیە ئەو بوارەی دەتوانین تیایدا بەخشندەبین وەك ئەوەی کە بەخشندەیی بەشێك بێت لە ئەخلاقی مرۆڤانەی ئێمە؟



مۆنتێف و بەرگ: سەیوان سەعیدیان

RANJ رەنج